ن/ یوسف الحاج احمد



# ئاشكرا بوونی چەند موعجیزەیەكی زانستی

## لەنێو قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ



و/ بەختیار عبدالرحمن شێروانی

پ/ زیوەر ئەنوەر



ابو علي الكردي

منتدى اقرأ الُثقافي

دووەم چاپ

هەولێر ٢٠١٠









# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ئاشکرابوونی چەند موعجیزەیەکی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)
بابەت : زانستی
نوسینی : یوسف الحاج ئەحمەد
وەرگێرانی: و: بەختیار عەبدولرەحمان شێروانی
پێداچونەوە: زیوەر انوەر
کۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا
چاپی : دووەم ٢٠١٠
شوێنی بڵاوکردنەوە: (کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی) هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢١٤٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
هەولێر - کوردستان - عێراق
(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣٩٤ / ☎- ٠٦٦ ٢٢ ٢٣٨٦٨)

# ئاشكرابوونی چەند موعجیزەیەكی
## قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری ئازیز( ﷺ )


ن: یوسف الحاج ئەحمەد

و: بەختیار عەبدولرەحمان شێروانی

پێداچوونەوە: زیوەر ئەنوەر



دووەم چاپ

هەولێر

١٤٣١ - ٢٠١٠

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشـــەکی

ستایش بۆ خودای بـەرزو بـالاّ، سـوپاس‌و ستایـشی دەکـەین‌و داوای یارمـەتیی‌و لێخۆشـبوونی لێدەکەین، خۆمان بەخودای گەورە دەپارێزین لە خراپەکانی دەروونمان و کاروکردەوەکانمان،هەر کەسـێك خودا ڕێنموونی بکات بەهیچ جۆرێك گومرا نابێ‌و هەر کەسێکیش خودا گومرای بکات، بەهیچ جۆرێك ڕێنموونی نابێ، شاهێدی دەدەم کە جگە لە(الله) هیچ پەرستراوێکی دیکەی بەهەق نییـەو تـەنیاو بـێ هاوتایە، شاهێدی دەدەم کە (محمد) بەندەونێردراوی خودایە، بە ڕێنمونیو ئایینی هەق ناردوویەتی، بۆ ئەوەی بەسەر تەواوی ئایینەکانی دیکە زاڵ بێت باکافرانیش پێیان ناخۆش بێ...

کوڕی شیرینم وا من گرنگترین ئەو بابەتانەم بۆت هەڵبژاردووە باس لەدۆزینـەوە سەرسـوڕهێنەرو کاریگەرەکان دەکات،، ئەوانەی دەبنەمایەی زێدە بوونی باوەڕت، فراوانبوونی هزرت‌و ڕووناك بوونەوەی ڕێگات.

بەشیوازێکی کورت‌و پوخت‌و گەلێك ئاسان بۆم داڕشتووی تاکو لەیادەوەریتـدا بمێنێتـەوەدو هـەر چەندی گەورە بوویت، ئەو هزرانەت لەگەڵدا گەورەبن، مەشخەڵەکانیت بۆ ڕوون‌و ئاشکرا بن..

کوڕە شیرینەکەم بزانە، ئەم زانسته کۆتایی خولگەکە یاخود دۆزینەوەکە نییە..بەڵکو دۆزینـەوەو دۆزینەوە گەلێکی دیکەی بەدوا دادێت کەچەسپاون، هەروەها بۆ تەواوی خـەڵکانیش نیـسپات دەبـێ کەوا گوتەی خودای بـالاّ: ﴿لَا يَأْتِيـهِ الْبَاطِـلُ مِـن بَـيْنِ يَدَيْـهِ وَلَـا مِـنْ خَلْفِـهِ تَنزِيـلٌ مِّنْ حَكِـيمٍ حَمِيدٍ﴾(فصلت:٤٢).

**واتە: (هیچ ناهەقی‌و نادروسـتی‌و ناتەواویـەك ڕووی تـێ ناکـات لـەهیچ کاتێکـداو لـەهیچ لایەکەوەو ڕەوانەکراوو نێردراوی زاتێکە خاوەنی حیکمەت‌و داناییەو شایانی سوپاسـی‌و ستایـشە).**

هەروەها ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى{٣} إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى{٤}﴾ (النجم:٣-٤).

**واتە(قسەو گوفتاریشی لەئارەزوو بازی‌و هەواو هەوەسەوە نییە، ئەمەی کـە ڕای دەگەیـەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە).**

* ئەو ئەنسکلۆپیدیایەی کە لەبەر دەستتدایە چەند بابەتێکی جوان‌و کاریگەری لەخۆگرتووە، هەر

بابەتێكم لەوانە لەبەشێكی تایبەت بەخۆیم داناوە، ئەو بەشانەش لەمانە دەدوێت:

١- بەشی یەكەم (موعجیزەی پەنهایی).

٢- بەشی دووەم (موعجیزە لە مرۆڤدا).

٣- بەشی سێیەم (موعجیزە لەزەویدا).

٤- بەشی چوارەم (موعجیزە لەدەریاكاندا).

٥- بەشی پێنجەم (موعجیزە لەگەردووندا).

٦-). بەشی شەشەم (موعجیزە لەرووكدا).

٧- بەشی حەوتەم (موعجیزە لەگیانلەبەردا

٨- بەشی هەشتەم (موعجیزە لەپزیشكیدا).

ئەو هەشت بەشانە بە وێنە دەوڵەمەندم كردوون كەلەبابەتەكەی خۆی جودا نابێتەوەو بەشێكە لەو.. داواكارم لەخودای باڵا دەست، ئەوەی كۆم كردۆتەوەو نووسیومە، بكاتە یادخستنەوەیەكی چاك بۆ تۆو براكانت..بیكاتە سەرەتایەكی پاكوو دروستو سەركەوتوو بۆ ژیانت .. ببێتە بەرووبوومێكی پێگەیشتوو بۆ باوەڕونیمانەكەت..

هەروەها ئەو كارەم والێبكات تەنیا بۆ ئەوبێت، بیكاتە مایەی سوودمەندی بۆ تۆو تەواوی منداڵانی موسڵمانانی عەرەبو عەجەم، ئەو خۆی توانا دارە بەسەر ئەوەی ئارەزووی لێیەتیو هەر ئەویش شیاوی وەڵامدانەوەی دوعاو نزاكانە.. كۆتا دوعامان سوپاسو ستایشە بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان.. سەڵاتو سەلامی خوداش لەسەر پێغەمبەری گەورەمانو خانەوادەو هاوەڵانی بێ.

**ڕۆژی چوارشەممە**

**٣٠/ موحەڕەمی/ ١٤٢٤كۆچی**

**٢/ نیسانی / ٢٠٠٣زایینی**

**نووسینی**

**خزمەتكاری سوننەت**

**یوسف الحاج احمد**

بسم الله الرحمن الرحیم

# پێشەکییەك لە گرنگی زانست لەژیانی موسڵماندا

کوڕی شیرینم بزانە زانست لەئیسلامدا خواپەرستییە...خوا پەرستی (**العبادة**) لەرووی زمانەوانیەوە واتە: ملکەچ بوون، ماناو مەبەستیش لەمە ملکەچ بوونە بۆخودای باڵا دەست لەوەی فەرمانی پێدەکاتو لەوەشی کە قەدەغەی لێدەکات.

زانستیش واتە: دۆزینەوەو پەردە لادان لەسەر شتێك بۆ زانینی راستیەکەی. ملکەچ بوون بۆ خودای گەورەو عیبادەتکردنی، پێویستی بەناسینی هەیە، ناسینیشی لەرێگەی دیتنیەوە کارێکی ئەستەمە، چونکە خودا بەدیهێنراوەکانی دەبینێ بەڵام ئەو نابینرێ: ﴿**لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ**﴾(الانعام: ١٠٣) واتە: (**ئەو نایەتە بەرچاوانو هەموو بینەرێك دەبینێو کارناسكو ئاگادارە**). هەروەها ئەستەمە کە هاو وێنەی ئەو هەبێ، خودا دەفەرمووێ: ﴿**لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ**﴾ (الشورى: ١١)

واتە:(.. **هیچ شتێك لەوێنەی ئەو زاتە نییە، هیچ شتێك لەو ناچێت، هەر ئەویش بیسەرو بینایە**) وەئەستەمیشە هاوبەشێکی هەبێ: ﴿**لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ**﴾ (الانعام:١٦٣)

**واتە: (ئەو زاتە هیچ هاوەڵو هاوبەشو شەریکێکی نییەو من بەوە فەرمانم پێدراوەو من یەکەم کەسی موسڵمانم)**. ئەدی کەوابوو چۆن دەکرێ خودا بناسرێ بۆ ئەوەی بپەرسترێو گوێرایەڵی بکرێ؟

ئەو کارە ئەرکی مرۆڤەکانە لەسەر زەمین، بێگومان خودای گەورە ئەقڵو هەستەکانی پێ بەخشیوە تاکو بەبیرکردنەوە خودای گەورە بدۆزێتەوە.. هەروەها بیر لەدیاردەکانی بوونەوەر بکاتەوەو تێیان بڕوانێو بەشوێنەوارەکانیو کارەجوانەکانیو مەزنی بەڵگەو نیشانەکانی بەخودا ئاشنابێو بیناسێ. ئەوانەی کەوا خودا دەدۆزنەوەو دەیناسن زاناکانن. خودای باڵادەست دەفەرمووێ: ﴿**هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ**﴾ (الزمر: ٩)

**واتە: (.... ئایا ئەو كەسانەی كە دەزانن وشارەزان، وەك ئەوانەن كە هیچ نازانن وشارەزاییان نییە؟...).**

بێگومان قورئانی پیرۆز وێنەی دیاردەكانی بوونەوەری كێشاوەو ئاوەزەكانی راكێشاوە بۆ تێرامانو بیركردنەوە لەكارە جوانو ناوازەكانی، ئەوەتا وێنەی زەویو ئەوانەی وان لەسەری لەچیاكانو ئەو رووبارانەی بەسەری دادەڕۆن پێشان داوە وەكوو دەفەرموێ ﴿**وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَاراً وَسُبُلاً لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ**﴾ (النحل : ١٥) واتە: **(هەر خوا لەسەر رووی زەوی چیاكانی چەسپاندووە تالەنگەری بگرێتو ئێوە نەلەرزێنێتو لارتان نەكاتەوەو ژێرەو ژوور نەبن. هەروەها چەمو رووبارو رێگەو بانی تیادا بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی رێ دەركەنو بەمەرامی خۆتان بگەن).**
هەروەها لەئایەتێكی دیكەدا دەفەرمووێ ﴿**أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَاداً {٦} وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً {٧}**﴾(النبأ: ٦-٧)

**واتە: (ئایا زەویمان وەك لانكە بۆ فەراهەم نەهێناون؟ ئایا كێوەكانمان وەك مێخ بۆ دانەكوتاون؟).**

هەروەها وێنەی دەریای پێشان داوە لەوەی كە بۆ مرۆڤەكانی ڕام كردووەو بۆ یانی كردووە بەمایەی سوودو قازانج وەكو دەفەرمووێ : ﴿**وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ**﴾ **(النحل: ١٤).**

**واتە: (هەر ئەو زاتەیە كە دەریای بۆ بارهێناون تاگۆشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن، تا لەناویدا جۆرەها گەوهەرو مرواری دەربهێننو لەدەست و ملی بكەن، هەروەها كەشتییەكان دەبینیت دەریالەت دەكەن، تافەزڵو بەخششی تری پەروەردگار بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بكەن).**

ودلەئایەتێكی دیكەدا دەفەرمووێ: ﴿**وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ**﴾ **(فاطر:١٢)**

**واتە: (هەردوو جۆرە دەریا وەكو یەك نین، یەكێكیان ئاوی سازگارو خۆش، ئەوی تریان سوێرو تاڵ، لەهەردووكیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن، جۆرەها شتی گرانبەها دەردەهێننو لەبەری دەكەنو خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، ئینجا كەشتییەكان دەبینیت ئاوەكە لەت دەكەن تالە بەخششەكانی**

پەروەردگار بەهرەوەر بن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریش بن).

هەروەها وێنەی دیاردەی ناناسایی لەدەریاكاندا پێشان داوە، وەكو دەفەرموێ ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخاً وَحِجْراً مَّحْجُوراً﴾ (الفرقان: ٥٣)،

واتە : (هەر ئەو زاتەیە كە ئاوی دوو دەریایان دوو رووبار لەپاڵ یەكدا، ئەمەیان شیرین و خۆش و سازگار، ئەوی تریان تفت و تاڵە،لەنێوانیاندا بەربەست و كۆسپی فەراهەم هێناوە ناهێڵێت تێكەڵ بن)

هەروەها وێنەی دیاردە سروشتی یە كانی ئاسمان و پەیوەندیان بە زەوییەوە پیشان داوە وەكو دەفەرموێ : ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾(الروم: ٢٤) واتە (هەروەها بەڵگەو نیشانەكانی تری ئەوەیە كە هەروە بروسكەتان نیشان دەدات كە ترسی لێ دەكرێت و ئومێد بەخشیشەو لەئاسمانەوە باران دەبارێنێت، زەوی پێ زیندوو دەكاتەوە دوای ئەوەی مردبوو، بەراستی لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانێك ژیریان بخەنەكار).

هەروەها وێنەی ئاسمان و ئەوانەی تیایدان لە هەسارەو ئەستێرەكانی پیشان داوە وەكو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ﴾ (الحجر :١٦)

واتە : (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لەئاسماندا چەند خولگەیەكی گەورەمان بەدی هێناوە بۆ ئەستێرەكان و رازاندوومانەتەوە بۆ ئەوانەی كەبەووردی تەماشای دەكەن) ئەو ئەستێرانەی كردووە بە مایەی ڕێنوێنی كردنی خەڵكان وەكوو دەفەرموێ : ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (الانعام :٩٧)

واتە : (هەر ئەو زاتە، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تاببێتە هۆی ڕێنموونیتان لەناو تاریكیەكانی سەر ڕووكاری وشكانی و دەریاكاندا، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان روون كرۆتەوە بۆ كەسانێك كە پێ ی بزانن و لێی تێبگەن) هەروەها وێنەی خۆرو مانگی پیشان داوە و پەیوەندیان سەبارەت بەزەوی و ژیانی مرۆڤی دیاریكردووە وەكو دەفەرمووێ : ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللّهُ ذَلِكَ إِلاَّ بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (یونس:٥)

واتە : (خوا ئەو زاتەیە خۆری كردوە بەسەرچاوەی تیشك و رووناكیەكی پرشنگدار، مانگیشی

كردوە بەسەرچاوەی رووناكی، چەندەها جێگەی هەڵهاتن‌و ئاوابوونیشی بۆ دیاری كردوە تا بتوانن بیكەنە بنەمای سالژمێری و حیساب ڕاگرتن، خوای گەورە ئەمەی بەبێ مەبەست دروست نەكردووە، بەڵكو هەمووی لەسەر بنچینەی حەق و راستی بەدی هێناوە، بەو شێوەیە ئەو زاتە ئایەت و بەڵگەو موعجیزەكانی روون دەكاتەوە بۆ كەسانێك كەبیزانن و تێی بگەن).

هەورەها وێنەی ئاو و رووەك و پەیوەندیان بە ژیانی مرۆڤ و گیانلەبەری پیشان داوە وەكوو دەفەرمووێ : ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاء إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾ (السجده:٢٧)

واتە : ئایا سەرنجیان نەداوە كە بەراستی چۆن ئێمە ئاوكێش دەكەین و دەیبەین بۆ زەوی و زاری وشك و بێ رووەك، جا بەو ئاوە رووەك و گژوگیا دەردەهێنین كە مالاتیان و خۆیشیان لێی دەخۆن، ئایا ئەوە نابینن و سەرەنج نادەن؟).

لەپاشاندا چەندەها بەرووبومی پیشان داوە وەكو دەفەرمووێ : ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّاتٍ مَّعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفاً أُكُلُهُ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ (الانعام:١٤١)

واتە : (خوا هەر ئەو زاتەیە كە باخاتی بەرزی لق و پۆپداری بەرپاكردووە و باخاتی نزمی پەرش و بلاویشی بەدی هێناوە و خورماو كشتوكاڵی جۆراو جۆریش كە شێوەو قەبارە و رەنگ و تام و بۆنیان لەخواردندا جیایە، لەزەیتون هەناری لەیەك چوو، لەیەك نەچوو، بخۆن بەرووبومەكەی كاتێك دەیگرێت و رۆژی چنین و دروێنە مافی هەژارانی لێبدەن و زیادەرەوی مەكەن، چونكە خوا لەسنوور دەرچوان و زیادەرەوانی خۆش ناوێت).

لەدواییدا وێنەی ژیانی مرۆڤ و قۆناغ بەندی ژیانی، لەو چەند ئایەتەدا پێشان داوە كە دەفەرمووێ : ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ* ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ* ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (١٢-١٤)

واتە: (سوێند بە خوا بەراستی ئێمە ئادەمیزادمان لەناوێتەیەكی پێكهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە* لەوەودوا لەجێگەیەكی پارێزراو، لەباردا لەشێوەی نوتفەیەكی زۆر بچووكدا دامان مەزراندووە* لەوەودوا نوتفەكەمان كردووە بە خوێ هەڵواسەرێك (سەرمێكوتەیەك) پاشان

**خۆهەڵواسەرەکەمان کردووە بەگۆشتپارەیەك، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان بەپەیکەری ئێسك گۆڕیوە و بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە، ئەوسا لەشێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکەو چاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە).**

هەروەها وێنەی تەندروستی پیشان داوە لە قەدەغەکردنی زیادە ڕەوی لەخواردنەوە دا وەکو دەفەرمووێ: ﴿**يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ**﴾ (الاعراف :٣١)

**واتە: (بخۆن و بخۆنەوە بەڵام زێدەڕۆیی مەکەن ...) چونکە میانەڕەوی کردن لە خواردن و خواردنەوە هۆیەکە بۆ ساغی و دروستی لەش و زیادە ڕەوی کردنیش تیایاندا هۆیەکە بۆ نەساغ بوونی لەش، بەمەش ڕێسایەکی بۆ زانستی پزیشکی داناوە.**

لەپاشاندا قورئانی پیرۆز وێنەیەکی گشتگیری بۆ ئەو ئایەتانەی کە لەپێشدا رابرد پیشان داوە کە دەستوورو یاساکانی زانستیی ئیمانی لەسەر بناغەکەی بنیادناوە وەکو دەفەرمووێ: ﴿**إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاء مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ**﴾ (البقرە :١٦٤)

**واتە: بەڕاستی لەدروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵو گۆڕی شەو و ڕۆژداو لەو کەشتیانەدا کە دەگەڕێن بەدەریاداو بەهۆیەوە سوود بەخەڵکی دەگەینن و لەو ئاوەی کە خوا لەئاسمانەوە دەیبارینێت و ئینجا بەهۆیەوە زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە دوای وشك بوون و مردنی، هەروەها جۆرەها زیندەوەرو گیانلەبەرو ماروومێرووی لەسەر رووکاری زەویدا بڵاوکردۆتەوە و گۆڕاندن و هاتوو چۆپیکردنی باوشەماڵ و راگیرکردنی هەورەکان لە نێوان ئاسمان و زەویدا، ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی کە عەقل و بیرو هۆشیان دەخەنەکارو بیر لەدەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەکەنەوە).**

کوڕە شیرینەکەم ئەمەیە قورئانی پیرۆز، هەر ئەو سەرچاوەی زانستە بۆ هەموو وێنەکانی ژیان و بوونەوەر بەسەرجەم دیاردەکانیەوە، هەروها یاسا گەلێی ڕێك و پێکی تێدایە بۆ ژیانی تاك و کۆمەڵ و ئەو حوکمانەش لە خۆی دەگرێ بۆ کۆمەڵگایەکی ساغ و تەندروست کە ئاشتی وئاسایش و دادپەروەری تێدا بەرقەرار دەکات و چاکەو چاکەکاریشی تێدا بەرپادەکات .

وەئایەتەكانی بە رەوانبێژێكی جوان دارشتوو، خۆشترین ئاوازی تێدایە بۆ راكێشانی گوێچكەكان بۆ لای خۆی هەتا كاتێك لە ویژدانی مرۆڤەكە جێگیردەبێ، ئینجا دەبێتە نورو رۆناكی، بە هۆیە وە نهێنی یەكانی ژیان و بوونەوەر وەدەر دەخات بەهۆیەوە بەزانستێكی كە لەسەر ئیمان و باوەر بیناكراوە دەگاتە ناسینی خودای پەروەردگار .

لەبەر ئەمە ئەركی سەرشانی فێرخواز ئەوەیە تاوەكو ببێتە زانا، پێویستە بە راڤەكردن قورئان تێبگات، ئەوەش بەریارمەتی زانایانی زمان، وە لۆجیكانە حوكم بەسەر تێگەیشتن لە قورئاندا بكات و بەهۆی فیقهیشەوە حوكمەكانی بزانێت ..... هەروەها چاو بەناو جیهانی ئاسمان و ئەوانەی لەناوی دان لە ئەستێرەكاندا بە هۆی گەردووناسینەوە و بە هۆی جیۆلۆجی زانینەوە چاو بە دەریاكانو رووبارەكان و چیاكان و دەشتەكان و گیانلەبەرەكان و رووەكەكاندا بگێرێت، هەروەها بەهۆی زانستی جوگرافیا وە بەسەر زەوی دا بروات و رێگە و رێچكەكان و مەشخەڵەكانی بدۆزێتەوە، وەبەزانستی مێژووەوە هەواڵی خەڵكانی رابردوو بزانێ و شوێن رێرەوی رووداوەكانیان بكەوێ، هەروەها بەهۆی زانستی پزیشكیەوە هۆكارەكانی تەندروستی و نیشانەكانی نەخۆشی و چارەسەركردنیان بزانێ، تادەگاتە زانستەكانی دیكەش كە پەیوەندی بە قورئانەوە هەیە، یاخود لەوەوە لقی لێ بووەتەوە، بەمەش قورئان هێزێكی پاڵنەرە بۆ وەرگرتنی زانست و زانست خوازی.

# چەمكی ئیعجاز

((**العجزُ**)) لەرووی زمانەوانیەوە پێچەوانەی (الحزم)ە، ((**التَّعجز**)) واتە دەستەوەستان كردن. وەچاوگی (**أعجزً**) بریتی یە لە (الاعجاز)، دەستە واژەی ((**مُعجِزة**)) ش هەر لەوەوە هاتووە كە یەكێكە لە موعجیزەكانی پێغەمبەران . كەوا پاڵپشتی پێغەمبەرایەتیان دەكات (سەلامی خوایان لێ بێ) .

لەقورئانی پیرۆزدا دەستەواژەی ((**اعجاز**)) یاخود(**مُعجِزة**)) نەهاتووە و هەروەك چۆن نوسەران و دانەرانی كۆنیش بەكاریان نە هێناوە، بەڵكو لەبری ئەوەدا ووشەی ((آیة)) واتە بەڵگەو نیشانە یاخود ((**كرامة**)) تیان بەكارهێناوە، هەتا (**الواسطي**) هات و ناونیشانی ((**اعجاز القرآن**))ی بۆ كتێبە ناودارەكەی هەڵبژارد...

# مەرجەكانی ناونانی موعجیزە

- دەبێ ڕووداوێك بێت لەتوانای مرۆڤ دانەبێ، بەڵكو تەنیا خودای باڵادەست توانای بەسەردا هەبێت .

- دەبێ ئەو ڕووداوە لەیاساو ڕێساكانی سروشت بەدەربێ.

- دەبێ خودای كار لەجێ هەواڵی لەبارەیەوە دابێ و هاورێكی گوتەی ئەو بێ .

كوڕە شیرینەكەم بزانە كە هەر هەموو پێغەمبەرەكان بەڵگەو نیشانەكانیان وەكو موعجیزەیەك لەگەڵ خۆیاندا بۆ قەومەكەیان د دەهێنا كە بە هۆیەوە ڕووبەڕوویان دەبوونەوەو بێ منەتیان دەكردن، بەشێوەیەك هیچ كەسێك پێشتر بەڵگەو نیشانەی لەو جۆرەی نەهێنابوو، بەڵكو هەندێكیان زیاتر لە بەڵگەو نیشانەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا تاكو ببنە بەڵگەی بڕاوە لە سەر ئەوەی كە ئەو لەلایەن خودای گەورەوە نێردراوە .... ئەگەر بڕوایان پێ نەكردو سەركەشیان كرد با بەڵگەو نیشانەیەكی بە وێنەی ئەوانە بهێنن، ئەمەش هەرگیز ناكرێ.. وە ئەو موعجیزیەی كە دەدرا بە یەكێ لە پێغەمبەرەكان، تایبەت بوو بەقەومەكەی خۆی، نەدەبووە هی ئەو پێغەمبەرانەی كە لە دوای ئەودوە دەهاتن، (موسی) سەلامی خوای لێ بێ موعجزەكەی بریتی بوو لە ئەو گۆچانەی كە كاتێك هەڵی دەدا شێوەی بۆ (مار) ێك دەگۆڕا كە بەخێرایی بەسەر زەوی دا دەخشا...كاتێك كۆچی دوایی كرد موعجیزەكەی كۆتایی هات .. هەروەها (عیسی) سەلامی خوای لێ بێ بەفەرمانی خودا كوێری زگماك و بەڵەكی چاك دەكردەوە، بەڵام كاتێك خودای گەورە بۆ لای خۆی بەرزی كردەوە كۆتایی پێهات..

بەڵام پێغەمبەری ئێمە (موحەمەد) (ﷺ) موعجیزەكەی هەتا ڕۆژی قیامەت نابڕێتەوە، بەفەرمانی خودا كامڵ و پارێزراوە، موعجیزەكەشی بریتی یە لە قورئان ... كتێبە نەمرەكەی خودا، هەموو ئەو خەڵكانەی كە لەدوای پێغەمبەرمانەوە (ﷺ) هاتوون دەتوانن ببیینن و بیخوێننەوە ... سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی كە بەسەر زۆربەی بەدیهێنراوەكانی خۆی بەرزی كردووینەتەوە.

**کوری شیرینم** ... خودا من و تۆ سەرکەوتوو بکات بۆ ئەو کارانەی کە خۆشی دەوێن و لێیان رازیە – بزانە کە قورئانی پیرۆز بەوپەری راشکاوییەوە ئیعجازی پەنهانی خۆی چەسپاندوە، زێدەرۆیی لێ ناکەم گەر بڵێم ئەم جۆرەیان مەزنترین جۆری ئیعجازە کە قورئان باسی کردوە، چونکە ئەستەمە هیچ مرۆڤێك بزانی لە داهاتوودا کەچی ڕوودەدات، چونکە ئەمەیان تایبەتمەندیەکە لە تایبەتمەندیەکانی خودای گەورە. خودا دەفەرمووێ : ﴿**قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ**﴾ (النمل: ٦٥) واتە : (**ئەی پێغەمبەر (ص) پێیان بڵێ : جگە لەخوا هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارنین لە پەنهان ولە شاراوەکان، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە**)

فەرموو با تەماشای ئیعجازی قورئان بکەین کە لە بارەی پەنهان و ئەوەی کە بەر لە گەیشتن و ڕوودانی باسی لێوەکردووە.

# غەزای بەدر

خودا دەفەرمووێ : ﴿**وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ**﴾ (الانفال :٧)

واتە : (**یادی ئەو کاتە بکەنەوە خوا بەڵێنی پێدابوون کە یەکێك لەو دوو دەستەیە بەڕاستی بۆ ئێوە دەبێت، ئێوەش بەڕاستی ئاواتە خوازن و حەزدەکەن کاروانە بێ چەك و ئاسانەکە بۆ ئێوە بێت، خوایش دەیەوێت حەق و ڕاستی بەفەرمانەکانی خۆی بچەسپێنێت، کافرانیش بنەبڕ بکات و ڕیشەکەنیان بکات**).

ڕاڤەکردنی : (و) باس بکە. (اذ يعدكم الله احدى الطائفتين) واتە یان کاروانەکە یان سەرکەوتن بەسەر لەشکرەکەدا (أنها لكم وتودّون) دەتانەوێت (ان غير ذات الشوكة) کاروانە بێ چەك و ئاسانەکە (تكون لكم) لەبەر کەمی ژمارەو چەك و جەنگاوەرەکانی بەپێچەوانەی لەشکرەکە (ويريد الله أن يحق

الحق) واتە حەق و راستی بچەسپێنێ (بکلماتە) واتا بەو گوتانەی کە پێشتر فەرموو بووی کە سەرخستنی ئیسلام بوو (ویقطع دابر الکافرین) واتا دوابراویان بکات بە ریشەکەنکردنیان، هەربۆیە فەرمانی پێکردن هەر لەگەڵ لەشکرەکەدا بکەونە جەنگ کردن.

ئەمە بەر لە غەزای بەدر هاتبوو، ئەوەبوو خودای گەورە بەڵێنی بە موسڵمانەکان دابوو یان ئەو کاروانەی کە بە دوایان بوون بخاتە ژێر دەستیان یانیش سەرکەوتن لەغەزای بەدر، جاکێ هەواڵی بە (محمد) (ﷺ) دا کەکاروانەکە رزگاری دەبێ و سەرکەوتن لەغەزای بەدر بۆ موسڵمانەکان دەبێت ؟

## مردنی ئەبو لەهەب و وەلید بەکافری

خودای گەورە لەبارەی وەلید دەفەرمووێ : ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾ (المدثر:٢٦) واتە : **(دەبێ بیگەینمە ناو دۆزەخ)** هەروەها لەبارەی ئەبولەهەبەوە دەفەرمووێ : ﴿سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ﴾ (المسد : ٣) واتە : **(لەئایندەدا دەخرێتە ناو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە)** جا دەکرا یەکێ لەو دوو پیاوە بووبایە موسڵمان بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە قورئان هەڵەی تێدایە!، بەلام قورئان بریاری دا کە ئەمانە موسڵمان نابن و لەئایندەشدا هەر موسڵمان نابن، بۆیە چارەنووسیان هەردۆزەخ دەبێ . ئەوە بوو هەردووکیان بەناموسڵمانی و بێ باوەڕی مردن.

## پاراستنی پێغەمبەر لەکوژران

خودای گەورە دەفەرمووێ : ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ (المائدە: ٦٧) واتە : **(ئەی پێغەمبەرو فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە رای بگەیەنە. خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەت بەتەواوەتی نەگەیاندووە دڵنیاش بە خوا دەتپارێزێت لەشەڕو خراپەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی خواهیدایەت و رێنموویی قەوم و هۆزی بێ باوەڕان ناکات)**

## راڤەكردن :

خودا فەرموويەتى : (وَاللّهُ يَعْصِمُكَ) واتــە : تــۆ پەيامەكــەى مــن بگەيەنــە، منــيش پــارێزەرو سەرخەرو پشتگيرى تۆ دەبم لەبەرامبەر دوژمنــەكانت، ســەرت دەخــەم بەســەرياندا، كــەوابێ هــەرگيز مەترسەو خەمبار مەبە، هيچ يەكێ لەوان بەمەبستى خراپە ناتوانن پێت بگەن ئازارت بدەن. دڵنيا بــە كە تۆ ناكوژرێيت بەڵكو لەسەر جێ و بالينگانەكەتدا بەمردنى خۆت دەمرى.

پێغەمبەر (ﷺ) بەر لە دابەزينى ئەو ئايەتە لەلايەن هاوەڵەكانيەوە پاسەوانى لێدەكراو پاســەوانى هەبوو. وەكو ئيمامى ئەحمەد لە خاتوو عائيشەوە (خوا ليّى رازى بــێ) دەگێرێتــەوە كــە دەيفــەرموو : (شەوێكيان پێغەمبەر (ﷺ) لەخەو بێدار بوويەوە و ئەويش لە تەكييەوە بوو دەڵێ منيش گوتم : ئــەى پێغەمبەرى خودا چيت دەوێت ؟ فەرمووى : (خۆزگە ئێستا پيــاوێكى چــاك لــە هەوالــەكانم دەهــات و ئەمشەو پاســەوانى لێدەكردم) خاتوو عائيشە دەڵێ : ئێمە لەو قسانەدا بووين گوێم لە دەنگى زرينگەى چەك بوو، فەرمووى : (ئەوە كێيە ؟) گوتى : من سەعدى كورِى ماليكم، فەرمووى (بۆچى هاتوويت ؟) گوتى ئەى پێغەمبەرى خودا هاتوومە پاسەوانيت بكەم، خاتوو عائيشە دەڵێ : ئينجــا مــن گــوێم لــە پرخەى خەوى پێغەمبەر (ﷺ) بوو . دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بــەردەوام پاســەوانى لێــدەكرا هــەتا ئــەو ئايەتە دابەزى : (وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) سەرى لــە كەژاوەكــەى دەرهێنــا و فــەرمووى : (ئــەى خەڵكينــە بــلاوەى ليبكــەن ئــەوا خــوداى گــەورەو بالادەســت پاســەوانيم دەكــات ودەمپارێزێت). (رواه الترمذي) .

هەروەها خــواى گــەورە پێغەمبەرەكــەى خــۆى (ﷺ) لــە خــەڵكى مەككــەو گــەورە دوژمنــان و حەسوودەكان و سەركێشەكان و لەخۆباييەكانى ئەم شارە پاراست، ئەمە لەگــەڵ ئــەوەى دوژمنايــەتى و رق و كينەيان بەرامبەرى گەلێك زۆر توند و تيــژ بــوو، هــەروەها بەشــەوو بــەرۆژيش پلانــى دژايــەتى كردينان بۆى دادەرِشت، ئەم پاراستنەش بەوە بوو كە خوداى بالا دەست بەهۆى هێزو توانايى و دانــايى گەورەو مەزنى خۆى هۆكارگەلى گەورەى بۆ بەديدەهێنا، ئەوەبوو لەدەست پێكــى پەيامەكــەدا بــەهۆى ئەبو تاڵيبى مامى يەوە پارێزگارى لێ دەكرا، كــە ســەرۆكێكى گــەورەى قــسە رۆيــشتوو بــوو لــەناو قورەيشدا، خواى گەورە خۆشەويستيەكى سروشتيانە نــە ك (شــەرعيانە) ى لــەدڵى ئــەبوو تاڵيبــدا بــۆ پێغەمبەرەكەى دروست كرد، ئەگەر موسڵمان بوايە ئەوە كــافران‌و گــەورەكانيان دەســتدرێژيان دەكــردە سەرى . كاتێكيش ئەبو تاڵيبى مامى مرد، موشريكەكان ئازارێكى كەمى پێغەمبەر (ﷺ) يان دا .

دواتر خوای گەورە ئەنسارەكانی بۆ تەرخان كرد و گفتیان لەسەر ئیسلام پێی داو لەسەر ئەوەش كە بگوازێتەوە بۆ ماڵەكانی ئەوان كە لە شاری مەدینە بوو، كاتێكیش چووە ئەو شارە پارێزگاریان لیّ كرد لە موشریكەكان و ئەهلی كیتاب و هەركەسێكیش كە بیویستبایە خراپەی لەبەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) دا بكات.

# رزگار كردنی مەككە

خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَلِكَ فَتْحاً قَرِيباً﴾ (الفتح :٢٧).

**واتە : (سوێند بەخوا بێگومان خوا خەونی پێغەمبەرەكەی بەراستی وەك خۆی هێناوە تە دی كە دەفەرمووێت : بەم زووانە ئێوە بەهەموو ئارامی و ئاسوودەییەكەوە بەویستی خوا دەچنە ناوكەعبەی پیرۆزەوە، سەرەتان دەتاشن یان كورتی دەكەنەوە بێ ئەوەی ترس وبیمتان لەكەس هەبێت، جا ئەوەی نەتانزانیوە خوا دەیزانێ، كەجگە لەم سەركەوتنە سەركەوتنێكی نزیكی تر بۆ بڕیارداوان و پێتان دەبەخشێت).**

راڤەكردنی : پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا بینی كە چۆتە ناو مەككە و تەوافی بەیتیشی كردووە، ئەو هەواڵەی لە مەدینەدا بە هاوەڵەكانی راگەیاند، كاتێكیش لە ساڵی حودەیبییەدا بەرەو مەككە بەرێ كەوتن، كۆمەڵێك لە هاوەڵەكان گومانیان ئەبوو لەوەی كە ئەم خەوە لەو ساڵە دێتەجێ، كاتێك ئەوە لە مەسەلەی رێكەوتن روویداو ئەو ساڵە گەرانەوە بەو مەبەستەی كە لە ساڵی داهاتوو دا بۆی بگەرێنەوە، بەو هۆیەوە شتێ كەوتە ناودڵی هەندێ لە هاودڵەكان (رەزای خوایان لیّ بێ) هەتا ئیمامی عومەری كوری خەتاب (رەزای خوای لیّ بێ) پرسیاری لەم بارەیەوە كردو بە پێغەمبەری گوت : ئەدی تۆ پێت رانەدەگەیاندین ئێمە دەچینە كەعبەو تەوافی بەیت دەكەین ؟ پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : (بەڵێ، بەلاّم ئایا من پێم راگەیاندنی كە ئەم ساڵە دەچیتە ناوی؟ : گوتی نەخێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دەكەابوو دڵنیا بە كە دەچیتە ناوی و تەوافی بەیتیش دەكەی) (ئەبوو بەكری صدیق) یش (خوالیّ ی رازی بێ) هەرهەمان وەلاّمی دایەوە، لەبارەی ئەمە خوای گەورە فەرمووی : (لقد صدق الله

رسوله الرؤيا بالحق لتدخلنّ المسجد الحرام اِن شاء الله..) ئەمەش بۆ جەخت كردنەوە لەسەر هەواڵەكەو دووپات كردنەوەی .

كاتێك مانگی (ذی العقدة) ی ساڵی حەوتەمی كۆچی هات، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانی حودەیبییە بەمەبەستی عومرە كردن چوونە دەرەوە، ئەوە بوو لە (ذی الحليفة) دا ئیحرامی بەست و قوربانیەكانی لەگەڵ خۆیدا برد، بریتی بوو لە شەست قوربانیی بەگوتنی (لبيك اللهم لبيك....) خۆی و هەواڵەكانی كەوتنە رێ، كاتێك پێغەمبەر (ﷺ)گەیشتە نزیك (مّرالظهران) (محمدی كوری مەسلەمە) بەولاغ و چەكیش لەبەردەمیەوە هەنارد، كاتێك موشریكەكان بینیان ترسێكی زۆر گەورەیان لێ نیشت، واگومانیان برد پێغەمبەر (ﷺ)پەلاماریان دەدات و ئەو پەیمانەشی هەڵوەشاندۆتەوە كە لەنیوانیان مۆركرا بوو كە بۆ ماوەی دەساڵاَن جەنگ رابگرن، بۆیە رۆیشتن و ئەو هەواڵەیان بە خەڵكی مەككە راگەیاند، هەر لە رێگای رۆیشتندا قورەیش (مكرزی كوری حفص) یان نارد گوتی : ئەی (محمد) ئێمە تۆمان وانەناسیوە كە پەیمان بشكێنی و هەڵیوەشێنیتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (كوانێ ؟) گوتی : تۆ بە چەك و رمەكانەوە هاتوویتە سەرمانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ئەمە وانیە چەكەكانمان رەوانەی (يأجج) كردوە) گوتی : ئێمەش هەروا تۆمان بەچاكەكار و جوامێرو بەئەمەك ناسیوە، سەرانی كوفر لەمەككە چوونە دەرەوە وەكو دەربرینی رق و كینێك تاكو چاویان بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاواڵەكانی نەكەوێت .

بەلاّم ئەوانی دیكە لە خەڵكی مەككە لەپیاوان و ئافرەتان و مناڵاَن لەسەر رێگەكان و سەربانەكان دانیشتبوون سەیری پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەكانیان دەكرد. ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) لەسواری وشترەكەی كە ناوی (قەسوا) بوو هەمان ئەو وشترە بوو كە لەرۆژی حودەیبییە سواری ببوو، چووە ناو مەككە و هاوەڵەكانیشی لەگەڵ دابوون و (لبيك اللهم لبيك....) یان دەگوتەوە، عەبدوڵلاّی كوری رەواحە ی ئەنساریش جڵەوی وشترەكەی پێغەمبەر (ﷺ) ی گرتبوو بەدەم راكێشانەوە دەیگوت:

خلو بني الكفار عن سبيله — اني شـهيد أنه رسـوله
خلـو فكل الخير في رسـوله — يارب اِني مؤمنٌ بقيلـه
نحن قتلناكم على تأويلـه — كما قتلناكم على تنزيلـه
ضرباً يزيل الهام عن مقيله — ويذهل الخليل عن خليلـه

واتە: (کۆمەڵی کافران ڕێگایان بەردایە، من شاهێدم، کە ئەو پێغەمبەری خودایە، وازیان هێناو هەموو خێرو چاکەیەك هەر لە پێغەمبەرەکەی دایە، پەروەردگارا من باوەردارم بەقسەکانی ئەو، ئێمە بەپێ ی راقەی ئەوو بریاری ئەو ئێوەمان کوشت، بەڵێندانێکی ئەو تۆ کەهۆش لەشوێنی خۆی لادەبات دوو خۆشەویستیش لەیەکتر سەرسام دەکات).

پاشان خوای بەرز وبالا موژدەی سەرخستنی پێغەمبەر(ﷺ) ی بەسەر دوژمنەکانی بەخشی یە باوەرداران و بەتەواوی خەڵکی سەر زەوی فەرمووی : (هوَ الذي أرسل رسوله بالهدى ودين الحق) واتە : (ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی رەوانەکردووە بە زانستی بەسوود و کاری چاك و رێنموویی) چونکە شەریعەت دووشت دەگرێتەوە ئەوانیش : (زانست و کردار)ن (لِيَظهره على الدين كلّه) واتە : (بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو ئاینەکانی دیکە لەتەواوی خەڵکی سەر زەمین لەعەرەب و عەجەم و موشریکەکان (وكفى بالله شهيداً) واتە : (ئەو نێردراوی خۆیەتی هەرخۆشی سەری دەخات.

لە مانگی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا، سوپای موسڵمانان بەبێ هیچ بەرەنگاریەك چوونە نێو مەککەوە و، شاری ئارام بەبێ کوشتار فەتح کرا، پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر پشتی وشترەکەیەوە چووە ناویەوە، نەك وەکو سەرکردەکانی دیکە بە خۆ بەزل زانی و لە خۆباییەوە بەڵکو بەمل کەچی و گەردەن کەچی و ترسان لەخودای بالا دەست، بەسەر ئەوی کردنەوە لەسەر پشتی وشترەکەیەوە، کە خەریك بوو سەری بەزینی وشترەکەیەوە دەنووسا! ئەمەش وەکو سوپاس گوزاریەك بوو بۆ خودای گەورە لەبەرامبەر نیعمەتی ئەو فەتحە گەورەیەو ئەو فەزڵە گەورەیەی کە پێ ی بەخشی پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام بوو لەخوێندنەوەی سوردتی (الفتح) هەتا گەیشتە کەعبەو موسڵمانەکانیشی لەگەڵدابوو، بە گۆچانە کورتەکەی سەلامی لە روکن کردو تەکبیرەی کرد، موسڵمانەکانیش لەدوای ئەو تەکبیرەیان دەکرد، هەتا بەدەنگ و سەدای تەکبیریان شاری مەککە هەژایەوە، پاشان بەسەرپشتی وشترەکەیەوە بەنەرمە راکردنێك تەوافی کەعبەی کرد، لە هەموو خولانەوەیێکی بەدەووری کەعبە دا بەگۆچانە کورتەکەی سەلامی لە بەردە رەشەکە دەکرد. بەمجۆرە هەتا تەوافەکەی تەواو کرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە تەواف کردنی بوویەوە لەسەر وشترەکەی دابەزی، پاشان چووە مەقام و دوو رکات نوێژی تێدا کرد ، پاشان چووە لای ئاوی زەم زەم و لێی خواردەوە و دەست نوێژی تێداشۆرد و موسڵمانەکانیش لەدەوری بوون، وەکو ئەویان دەکرد، موشریکەکانیش سەیری ئەو دیمەنەیان دەکرد و سەریان سوڕما بوو لەوەی کە دەیاندیت و دەیانگوت : هیچ موڵك و دەستەڵاتێکی واگەورەمان نەدیوە و نەبیستووشمانە...

# لێبووردنێکی بێ وێنە

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) وتارێکی درێژی دا، تیایدا کۆمەڵە حوکمێکی باسکرد پاشان فـەرمووی : هۆ کۆمەڵی قورەیش، ئەوا خودای گەورە لاف و گزافـی نـەفامی و خۆهەڵـدان بەباوکـەکانی لـە کـۆڵ کردنەوە . خەڵکان لەئادەمن، ئادەمیش لەگڵە) پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە :﴿**يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ إِنَّـا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنـدَ اللَّـهِ أَتْقَـاكُمْ إِنَّ اللَّـهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**﴾ (الحجرات : ١٣)

**واتە : (ئەی خەڵکینە بێ گومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروست کردوە، کردوومانن بەچەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆراوجۆر هەتا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خـۆش بێـت بەیەکـەوە: بەڕاستی بەرێزتر لا ی خوا ئەو کەسانەتانە کـە زۆر لـە خـوا ترسـەو فـەرمان بـەرداری خوایـە، بێگومان خوا زاناو ئاگادارە بەهەمووان) .**

پاشان فەرمووی : (هۆ کۆمەڵی قورەیش ، ئێوە چی دەڵێن .. وا دەزانن من چیتان لێ دەکـەم ؟) گوتیان : چاکەمان لەگەڵ دەکەی وەکو برایەکی گەورە، برازایەکی گەورە .. فەرمووی : (من ئەوە دەڵێم وەکو کە یوسفی برام گوتی : ئەمڕۆ هیچ لۆمەیەکتان لەسە ر نیە، خودا لێتان خۆش بـێ کـە ئـەو لـە هەموو کەسێك بە بە زەیی ترە .. بڕۆن ئێوە ئازادن) .!

بێگومان ئەو بڕیاری لێبوردنە لـە پێغەمبـەرەوە (ص) فـەتحێکی دیکـەبوو، کـە خـودای گـەورە بەهۆیەوە دڵە داخراوەکانی کردەوەو بوون بە دڵێکی ئەوتۆ کە خۆشەویستی و دڵسۆزی بـۆ دینـی خـواو پێغەمبـەری خوایـان لێ هەڵـدەقوڵا کـە بەرەحمـەت لەلایـەن خـودای گـەورە وە هـەناردرابوو، خـودا دەفەرمووێ : ﴿**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ**﴾ (الانبیاء: ١٠٧)

**واتە: (ئەی محمد (ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێت ، کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکـەت بۆجیهانـەکان)** . ئـەوە بـوو خـەڵکان بـە دڵ و دەروونێکـی ڕازی و ئارامـەوە هاتنـە ناوئایینەکەیەوە .

# شکاندنی بتەکان

پێغەمبەر (ﷺ) لە (٢٠) بیستی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی هەشتەمی کۆچی بوو، چووە ناومەککە، فەرمانی بەبیلال کرد بچێ لەسەر بانی کەعبەدا بانگ بدات، بیلالیش سەرکەوتە سەر کەعبە و دەستی بەبانگدان کرد کە سەدای دەنگی گەیشتە هەموو شوێنێکی مەککەوە :

(الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، أشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان لا اله الا الله، اشهد ان محمداً رسول الله، اشهد أن محمد ا رسول الله، حيَ على الصلاة، حيَ على الصلاة، حيَ على الفلاح، حيَ على الفلاح، الله اكبر، الله اكبر، لا اله الا الله) .. پاشان قامەتی نوێژ کراو، پێغەمبەریش (ﷺ) هەستاو نوێژی لەحەرەمی کەعبە بۆ خەڵکەکە کرد، خەڵکەکەش لەگەڵ ئەودا هەستانەوە و لە شوێنی خۆیان ڕیزیان بەست ، لەگەڵ ئەودا دەچوونە ڕکوع، لەگەڵ ئەویشدا دەچوونە سوژدە بردن، هەر لەگەڵ ئەویش هەڵدەستانەوە .. لەگەڵ ئەویش دادەنیشتن .



پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەلابردنی هەموو شوێنەوارێکی شیرك و بت پەرستی کرد، ئەوە بوو فەرمانی کرد تەواوی بتەکانی دەووربەری کەعبە بروخێنیرێت، کە ژمارەیان سێ سەدو شەست بت بوو، هەموو گەرەکێکی عەرەبەکان بتێکیان هەبوو، جا سەرجەم بتەکان شکێنران، کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) کاری لە کەعبەدا تەواو بوو، لەهەموو شوێنەواری بەندایەتی کردنی جگە لەخودا کە کەعبەیان پیس کردبوو، پاکیی کردەوە، فەرمانی بەیەکێ کرد کە بەناو خەڵکی مەککە دا بانگ ڕادێری

(هەرکەسێك باوەری بەخوداو ڕۆژی دوایی هەیە، با هەرچی بتێکی لە ماڵەوە هەیە، بیشکێنێ) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سریەکانی خۆی ناردە ناو تیرەو هۆزەکانی دیکەی دەوروبەری مەککە، بۆ ئەوەی هەرچی بتێك لەوێدا ماوەتەوە نەمێنێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاکو و ئەقل و ئاوەزەکان لەژەنگی داب و نەریتەکان ئازاد بن و لە هەموو جۆرەکانی شیرکیش بۆ خودا رزگاریان ببێت.

# رزگار کردنی قوستەنتینیە

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی و حاکیم لە لە عەبدوڵڵای کوڕی بیشری خەسعەمی ئەویش لە باوکیەوە ریوایەتیان کردووە کە گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە دەیفەرموو : (لتفتحن القسطنطينية، فلنعم الأمير أميرها، ولنعم الجيش ذلك الجيش) واتە : (بێگومان ئێوە قوستەنتینیە فەتح دەکەن، لە و کاتەدا فەرماندەی سوپاکە چاکترین فەرماندەیە، سوپاکەش چاکترین سوپایە) دەڵێ جا (مسلمەی کوری عبدالملك) بانگی کردم و پرسیاری لێکردم، منیش فەرموودەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش غەزای قوستەنتینیەی کرد.

بێگومان خودای گەورە ئەوەی پێغەمبەرە مەزنەکەی هەواڵی لەبارەیەوە دابوو هێنایەجێ و قوستەنتینیە فەتح کرا، ئەوەی فەتحیشی کرد (محمدی کوری فاتیح) بوو، کە حەوتەمین پاشای عوسمانییەکان بوو، ناویشی سوڵتان موحەمەدی کوری سوڵتان مواردخان بوو، لەساڵی (٨٣٥ك) لەدایك بووەو لەساڵی (٨٥٦ ك) جلەوی دەستەلاتی گرتە دەست و ماوەی دەستەلاتیشی (٣١) ساڵ بوو ڕەحمەتی خودای لێ بێ .

ئەو یەکێ بوو لەگەورە سوڵتانەکانی عوسمانییەکان و پاشایەکی ئاقل و داناو لێهاتوو بوو، لە پەنجاو یەکەمین ڕۆژی گەمارۆ دانەکەی دا لە ڕۆژی چوارشەممەی (بیستی جومادای ئەخیری ساڵی هەشت سەدو پەنجاو حەوتی کۆچی) ئەستەنبوڵی فەتح کرد و لەگەورەترین کلیسای نەسرانیەکانیش کەناوی (ئایا سۆفیا) بوو، نوێژی هەینی ئەنجام دا، لە ئەستەنبول دا بنچینەیەکی پتەوی بۆ زانست دامەزراندن کە مەترسی بزربوونی لێنەدەکرا.. هەروەها چەندین قوتابخانەی تێدا بنیاد نا، خودا لەبری موسڵمانان پاداشتی چاکەی بداتەوە.

# لەناوچوونی قەیسەرو کیسرا،
# بەخشینی گەنجینەکانیان لە پێناو خودای گەورە

ئیمامی بوخاری و موسلیم، لە ئەبو هوریرەوە (خوا لیّ ی رازی بێ) روایەتیان کردووە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (اذا هلك كسرا فلا كسرى بعده، واذا هلك قيصر فلا قيصر بعده، والذي نفسي بيده لتنفقن كنوزهما في سبيل الله) واتە: (ئەگەر کیسر ا لەناوچوو ئەوا هیچ کیسرایەکی دیکە لەدوای نایەت، ئەگەر قەیسەر لەناوچوو ئەوا هیچ قەیسەرەێکی دیکە لەدوای نایەت، سوێند بەو خودایەی گیانی منی لەدەستە بەبێ گومان ئێوە گەنجینەکانیان لەپێناوی خودا دەبەخشن).

زاناکان دەڵێن: فەرمووەی پێغەمبەر (ﷺ): (اَذا هلك كسرى، فلا كسرى بعده) مەبەستی پێ زەوی خۆیەتی کە عیراقە، وەکەددفەرمووێ : (اذا هلك قيصر فلا قيصر بعده) مەبەستی پێ زەوی خۆیەتی کە ولاّتی (شام) ە، نەك مەبەستی ئەوەبێ کە کیسرا یەکی دیکەو قەیسەرێکی دیکە دوا بەدوای ئەوان نایەن، بێگومان ئەو ولاّتانە فەتح کران و ئێمەش ئەمڕۆ وا لەناوی دەژین و سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان.

# کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەر (ﷺ)
# دوا بەدوای ئەویش فاتیمەی کچی

ئیمامی بوخاری و موسلیم لەسەحیحەکەی خۆیاندا، لەخاتوو عائیشەوە ریوایەتیان کردووە : کە پێغەمبەر (ﷺ) فاتیمەی کچی بانگ کردوو چەند قسەیەکی بەگوێی چرپاند، ئەویش دەستی بەگریان کرد، پاشان دووبارە بانگی کردەوە چەند قسەیەکی بەگوێیدا چرپاند ئەم جارەیان پێکەنی، عائیشە دەفەرمووێ بەفاتیمەم گوت : پێغەمبەر (ﷺ) چی بەگوێت چرپاند ئاوا گریایت ، بۆ ئەوەی دیکەشیان پێکەنیت ؟ گوتی : جاری یەکەم هەواڵی مردنی خۆی پێ گوتم منیش گریام، پاشان بۆ جاری دووەم هەواڵی پێدام، من یەکەمین کەسم لەخانەوادەکەی لەدوای ئەو وەفات دەکەم، منیش پێکەنیم .

زانایان دەڵێن : ئەمە موعجیزەیەکی ئاشکراو ڕوونی پێغەمبەرە (ﷺ) بەڵکو دوو موعجیزەیە،

یەکەمیان هەواڵی مانەوەی فاتیمە لەدوای ئەوداو دووەمیشیان یەکەمین کەسی خانەوادەکەیەتی کەپێ ی دەگاتەوە، بێگومان هەرچۆنی فەرموو ئاوا روویدا، پێکەنینەکەی لەبەر ئەوە بوو کە دڵ خۆش بوو بەوەی کە زوو دەگاتە وە پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها دونیا نەویستی و دڵخۆشیان بەگەرانەوەی بۆ لای خوداو رزگار بوونیان لە دونیای کەم خایەن لەو فەرموودەیەدا بەدی دەکرێ . خوداش زاناو دانا ترە.

## هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی یەکەمین کەس لەخێزانەکانی کە پێ ی دەگەنەوە

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکەی خۆیاندا، لە عائیشەی کچی تەلحەو ئەویش لە خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران ریوایەت دەکەن کەدەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی (أسرعكن لحاقاً بي أطولكن يداً) واتە: (ئەوە ی لەپێش هەمووتان بەمن دەگاتەوە ئەو ژنەتانە کە لەهەمووتان دەستی درێژ ترە)،

عائیشە دەفەرمووێ : جا ئێمەی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەستەکانی خۆمان لەتەك یەك ڕاگرت تاکو بزانین دەستی کامەمان درێژ ترە!، دەڵێ : لە هەموومان دەست درێژ تر زەینەب بوو، چونکە ئەو بەدەستەکانی کاری دەکرد خێرو سەدەقەی دەکرد.

ئیمامی نەواوی (رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ : مانای فەرموودەکە ئەوەیە کە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وایانزانیوە کەمەبەست لەدرێژی دەست درێژی راستەقینەیە، بۆیە ئەوان دەستەکانی خۆیان بەپارچەیەك دار دەپیوا، ئەوە بوو خاتوو (سەودە) دەستی لەهەمووان، درێژ بوو خاتوو(زەینەب) ادەستی لەسەدەقە کردن و کاری چاکە لەهەموان درێژتربوو، بۆیە ئەو یەکەمین کەسیان بوو کۆچی دوایی کرد، ئینجا زانیان کە مەبەست لەدرێژی دەست سەدەقەکردن و خێرو چاکە کردنە.

## پێشبرکێ کردن لەشاهیدی دان و سۆێند خواردنی بەدرۆ

ئیمامی بوخاری و موسلیم لەسەحیحەکەی خۆیاندا، لەعیمرانی کوڕی حوسەین دەگێرنەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ص) کە فەرموویەتی : (خيركم قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم يجيء قوم

ينذرون ولا يفون، ويخونون ولا يؤتمنون، ويشهدون ولا يستشهدون ويظهر فيهم السِّمن) .

واتە : (چاکترینتان ئەوانەن کە هاوسەردەمی منن، پاشان ئەوانەن کە لەدوای ئەوانەدێن، پاشان ئەوانەن کەلەدوای ئەوانە دێن، لەپاشان قەومێك دێن نەزر دەکەن و جێ بەجێ ی ناکەن و خیانەت دەکەن و ئەمانەت ناپارێزن، شاهیدی دەدەن و بەشاهید ناگیرێن و قەڵەوییان تێدا بەدەر دەکەوێ).

زانایان دەڵێن : مەبەست لەو گوتەی پێغەمبەر (ﷺ) : (خيركم قرني) وەلە ریواتێکی دیکەدا (خير الناس قرني ..هتد) زاناکان هاوڕان لەسەر ئەوەی کەچاکترین سەردەم سەردەمی پێغەمبە رە (ﷺ)، کە مەبەست لە (قرن) لێرەدا هاوەڵەکانیەتی، ئەوەی دووەم ئەوانەن کە لە دوای ئەوانە وە هاتوون کەبە (تابعين) ناسراون، سێیەمیان ئەوانەن کە بەچاکەوە لەدوای تابعینەوە هاتوون تا رۆژی قیامەت.

هەروەها گوتەی : (ويخونون ولا يؤتمنون) مانای ئەوەیە کە خیانەتێکی بەئاشکرا دەکەن بەشێوەیەکی ئەوتۆ کەهیچ ئەمانەتێکی تێدا نامێنێ، ئەو فەرموودەیە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی ئەوی تێدایە، موعجیزەیەکی ئاشکراو ڕوونی پێغەمبەریشە (ﷺ) کە هەرشتێکی باس کردبێ و هەواڵی رووداني دابێ، وەکو خۆی دێتە دی . خودای گەورەش زانا ترە.

## هەواڵ دان لەبارەی کوژرانی حوسەینەوە( خودا لێ ی رازی بێ )

ئیمامی ئەحمەدو ئیبنو حیبان لەسەحیحەکەیدا، لەئەنەسی کوری مالیکەوە ریوایەت دەکەن کە دەڵێ : فریشتەی باران روخسەتی لە پەروەردگار خواست کە سەردانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، خوداش روخسەتی پێدا، ئەو کاتە لە نۆرە رۆژی ئوممو سەلەمە بوو ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:(لەبەر دەرگاکە بوەستە رێگە بەهیچ کەسێك نەدەیت بێتە ژووری) جا لەکاتێکدا ئوموسەلەمە لە لای دەرگاکە وەستابوو حوسەینی کوری عەلی هات و توانی خۆی بگەیێنێتە دەرگاکە، خۆی خزاندە ژوورەوەو دەستی کرد بە هەڵگەران بە سەر پشتی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش کەوتە ماچ کردنی دەم و روومەتی حوسەین، لەو کاتە فریشتەکەش پێی گوت خۆشت دەوێت ؟ فەرمووی بەڵێ، گوتی : بەڵام لەدوارۆژدا ئوممەتەکەت دەیکوژن، ئەگەر دە تەوێت ئەو شوێنەشت پێ پیشان دەدەم کە تیا یدا ددکوژرێت ؟ فەرمووی : (بەڵێ) ئەوە بوو چنگێکی لەگڵی ئەو شوێنەدا کە ئەوی تێدا دەکوژرێت، ئینجا پێ ی پیشان دا کە بریتی بوو لە گڵێکی سۆر، جا ئوموسەلەمە ئەو چنگە گڵەی بردو لەناو

کراس ی خۆی هەڵیگرت، ثابت دەڵێ : ئێمە دەمانگوت : ئەوە کەربەلایە . کورە شیرینەکەم حوسەین بە ستەم لێکراوی و ئارامگری و چاوەڕێ ی پاداشت لەخوای گەورە وە کوژرا (عوبەیدوڵڵای کوری زیاد) کوشتی .

## هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی حەڵاڵ کردنی ئارەق و ژەنینی مۆسیقاوە لە پێش هاتنی قیامەت

ئیمامی بوخاری لەسەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (لیکونن في امتي اقوامٌ يستحلون الحرير والخمر والمعازف) واتە : (لە نێو ئوممەتەکەمدا چەند قەومێك پەیدا دەبن ئاوریشم و ئارەق و مۆسیقا ژەنین حەڵاڵ دەکەن).
بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستی فەرمووە لەبارەی ئەوەی هەواڵی لەبارەیەوە داوە کە لەو سەردەمەدا ڕوودەدات.

## هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی شانازی کردنی خەڵکان بەڕازاندنەوەی مزگەوتەکان

ئیبنو حیبان لەسەحیحەکەیداو نەسائی ، لەئەنەسی کوری مالیکەوە ڕیوایەتیان کردوە ، دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (لاتقوم الساعة حتى يتباهى الناس في المساجد) واتە : (قیامەت دانایێ هەتا خەڵکان لەناو مزگەوتەکاندا شانازی نەکەن).
گومانی تێدا نیە کەئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی لەبارەیەوە داوە هاتوتە جێ و ڕوویداوە . زانایان گوتویانە نەخشکاری و ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان مەکروهە و پەسەند نەکراوە ، کەمێك لە زنایان گوتویانە مەکروهـ نیە . چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سەرکۆنەی ئەم کارەی نەکردووە. بەڵام ئەو شانازی کردنەی کە باسکرا ئەوا سەرکۆنەکراوە ئەگەر لەجوانکاری مزگەوتیش نەبێ . کوری شیرینم بزانە مەرج نییە هەموو نیشانەیەکی هاتنی قیامەت سەرکۆنەکراو بێ .

# هەواڵدانی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەبارەی پەیدابوونی زیناو زۆربوونی بە ئاشکرا ئەنجام دانی ئەو کارە پێش هاتنی رۆژی دوایی

ئیبنو حیبان لەسەحیحەکەیدا لە عەبدوللای کوڕی عومەر دەیگێڕێتەوە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (لاتقوم الساعة حتى تتسافدوا في الطريق تسافد الحمير) قلت : إن ذاك الكائن ؟ قال: (نعم ليكونن) واتە : (قیامەت دانایێ هەتا خەڵکان لەرێگا دا و وەکو گوێ درێژ سواری یەکتر نەبن) منیش گوتم : ئایا ئەوە بەراستی روودەدات؟ فەرمووی (بەڵێ بێگومان ئەوە دێتە دی).

(يتسافد) جووت بوونی گیانلەبەران : واتە هەندێکیان دەچنە سەر پشتی هەندێکی دیکەیان، ئەمەش مانای زیناکردن و پەیوەندی ناشەرعی دەگەیەنێ، بەبێ ئەوەی ترسی خودایان هەبێ یاخود شەرم لەخەڵکی بکەن.

کورە شیرینەکەم ئەمەشیان بەهەمان شێوە لە وڵاتی موسوڵمانان هاتوتەجێ و دێتە جێ هەروەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی لەبارەیەوە پێداوین . ولاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم .

# هەواڵ دانی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەبارەی کەمبوونی ژمارەی پیاوان و زۆربوونی ژمارەی ئافرەتان لە پێش هاتنی قیامەت

ئیمامی بوخاری، موسلیم، لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ریوایەتیان کردووە کەرۆژێکیان گوتی: ئایا فەرموودەیەکەتان پێ بڵێم هیچ کەسێکی دیکە لەدوای من پێتانی نەڵێ، کە لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە گوێم لێ بووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو : (لاتقوم الساعة ، او من شرائط الساعة، ان يرفع العِلم، ويكثر الجهل، ويشرب الخمر، ويظهر الزنى، ويقل الرجال، وتكثر النساء، حتى يكون لخمسين امرأة قيمُ واحد) واتە : (قیامەت دانایێ یاخود لەنیشانەکانی رۆژی قیامەت ، زانست هەڵدەگیرێت و نەفامی زۆر دەبێ و ئارەق دەخورێتەوە و داوێن پیسی سەرهەڵدەدات و پیاوان کەم دەبنەوە و ژنان زۆر دەبن، هەتا وای لێ دێ پەنجا ژن یەك پیاو بنەوانیان دەکات).

گوتەی ئەنەسی کوڕی مالیك : (لايحدثكم احد بعدي انه سمعه من رسول الله (ﷺ)) واتە : ئەنەس

(خوا لیّ ی رازی بیّ) زانیویەتی لە و بترازیّ کەسێکی دیکە نەماوە گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بووبیّ . چونکە ئەو دواهەمین کەس بوو لە هاوەڵەکانی کەلەشاری بەسرە کۆچی دوایی کرد، گێرانەوەی ئەو فەرموودەیە ش لە کۆتایی تەمەنی دابوو، چونکە هیچ هاوەڵێك لە دوای ئەو نەمابۆوە کە سەحابی بیّ و گوێی لە پێغەمبەر بووبیّ.

(أن يرفع العلم) واتە بەمردنی زانایان زانست هەڵدەگیرێت . (ويفشوا الزّنا، ويشرب الخمر)بەمانای زۆربوون و بەدیارکەوتنی ئارەق خواردنەوە و زیناکردن دیّ . (وتكثر النساء) دەڵێن هۆکەی ئەوەیە کە فیتنە و ئاشوب زۆردەبیّ و لەئەنجامدا کوشتن لەناو پیاواندا زۆردەبیّ ، چونکە ئەوان ئەهلی جەنگن نەك ژنان، (ويقلُّ) واتا ژمارەیان کەم دەبێتەوە (قيم واحد) واتە پیاوێك کاروبارەکانیان جیّ بەجیّ دەکات .

## لافـــــاو



خـــــوای گـــــەورە دەفەرمووێ : ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْنَاهُمْ وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَاباً أَلِيماً﴾ (الفرقان: ٣٧).

**واتـــە : (قـــەومی نوحیش کاتێك بەرنامەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی ئەوسا ئێمە نوقمی زریانەکەمان کردن و کردمانن بە عیبرەت بۆ خەڵکی و سزایەکی بەئێشمان بۆ ستەمکاران ئامادەکردوە).**

بێگومان ئەو ئایەتە قورئانیانەی کە پێغەمبەر (ص) باسی کردوون بەشێوەیەکی زۆر وردکارانە ناوەرۆکی ئەو کەشتی یە بەدیار دەخات، ئەویش بەجیّ بەجیّ کردنی فەرمانی خوا لەلایەن پێغەمبەر

نوحەوە.

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿حَتَّى إِذَا جَاء أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ (هود:٤٠)

**واتە : (هەتا ئەو کاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو لەتەنوورە پڕ لە ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد ئەوسا وتمان : ئەی نوح لەهەموو نێرو مێ یەك دووان هەڵبگرە لەکەشتی یەکە داو ماڵ و خێزانت جگە لەوانەی کە بڕیاریان لەسەر دراوە تووشی تۆڵە بێن بەهۆی بێ باوەڕیانەوە ئەوانیش هەڵگرە کە باوەڕیان هێناوە . شایانی باسە ئەوانەی باوەڕیان بەنوح هێنابوو ژمارەیان کەم بوو.**

بێگومان چەند ئایەتێك لە سورەتی (هود) و چەند ئایەتێکیش لە سورەتی (المؤمنون) دا ڕووداوەکانی ئەو لافاوەیان لەخۆگرتووە لەنێوانیشیاندا (چیای جودی) کە لوتکەی شاخەکانی ئاراراتە لە کوردستانی خۆرهەڵاتی تورکیا .

ڕۆڵەی ئازیزم وا بەدیارکەوت کە ئەوەی قورئانی پیرۆز باسی کردووە بەتەواوەتی کۆکە لەگەڵ زانستە مێژوویەکان و دۆزینەوەی شوێنەوارییە تازەکان، وەجیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤەکان لە ساتەوەختی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز دەیانزانی.

وە بێگومان زانا (لیۆنارد) سەرۆکی ئەو نێردەیەی کە مۆزەخانەی بەریتانی و زانکۆی بەنسلڤانیای ئەمریکی لەساڵی (١٩٢٠ز) بەژدارییان تێدا کردبوو ئەو ڕاستییەی سەلماندو، هەروەها ئەو نێردەیە چەندچاڵێکیان لە (تل العبید) ی باکوری شاری (ئور) لە عیراق هەڵکەند. وە چەند چینێکی قووڵی قوڕی نیشتووی دۆزیەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە قاپ و قاچاغ و پەیکەری بەردینی تیادا نغرۆ ببوون، وە چەند بەشێکی قوڕەکە تا ئەوکاتەش و ئێستاش لەگەڵدابێ شوێنەواری چەقاندنی قامیشەکانی بەسەرەوە دیارە .

وە (لیۆناردۆ) پشتی بە بەڵگەی پشکنینی میکرۆسکۆبی بەستووە بۆ بڕێك لە قورە نیشتوودکە کەلە چەند مادەویەك پێکهاتووە کەوا شەپۆلی ئاو (بەیەکجار) لە ناوچەی ناوەڕاست لەگەڵ خۆیدا ڕایماڵیوە بۆ ناو ڕووباری فورات، ئەویش بەشێوەی لافاوێکی گەورە کە بەرزیەکەی لە بیست و پێنج پێ کەمتر نەبوود (وە لەتەوراتیش دا هاتووە کە بەرزی لافاوەکە گەیشتووتە (٢٦) پێ).

زانا (لیۆناردۆ) دەڵێ لافاوەکە گشت شوێنێکی دونیای نەگرتووتەوە، بەڵام ئەو لافاوە شەپۆلێکی

زۆر بەهێز بووە هاتووتە سەر دۆڵی دجلە و فوراتەوە، هەموو ئەو ناوچە هەڵكەوتووەی كەكەوتبووە نێوان چیاكان لە خۆرهەڵاتەوە و بانە بیابانەكان لەخۆرئاواوە داپۆشی ونغرۆی كرد. ئەوەش ناوچەیەك بوو كە لەو كاتی بۆ دانیشتوانی دونیا شوێنێكی گونجاو بوو.

بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەو دۆزینەوەیە كەوتووەو رووداوەكانی ئەو چیرۆكەی پێ راگەیاندوین كەئەمەی خوارەوە پوختەكەیەتی:خودای گەورە پێغەمبەر (نوحی) نارد (سەلامی خوای لێ بێ) بۆ قەومێك كە لەبری خودای پەروەردگار بتیان دەپەرست، خودا ئاراماگرتنی لەسەر موناقەشە و گفتوگۆ كردن و بەرچاو روونیشی لەهۆكارەكانی قەناعەت پێ هێنانی پێ بەخشی بوو، جائەو بەهەموو شارەزاییەكو داناییەك و ئامۆژگاریەكی چاكە بانگەوازی خەڵكەكەی كرد بۆ خوا، بەڵام ئەوان پشتیان هەڵكرد، پاشان ئەو موژدەی پاداشتێكی زۆری لەخواوە پێدان ئەگەر بێ و گوێرایەڵی بكەن. بەڵام ئەوان پەنجەكانیان ئاخنیە ناوگوێچكەكانیان و خۆیان بەزل زانی و لووت بەرز بوون . ئینجا كەوتە كۆشش كردن و خۆماندو كردن لەگەیاندنی پەیامەكەی خودا، ئەوە بوو بەشەو و بەرۆژ و بە نهێنی و بەئا شكرا بانگی خەڵكەكەی كرد، بەم شێوەیە لە خەباتكردن بە ردەوام بوو، بەڵگەو بەهانەكانی بۆیان دەهێنایەوە، هەتا نوسەدو پەنجا ساڵ ئاوا مایەوە لەناویان .

جا خۆشەویستەكانم بە درێژایی ئەو ماوەیە تەنیا خەڵكێكی كەم باوەڕیان پێی هێنا، وەڵامی بانگەوازەیەكەیان دایەوەو پەیامەكەیان بەراست زانی، بەڵام بەشی هەرە زۆریان خوای گەورە بەهۆی كارە خراپەكانیان مۆری لەدڵەكانیان داو باوەڕیان نەهێناو بروایان پێی نەكرد، ئەوانە لەپیاوەگەورەكان و خاوەن پلەو پایەكانی قەومەكەی بوون، لە هەركوێ پێ ی بگەیشتبانە گەمەو گاڵتەیان پێ دەكرد و پێی پێ دەكەنین و، پێیان دەگوت : تۆش وەكو ئێمە مرۆڤێكی و، یەكێكی لە ئێمە، ئەگەر خودا بیویستبایە پێغەمبەرێك بنێرێ ئەوە فریشتەیەكی دەنارد.

خۆشەویستەكان بەو شێوەیە قەومی نوح لە خۆیان بایی بوون و خۆیان بەزل زانی و بە گاڵتە كردن بە خۆی و ئەوانەی لە گەڵیدا ئیمانیان هێنابوو گوتیان : ئەی نوح، ئەگەر تۆ راست دەكەی رێنموونی و سەربەرزی و سەركەوتنی ئێمەت دەوێ، فەرموو برۆ لای ئەو بچووكانەی كە ئیمانیان بەتۆ هێناوە، لەخۆتیان دوور بخەوە، چونكە ئێمە ناتوانین لەسەر شێوازی ئەوان برۆین، یاخود هاو باوەڕی ئەوان بین، (نوح) یش پێی گوتن ئەوە بانگەوازێكی گشتیو سەرتاپا گیرە بۆ هەمووتان، كە تیایدا بەئاگاو بێ ئاگاتان و بەهێزو بێ هێزتان و دەوڵەمەند و هەژارتان و سەرۆك و خەڵكی ئاسایی یەكسانن ..

کاتێك مشت و مڕی نیوان نوح (سەلامی خوای لێ بێ) و قەومەکەی تاوی سەند، ئەوانەی کەوا لێ ی بێ تاقەت ببوون و دڵیان لە بانگەوازەکەی پەست ببوو، پێیان گوت : ئەی نوح بەراستی زۆر ئەسەری چوویت و زیاد لە پێویست بەرەبەرەکانی و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین، دەی ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کە هەڕەشەی پێدەکەیت و هەمیشە باسی دەکەیت و پێی دەمانترسێنی ؟

(نوح) یش وەڵامی دانەوە و فەرمووی : ئەی قەوم بەڕاستی ئێوە لە نەفامێتی دا زێدەڕۆیی دەکەن، خۆتان گێل دەکەن، من کێم هەتا سزاتان بۆ بنێرم، یاخود لێتانی قەدەغە بکەم ! دیارە من مرۆڤێکم وەکوو ئێوە نیگام بۆ دێ، کە تەنیا یەك پەرستراوی بەهەقتان هەیە، جا منیش ئەوەی فەرمانم پێ کراوە پێتان رادەگەیەنم، جارێك مـوژدەی پاداشتتان پێدەدەم و جارێکی دیکەش بەسزا دەتانترسێنم ! بزانن کە هەموو شتێك سەرچاوەکەی بۆ خودا دەگەڕێتەوە، ئەگەر بیەوێ هەمووتان هیدایەت دەدات، ئەگەر خواستیشی لەسەر بێ ئەوا سزای بەپەلەتان بۆ دەنێرێ، ئەگەر حەزیش بکات ئەوا مۆڵەتتان پێدەدات تاکو سزاتان زیاتر بێت .

رۆژان و ساڵان رۆیشتن و (نوح) یش بەوپەڕی لێپرسراوی و دڵسۆزی یەوە بانگەوازی بۆخودا دەکرد. چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد قەومەکەی بۆ لای ئایینی خودا بگەڕێنەوە، بەڵام ئازیزەکانم هەرکاتێك نەوەیەك دەڕۆیی و پاشان نەوەیەکی دیکە دەهات خەڵکەکەی لەوانەی پێش خۆیان نەگریس تربوون، هەتا لەبارەی (نوح) ەوە دەیانگوت : ئەو پیاوە شێتە، لەگەڵ باب.وباپیرانمان بانگی دەکردن بۆ عیبادەت کردنی خودا و وازهێنان لە بتەکان، ئەوان ئامۆژگاری و وەسیەتی ئێمەیان کردووە کە گوێ لەقسەکانی رانەگرین.

بەم جۆرە ئەو قەومە هیچ شتێکیان لێی وەرنەدەگرت .

کاتێك ئەمە لەگەڵ (نوح) درێژەی کێشا.. و دیتی منداڵەکان زۆر خراپتر بوون لە باوانیان، کەوتە موناجات لەگەڵ خودای گەورەو فەرمووی : پەروەردگار تۆ دەبینی چیم لێ دەکەن، من لەپێناو تۆدا گوێ ی پێنادەم کە چیم بەسەرهاتووە، بەڵام ئەوە هەیە کە هەرنەوەیەك دێن ئەوەی لەدوای ئەوانەوە دێن خراپترن : ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً * فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلَّا فِرَاراً * وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوا أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ وَاسْتَغْشَوْا ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا وَاسْتَكْبَرُوا اسْتِكْبَاراً﴾ (نوح ٥-٧):

**واتە : (پەروەردگارا من بەشەو بەرۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد * کەچی بانگەوازەکەی**

**من هیچی زیاد نەکردن، تەنیا ڕاکردنیان نەبێت ٭ بەڕاستی من هەموو جارێك کە بانگم دەکردن تالێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەیانەوە تانەبیستن، جلەکانیان بەسەرخۆیاندا دەدا تا نەمبینن، زۆر گەرم بوون لەسەر بێ باوەڕی و خۆیان بەزل دەزانی و لووت بەرز بوون).**

ئەوجا خودای گەورە نیگای بۆ نوح نارد : ﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلاَّ مَن قَدْ آمَنَ فَلاَ تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾ (هود : ٣٦)

**واتە : (چاك بزانە ئەی نوح بەڕاستی هەرگیز کەسی تر بڕوا ناهێنێت لە قەومەکەت جگە لەوەی بەراستی بڕوای هێناوە ، کەوابوو خەفەتبار مەبە بەو کردەوە ناشیرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا).**

ئەو کاتە نوح زانی خودای گەورە قسەی خۆی گەیاندۆتە جێ، نیگای خۆی جێ بەجێ کردووەو بەوەی هیچ کەسی دیکە لەدوای ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە ئیمان ناهێنن، کە ئەوانیش بەپەنجەی دەست دەژمێردران، وە ئەوانی دیکە مۆریان لەدڵ دراوە ، نوح ئارامی لەبەربڕاو لەو کاتە فەرمووی : ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً ٭ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِراً كَفَّاراً﴾ (نوح : ٢٦-٢٧)

**واتە : (پەروەردگارا هیچ کەسێك لەبێ بڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵەو تۆویان ببڕە ٭ چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومرای دەکەن و کەسیشیان لێ نابێت مەگەر خراپەکار و تاونبار نەبێت) .**

دوای ئەوەی (نوح) داوای یارمەتی و سەرکەوتنی لەپەروەردگاری خۆی کرد، خودای گەورە نیگای بۆ کرد: ﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلاَ تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ﴾ (هود:٣٧).

**واتە : (کەشتیەکە دروست بکە بەچاوەدێری و فەرمانی ئێمە، تکامان لێنەکەیت بۆ ئەوانەی لەسنووری ڕاستی دەرچوون و تاوانبارن، چونکە بەڕاستی ئەوانە بڕیاری خنکاندن و تیاچوونیان بۆ دراوە) .**

جا (نوح) دەستی بە دروست کردنی کەشتیەکە کرد، شوێنێکی دوور لە شارەکەی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژارد، هەروەها پارچە دارو بزماری ئامادەکرد، زۆر بەگەرم و گوڕی و چالاکییەوە دەستی بەکارەکەی کرد کەفەرمانی خودای گەورەی جێ بەجێ دەکرد، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەگەمەو کاڵتەجاڕی قەومەکەی بەخۆی و بانگەوازەکەی دەرباز نەبوو، جا هەندێکیان بەلای دا تێدەپەڕین و

پێیان دەگوت : ئەی نوح تۆ دوێنێ بانگەشەت دەكرد كە پێغەمبەرو نێردراوی ، ئەدی چۆنە ئەمڕۆ بوویتە دارتاش ، ئایا وازت لە پێغەمبەرایەتی هێنا، ئارەزووی دارتاشیت كردووە !

بەڵام نوح سەلامی خوای لێ بێ چووە لای كەشتیەكەو پارچەدارەكانی ڕێك خست و لەیەكی دەدان، هەتا بووە كەشتی یەكی مەزن و بەهێز، كە لەچەند پارچە دارێك و بزمارێك هاتبووە دروست كردن، هەروەها (نوح) سەلامی خوای لێ بێ كەشتی یەكەی كردبووە سێ نهۆم : خواردوە، ناوەند، سەرەوە .

لەدوای ئەوەی گەورەمان نوح سەلامی خوای لێ بێ لەدروست كردنی كەشتی یەكە بوویەوە، خودای گەورە نیگای بۆ كرد: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ (هود:٤٠)

**واتە : (هەتا ئەو كاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو، لە تەنوورە پڕ ئاگرەكەوە ئاو فوارەی كرد، ئەوسا گوتمان ، ئەی (نوح)، لە هەموو نێرو مێ یەك دووان هەڵبگرە لە كەشتیەكە داو لەگەڵ ماڵ و خێزانت ، جگە لەوانەی كە بڕیاریان لەسەر دراوە تووشی تۆڵە ببن بەهۆی بێ باوەڕیانەوە، ئەوانەش هەڵگرە كە باوەڕیان هێناوە ، كەسیش بڕوای بە نوح نەكردو لەگەڵیدا نەبوو، جگە لە كەسانێكی كەم نەبێت)** . جا فوارەكردنی تەندوور نیشانەیەك بوو لە نێوان ئەوو خودای گەورەوە، كاتێك ئەو نیشانەیە بەدیاركەوت (نوح) بۆ لای كەشتی یەكە ڕۆیشت ، ئەوانەشی لەگەڵ خوێدابرد لە قەوم و خزم و كەسەكەی خۆی كە ئیمانیان پێی هێنا بوو، هەروەها لە هەموو جۆرە گیانلەبەرێكیش نێر و مێیەكی هەڵگرت، خۆیان ژمارەیان سێزدە كەس بوو ئەوانیش: گەورەمان نوح سەلامی خودای لێ بێ و هەرسێ كوڕەكەی سام و حام و یافث و خێزانەكانیان و شەش كەسی نزیش، وە یەكێ لە كوڕەكانی لێی بەجێ ما كە ناوی (یام) بوو دەشڵێن ناوی (كنعان) بوو كە كافر بوو، كاتێكیش (نوح) سەلامی خوای لێ بێ لە ناو كەشتیەكە دڵنیا بوو، لە هەموو سوچێكەوە ئاو شالاوی هێنا، ئەوە بوو باران لە ئاسمانەوە باری، زەویش ئاوی لێ هەڵقوڵا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ* وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُوناً فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ﴾ (القمر: ١١-١٢).

**واتە : (ئەوسا ئێمە دەروازەكانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێكی خوڕداكردەوە* هەموو زەویشمان كرد بە كانیاو و ئاومان لێ هەڵقوڵاند، ئیتر ئاوی ئاسمان و زەوی بە تەقدیر و ویستی خوا بەیەك گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەر درابوو).**

پاشان گوتیان : ﴿وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (هود:٤١).

**واتە : (.... بەناوی خواوەیە ڕۆیشتن و وەستانی ....)** ئەوەبوو کەشتیەکە جارێك بەناو هەوایەکی نارام و جارێکی دیکەش بەناو ڕەشەبایەکی توندا گوزەری دەکرد، شەپۆلەکانی تاویش گۆڕستانێکیان لەناو خۆیاندا بۆ کافرەکان دروست کرد، بەر بەرە کانێیان لەگەڵ مردن دەکرد، بەڵام مردن بەسەریان زاڵ دەبوو، هەروەها ململانێیان لەگەڵ شەپۆلەکان دەکرد، بەڵام شەپۆلەکان نغرۆی دەکردن، ئەوە بوو هەر هەموویان نقومی ژێر ئاوەکە بوون و فەوتان. خودای گەورەش نوح و هەڤاڵەکانی لە ئاوەکە دەرباز کرد.

## یارانی ئەشکەوت



خودای گەورە لە وەسفی یارانی ئەو کۆمەڵە گەنجەی ئەشکەوت کە بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ لە ناو ئەشکەوتە کە بەخەوتوویی مانەوە و(بەحیسابی مانگی) نۆ دانەساڵی دیکەشیان خستە سەر دەفەرمووێ : ﴿وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظاً وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ﴾ (الکهف:١٨)

**واتە : (وا دەزانیت بەخەبەرن لە کاتێکدا بەخەوتوویی ڕاکشاون، ئێمە ئەم دیوو ئەو دیویان پێدەکەین و بەلای ڕاست و چەپیان هەڵیان دەگێڕینەوە ....)**

بێگومان ئێستا زیاتر لە چواردە سەدە لەوەی کە لەبارەی یارانی ئەشکەوت لەقورئانی پیرۆز دا هاتووە تێپەڕیوە، هەتا هاتنی سەدەی خۆمان زانای شوێنەوار ناسی ئوردنی (رفیق وفا الدجانی) لەساڵی (١٩٦٣ز) لە ناوچەی (ڕەحیب) ی ئوردنی دا ئەو ئەشکەوتەی دۆزیەوە کە یارانی ئەشکەوت کردبوویانە مەزارگەی خۆیان کاتێك خۆیان و ئاین و ئیمانەکەیان لەبەر ستەم و لەسنوور دەرچوونی شا

(دیقیانوس) ڕایانکرد بوو، لەئەشکەوتەکەدا حەوت گۆر بەدیار کەوتن ، ئەوەش ئەو ژمارەیە کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە و لەنزیك دەروازەی ئەشکەوتەکەش کەللەسەری ئێسکی سەگێك (کەتەنیا بە شە مەلاشوی سەرەوە ماوە) دۆزرایەوە کە پاسەوانەکەیان بوو.

وەژمارەی یارانی ئەشکەوت حەوت کەس بوون کە یەکێکیان شوان بوو، هەشتەمیشیان سەگەکە بوو، سەگەکە لەسەر دەروازەی ئەشکەوتەکە ژێر خاك کرابوو لەو شوێنەی کە پاسەوانی دەکرد و لە گۆری هەشتەم نەشاردرابۆوە.

لێکۆڵینەوە لەسەر کون و کەلەبەرەکانی ئەو ئەشکەوتە کرا و بەتایبەتی ئەو شوێنەی کەتیشکی خۆری لێوە دەچووە ژووری، ئەوەبوو بەدیارکەوت دەروازەی باشوری ئەشکەوتەکە رووی لە باشووری خۆرئاوا بوو، جا ئەگەر کەسێك لە ژووری ئەشکەوتەکە دا لەکاتی خۆرهەڵاتن بوەستێ ئەوا تیشکی خۆر لە لای راستی ئەشکەوتەکە وەدەدات و بەهەموو هێزی خۆیەوە لەبەردەم کەسەکە تێپەر دەبێت کە خواروو سەرووی ئەشکەوتەکە ی رووناك دەکردەوە و بەدەری دەخست .

کاتێکیش خۆر دەچووە ناوەڕاستی ئاسمانەوە، ئەشکەوتەکە هیچ تیشکێکی خۆری لێوە نەدەچووە ژوورەوە، ئەگەر بۆ لای خۆر ئاوابوون لار ببایەوە بەشێك لە تیشکەکەی لە سوچێکی نێو ئەشکەوتەکەی دەدا.

وەسفی دۆزەرەوەی ئەشکەوتەکە ئەو وەسفە وردەیە کە لەقورئانی پیرۆز دا هاتووە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيّاً مُّرْشِداً﴾ (الكهف :١٧)

واته : (کاتێکیش کە خۆر هەڵدێت، تیشکەکەی دەبینیت لە لای راستی ئەشکەوتەکەوە دەدات و تێپەردەبێت، کاتێکیش کە ئاوادەبێت لەلای چەپی دەدات و تیشکەکەیان بەسەردا تێپەردەبێت، لەو کاتەدا ئەو لاوانە لە ناو بۆشایی فراوانی ئەشکەوتەکە دا راکشاون، ئەوە هەمووی بەڵگەو نیشانەیەکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا، ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەر ئەو هیدایەت دراوە و رێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕا بکات، ئەوە هەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و رێنموویی بکات).

# فیرعەون و موسا



كوری شیرینم بزانە ئایەتە قورئانیەكان چواردە سەدەیە باسی چوونە دەرەوەی موسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە ولاتی میسر و پەرینەوەی لەگەڵ قەومەكەی لە دەریاكە دەكات كە لە دەستی فیرعەون و سوپاكەی كە ئاوی دەریاكە خنكاندنی رایانكردبوو لە ناویشیاندا لاشەی فیرعەون بە پارێزراوی مایەوە، تاكو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ نەوەكانی داهاتوو: ﴿آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ* فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ (یونس : ٩١-٩٢)

**واتە : (ئەوسا پێی وترا) ئایا ئێستە (باوەڕ دەهێنیت !) لەكاتێكدا بەڕاستی پێشتر یاخی بوویت و لەریزی ئەوانە بوویت كە تۆوی خراپەیان دەچاند ؟! ئەمرۆ ئیتر لاشەی تۆ رزگار دەكەین، تاببێتە موعجیزە و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن، بەلاّم بەڕاستی زۆربەی خەڵكی لە ئایەت و موعجیزەكانی ئێمە غافل و بێئاگان).**

لە ساڵی (١٨٩٨ ز) و لە شاری (طيبة) ی دۆڵی (الملوك) لە ولاتی میسر، زانا (لورت) لاشەی مۆمیا كراوی فیرعەونی (منبتاحی كوری رمسیسی دووەم) دۆزیەوە و لەكتێبەكەی خۆیدا لەساڵی ١٩١٢ز وەسفی دەكا.

ئەمرۆ لاشەی فیرعەون لەهۆڵی مۆمیاكانی پادشایەتی لە مۆزەخانەی میسری لەشاری قاهیرە پارێزراوە، گەشتیاران دەتوانن سەردانی بكەن.

ئیعجازی ئایەتە دیاریكراوەكانی قورئان ئەوە بەدیاردەخات كە لە سەردەمی دابەزینی قورئان لاشەی فیرعەون لەنێوانیشیاندا لاشەی (منبتاح) لە گۆرستانی (وادي الملوك) ی شاری (طيبة)

كەوتبووە لای خۆرئاوای رووباری نیل لەبەردەم شاری (الاقصر) ی ئێستا شاردرایەوە . لەو سەردەمەداو بەدرێژایی چواردە سەدە هەموو شتێك دەربارەی ئەو باسە نەنزانرا بوو، ئەو لاشانەش نەدۆزرانەوە تەنیا لەسەرەتای سەدەی ئێستاماندا نەبێت، ئەویش لەسەردەستی زانایەكی ئینگلیزی بوو.

بێگومان توێژینەوەكە ئەنجامەكانی ئەو دۆزینەوانەی لە مۆزەخانەی میسری بەدیارخست، كە لەم دواییەدا پشكنینەكان رایگەیاند كەوا ئەو لیژنە زانستیەی جیهانیی تایبەتمەندی میسری و ئەورووپی و ئەمریكایی ئەنجامیاندا دەڵێت : سەرجەم لاشەی پاشافیرعەونی یەكان خەریكە شوێنەواری شیی بوونەوەیان بەهۆی كاریگەری جۆرگەلێكی ناوازەی بەكتریا بەسەردا بەدیار دەكەوێت، (تەنیا لاشەی فیرعەون (منبتاح)) فیرعەونی موسا نەبێت!.

# سەركەوتنی ڕوم بەسەر فارسدا

خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿غُلِبَتِ الرُّومُ* فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ* فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ﴾ (الروم :٢-٤)

**واتە (ڕۆمەكان تێكشكێنران* لەنزكترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایندەدا ڕۆمەكان دوای شكستیان سەردەكەونەوە * لەچەند ساڵێكدا هەموو كارو فەرمانێك تەنیا بەدەست خوایە لەوەوپێش و لەوەو دواش، جا ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ وشاد دەبن).**

كوری شیرینم پوختەی ئەو ڕووداوەش بەو شێوەیەیە، جەنگێك لەنێوان فارسەكان و ڕۆمەكان ڕوویدا، فارسەكان لەم جەنگەدا سەركەوتنێكی مەزنیان بەسەرۆكایەتی (سابور) بەسەر ڕۆمەكان بەدەست هێناو زەوییەكانیان بۆ خۆیان حەلاڵ كردن و لە (قوستەنتینیە) گەمارۆیان دان، ئاشكریە فارسەكان خۆر و ئاگر دەپەرستن ، ڕۆمەكانیش ئەهلی كیتابن ، جا شتێكی چاوەڕوانكراویش بوو كەوا موسڵمانەكان مەیلیان بەلای سەركەوتنی ڕۆمەكان بوو، موشریكەكانی مەككەش لەگەڵ سەركەوتنی فارسەكان بوون، كاتێكیش هەواڵی گەمارۆدانی ڕۆمەكان لەلایەن فارسەكانەوە گەیشتە دوورگەی عەرەبی، خەڵكی مەككە بەدڵ تەنگ بوونی موسڵمانەكان كەیف خۆش بوون، گوتیان براكانمان زاڵ بوون بەسەر براكانتان، بەمەش موسڵمانەكان زۆر قەڵس بوون و ئەو ئایەتانە دابەزین.. ئەو چەند ساڵە تێنەپەڕی كە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێكردبوو هەتا چەرخی سەركەوتن لەفارسەكانەوە گۆڕا، بوو،

بەشی رۆمەکان، بەمەش گوتەی قورئان ڕاست دەرچوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لەو کاتەی کەوا قورئان باسی لەو هەواڵە پێش بینیە کرد، نیشانەی هاتنە جێ ی ئەو پێش بینیە یەکجار دوور بوو، چونکە ئەو دوانزە ساڵەی یەکەمی فەرمانڕەوایەتیەکەی (هرقل) هەواڵی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕادەگەیاند..

ئەو چەند ئایەتە زیاتر لە ئیعجازێك لە خۆیان دەگرن:

یەکەم: لە شوێندا (أدنى الأرض) واتە جەنگەکە لەنزمترین زەوی ڕوودەدات کە جەنگی (مجدو) بوو، ئەمەش بەڕاستی ڕوویدا، لە نزمترین خاڵ لەسەر ڕووی زەوی لە ڕۆخی دەریایی مردوو.

دووەم : لەکاتدا (بضع سنين) ماوەکە دیاری کراوە ، (بضع) واتە کەمتر لە دەساڵ، جا سەرکەوتنەکەش دوای نزیکەی نۆ ساڵ ڕوویدا.

سێیەم : هاوکات بوونی سەرکەوتنی ڕۆمەکان لە گەڵ سەرکەوتنی موسڵمانەکان بەسەر موشریکەکاندا، ئەمەش ئاوابوو هەروەکو چۆن پێغەمبەری ڕاست گۆ هەواڵی لەبارەیەوە دابوو. خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ٣-٤)

**واتە : (قسەو گوفتاریشی لە هەواو هەوەسەوە نیە ۞ ئەمەی کە ڕای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خودایە).**

ئاخۆ لە خۆتان ناروانن خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ* وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ (الذاريات : ٢٠-٢١)

**واتە : (بێگومان لەسەر گۆی زەویدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ كەسانێك كەبەشوێن دڵنیایی دا دەگەڕێن* هەروەها لەخودی خۆشتاندا، ئایا ئەوە بۆ لەخۆتان ناروانن و بیناییتان ناخەنەكار).**

**هەروەها دەفەرمووێت :﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت : ٥٣)**

**واتە : (ئێمە لە ئاییندەدا بەڵگەو نیشانەی سەرسورهێنەریان نیشان دەدەین لەئاسۆكانی بوونەوەردا و لە خودی خۆیشیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاك بۆیان روون بێت و دڵنیا بن كە ئەو زاتە هەق و ڕاست و ڕەوایە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە كە بێگومان ئاگاو زانایە بەهەموو شتێك ؟!) .**

ئەم ئایەتانە، مرۆڤیان ئاراستە كردووە بەردو ئەو بەڵگەو نیشانە ئاشكرایانەی كە لە دروست بوونی دا هەیە، كەوا هەرگیز كۆتاییان نایەت.

هەروەك چۆن موژدە دەدات خوای گەورە لەدوارۆژدا بۆ خەڵكان دیارو ئاشكرا یان دەكات، تاكو بۆیان روون ببێتەوە خوا هەقە. كەوا بوو ئەی كورە شیرینەكەم، با هەوڵبدەین ئەم مرۆڤە بناسین، ئەو بەدیهێنراوە سەیرو سەمەرە و ئاڵۆزە.. یا لەژێر سێبەری ئایەتە قورئانیەكان بژین كە مرۆڤی دانا واق ورِماو دەكەن:

* لە گەدەدا (٣٥) ملیۆن رژێنی پێكهاتە ئاڵۆز بۆ دەردانی ماددەكان بەدی دەكرێن. بەڵام خانەكانی ناوپۆشی گەدە كە ترشی كلۆری ناو دەردەدەن، بە ملیار خانە مەزندە دەكرێن.

* لە نێو (دوانزە گرێ) دا لەهەر(١سم) چوارگۆشە دا (٣٦٠٠) مەمیلە بۆ مژینی خۆراكی هەرس كراو بەدی دەكرێت.

* لە ناو ریخۆڵە باریكە دا (٢٥٠٠) مەمیلە هەیە هەر چەندە درێژی ریخۆڵەكە لەناو لەشی مرۆڤدا هەشت مەترە.

* لە روو پۆشی دەمدا (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار خانە هەیە، كە دەست بەجێ قەرەبوو دەبێتەوە ئەمەش لەهەموو پێنج دەقیقەیەكدا.

* لە زماندا (٩٠٠٠) خانەی تام كردن هەیە بۆ جیاكردنەوەی تامەی شیرینی و ترشی و تاڵی و سوێری.

* ئەگەر خڕوكە سوورەكانی ناو یەك لاشە لەریزێكدا لەتەنیشت یەكترمان دانان، ئەوا (٥-٦) جاران بەدەوری ئەو گۆی زەویەدا دەسوڕێنەوە كە ئێمەی لەسەر دەژین، بەڵام رووبەرەكەی بە (٣٤٠٠) و ژمارەكەشیان لەهەر مللیمەترێكی سێ جا لە خوێندا بە (٥)ملیۆن خڕۆكەی سوور مەزندە دەكرێن.

* هەموو رۆژێك بە شێوەیەكی میانەیی هەر خڕۆكە سوورێك (١٥٠٠) جار سووڕی خوێنی دەروات، ك واتە: (١٢٥٠) كیلۆمەتر بەنێو دەمارەكانی لەشدا دەبرێت.

* دڵ : كە ترومپای ژیانەو لەكار ناكەوێت. ژمارەی لێدانەكانی لەخۆلەكێكدا (٦٠-٨٠) لێدانەو رۆژانە زیاتر لە (سەد هەزار) جار لێدەدات، كە لەمیانە یاندا پاڵ بە (٨٠٠٠) لیتر خوێنەوە دەنێت. هەروەها بەدرێژی ژیانی مرۆڤێكی مام ناوەندیش پاڵ بەنزیكەی (٥٦) ملیۆن گاڵۆن خوێنەوە دەنێت، ئایا هیچ ئامێرێكی دیكە دەتوانێت ئەم كارە قورسەو بۆ ئەو ماوە درێژە ئەنجام بدات بەبێ ئەوەی پێویستی بە چاككردنەوە هەبێ ؟ !

* لەژێر پێستدا (٥-١٥) ملیۆن رێكخەری پلەی گەرمی لە ش هەیە، ئەو رێكخەرەش بریتی یە لەو رژێنە دەمارییەی كە لەش رزگار دەكات لەپلەی گەرمی زیاد، ئەویش بەهۆی كرداری بەهەڵم بوون و نارەقە كردنەوە .

* لووت لەمرۆڤدا بۆ چەند بۆریەك دابەش دەبێت پاشان بۆ چەند بۆریچكەیەك، بەم شێوەیە هەتا دەگاتە لق گەڵێكی ورد لەسەر ئاستی سی یە چیكلدانۆچكەكان، كە ژمارەیان دەگاتە (٧٥٠) ملیۆن چیكڵدانۆچكە، هەر چیكڵدانۆچكەیەكیش بەبەرگێكی نەرم داپۆشراوە و چەند وردە دەمار بە دیوارەكە دەلكێت، بەم شێوەیە پاڵاوتنی خۆێن جێ بەجێ دەبێت ئەویش بە دەركێشانی گازی ($CO_2$)و بەخشینی گازی ئۆكسجینی پێویست بە لەش.

* هەموو رۆژێك مرۆڤ(٢٥) هەزار جار هەناسە دەدات، كە تیایاند (١٨٠) مەتر سێ جا لە هەوا هەڵدەمژێت، لەوەشدا (٦،٥) مەتر سێ جا گازی ئۆكسجینی بۆ خۆێن لێ وەردەگیرێت .

* لەمێشكدا (١٣) ملیار دەمارەخانە و (١٠٠) ملیار لینجە خانەی بەیەكەوەنوساو هەیە كە بەربەستێكی پتەو پێكدەهێنن بۆ پارێزگاری كردن لە و دەمارە خانانە لەكاریگەری هەر ماددەیەك. وەرمەكانیش بەتایبەت لەسە رحیسابی لینجە خانەكان گەشە دەكەن و وەكوو ئەوەی ئەو دەمارە خانانە

ڕێگەیان لە شێرپەنجە گرتبێ! .

* ئەگەر بێ و هەستەخانەكانی لەش لەیەك ریز دابنێین ئەوا درێژیەكەی دەگاتە چەند جار نەوەندەی ماوەی نێوان مانگ و زەوی.

* چاو : لەیەك چاودا نزیكەی (١٤٠) ملیۆن وەرگری روناكی هەستیار هەن، ناودەبرێن بە (قووچەكەكان و گۆچان) . ئەمەش یەكێكە لەو (دە) چینەی كە تۆڕی چاو پێكدەهێنن كە ئەستوریەكەی بە هەر(دە) چینەكەیەوە دەگاتە (٤،٠) ملیمەتر.

هەروەها لەچاودا نیو ملیۆن ریشاڵە دەمار دەردەچن كە وێنەكان بەشێوەی وردو ڕەنگاو ڕەنگ دەگوازنەوە كە تازەترین كامیرا لە بەردەمی دا دەستە وەستان دەبێت.!

* گوێ : لە ئەندامی (كۆرتی) كە تۆری گوێ دەگرێتەوە، (٣٠٠٠) خانەی بیستن بەدی دەكرێن بۆ گواستنەوەی هەموو جۆرە دەنگەكان بە جیاوازی لەرینەوە و توندیان بە شێوەیەكی زۆر هەستیارانە.

لەناو گوێی ناوەوە بەشێك هەیە كە ناو دەبرێت بە ((وێل بوون)) ((التیە)) چونكە بابای لێكۆڵەر خەریكە وێڵ و سەرگەردان دەبێت، لە بەر ئەو شێوە داڵانە تەسك و ڕێڕەوو چاڵایی و ژوورو لولەو پەیوەندی كردن و تۆری رێكخستن و ئەو پەیوەندیانەی لەناو ئەو بەشە دا هەن.

* لەناو خوێنێكی تەواو (٢٥) ملیۆن خرۆكەی سوور بۆ گواستنەوەی ئۆكسجین هەن، (٢٥) ملیار خرۆكەی سپی هەن بۆ بەرەنگار بوونەوەی میكرۆبەكان و بەرگری لەش، ملیار پەرەی خوێن هەن بۆ ڕێگرتن لەخوێن بەربوون ئەویش بەكرداری مەیین لەهەر دەمارێك كە خوێنی لێ بەربێ، ئەو خانانە بەشێوەیەكی بنەرەتی لە مۆخە ئێسك دروست دەبن كە لەیەك چركەدا دوو ملیۆنو نیو خرۆكەی سوورو پێنج ملیۆن پەرەی خوێنو سەدو بیست خرۆكەی سپی دەرژێتە ناو خوێنەوە، ئەمەش گرنگی ئێسك پیشان دەدات لە پەیداكردنی توخمەكانی خوێن، ئەو كردارە لەلای مرۆڤە بە تەمەنەكان دێتە خوارەوە و كەم دەبێتەوە ، ئینجا بالێرە دا ئەو ئایەتە قورئانیە باس بكەین كە باس لە بەساڵا چوون دەكات:

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً﴾ (مريم :٤)

**واتە : (گوتی ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من دەستەكانم لاواز بوون و قژی سەرم هەرهەمووی سپێتی دایگرتووە، بەڵام من هەرگیز لەدوعاو پارانەوەم لە زاتی تۆ نا ئومێد نەبووم و دەستت نەناوە بەڕووم).**

* لە ناو لەشدا یەك ملیۆن یەكەی فەرمان بۆ پاڵاوتنی خوێن هەن كە ناو دەبرێن بە (نەفرۆنات)،

ـە مـاوەی (٢٤) كاتـژمێر دا (١٨٠٠) لـیتر خـوێن بـۆ هەردووگورچـیلە دێـن، (١٨٠) لـیتری لێ دەپاڵێورێت و، پاشان زۆرینەی خوێنەكە دووبارە لەناو بۆریەكانی گورچیلەوە دەمژرێت و تـەنیا (٠،١) لیتر لێ ی دەردەدرێتە دەرەوە كە ئەویش بە میز ناسراوە.

درێژی بۆریەكانی (نەفرۆنات) دەگاتە نزیكەی (٥٠) كیلۆمەتر . ﴿صُـنْعَ اللَّـهِ الَّـذِي أَتْقَـنَ كُـلَّ شَيْءٍ﴾ (النمل :٨٨)

**واتە : (ئەمە یە دەستكردی ئەو خودایەی كە هەموو شتێكی بەوپەڕی ڕێك و پێكی دروست كردوە.....).**

ئەگەر بمانەوێت بەدوای وردەكاریـەكان و سەرسـوڕهێنەرەكانی لەشـی مرۆڤـدا بگـەڕێین و هـەوڵی ناسینیان بدەین ئەوا لە ئەنجامی سەرسام بوون و واق وڕماندا تووشی ژانە سەر دەبین...!

﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ (ال عمران: ١٩١)

**واتە: (پەروەردگار تۆ ئەو هەموو دروستكراوانەت بەبێ هوودەو دروسـت نـەكردووە. پـاكی و بێگەردی شایستەی تۆیە، دەتۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ).**

## كۆرپەلەو پێگەیشتنی مرۆڤ



خـودای گـەورە لەسـورەتی ((الانـسان)) دادەفەرمووێت : ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِـن نُّطْفَـةٍ أَمْـشَاجٍ نَّبْتَلِيـهِ فَجَعَلْنَـاهُ سَـمِيعاً بَـصِيراً﴾ (الانسان:٢)

**واتە : (بێگومـان ئێمە مرۆڤمـان دروسـت كرد لە تێكەڵەیـەك لـە كاتێكـدا دەمانـەوێت تـاقی بكەینـەوە، هەربۆیـە دەزگـای بیـستن و بینینمان پێ بەخشی)**

ڕاڤەكارانی قورئانی پیرۆز هەموویان هـاوڕان لەسەر ئەوەی كە (الامشاج) واتـە تێكەڵـە، ئـەو تێكەڵەیەش بریتی یە لە تێكەڵاو بوونی ئاوی پیاو

بە بەناوی ئافرەتەوە

فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ، کە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆیدا لە عەبدوللاوە دەگێرێتەوە (خوا لیّ ی رازی بیّ) کەدەڵیّ : جولەکەیەك بەلای پێغەمبەر خوا (ﷺ) رەت بوو کە لەو کاتە دا وتووێژی لەگەڵ هاوەڵەکانی دەکرد، قورەیش گوتیان: ئەی جوولەکە ئەو پیاوە دەڵیّ من پێغەمبەرم، ئەویش گوتی ئێستا من لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لیّ دەکەم کە تەنیا پێغەمبەران دەیزانن. دەڵیّ : بابای جوولەکە هات و لەویّ دانیشت پاشان گوتی: ئەی موحەمەد مرۆڤ لەچی دروست دەبێت؟ فەرمووی : (ئەی جوولەکە مرۆڤ لە هەردوو ئاوی پیاوو ئافرەت دروست دەبیّ، بەڵام ئاوی پیاو تیرەو ئێسك و دەماری لیّ دروست دەبێت ، بەڵام ئاوی ژن روونەو گۆشت و خوێنی لیّ دروست دەبێت) لەو کاتە جوولەکەکە هەستاوگوتی: پێغەمبەرانی پێش تۆش هەر بەو شێوەیان دەگوت. (رواه ئەحمەد)

کورە شیرینەکەم لە و دێرانەی داهاتوو دا باسی قۆناغ بەندی کۆرپەلە دەکەین، هەروەکو چۆن قورئانی پیرۆز باسی کردووەو روونی کردۆتەوە، هەروەها تیشکێك دەخەینە سەر راستە زانستی یە چەسپاوەکانی هەر قۆناغێك و بەکورتی لیّی دەدوێین:

## نوتفە ( سپێرم )




سپێرم لەناوجووتە گون دروست دەبێت، هەروەك چۆن زانستی کۆرپەلە ناسی چەسپاندویەتی ئەو سپێرمە لە چەند خانەیەك پێکدێت کە دەکەوێتە خوارەوەی هەردوو گورچیلە لەپشتی پیاودا مەنی پیاو بەشێوەیەکی سەرەکی زیندەوەرە مەنەویەکان لەشێوەی نوتفە دەگرێتە خۆی کە پێویستە دەربەریوو بزاو، بیّ تاکو کرداری پیتێن روودات، لەگەڵ

نەوەی بەسەدان ملیۆن (٥٠٠-٦٠٠ملیۆن) لەو سپێرمانە لەرێگەی زێی ئافرەتەوە دەچنە ژوورەوە بەرەو ملی منداڵدان رێ دەگرنە بەر، بەڵام تەنیا یەك نوتفەیان لەگەڵ هێلکۆکەدا جووت دەبێ کە رێگەیەکی یەکجار دوورو درێژی بڕیوە تاکو بگاتە شوێنی پیتاندن لە کەناڵی (فالوبی منداڵ دان) کە هێلکەدان بە منداڵ دانەوە دەبەستێتەوە.

کاتێك نوتفەی پیاو لەگەڵ هێلکۆکەی ئافرەتدا بەیەك گەیشتن ، ئەو ا هێلکۆکە کە دەپیتێ و لەپاشاندا دەبێ بە کۆرپەلە، جا ئەم کۆرپەلەیە نێر بێ یان مێ، کەوا بێ ئەوەی رەگەزی کۆرپەلە دیاری دەکات نوتفەکەیە نەوەك هێلکۆکە!.

لەدوای نزیکەی (٥) کاتژمێر کە بەسەر هێلکە پیتێنراوەکە دا تێپەردەبێت، سیفەتە بۆ ماوەیەکانی تێدا دادەنرێت کە لەپاشاندا دەبێتە سیفەتی دروستکراوە تازەکە.

دوا بەدوای ئەمە ، هێلکۆکە پیتراوەکە زۆر بەخێرایی دەست بە دابەش بوون دەکات ، بەبێ ئەوەی گۆرانکاری بەسەر قەبارەی دابێ کە لە کەناڵی فالوبدا (کە بازنەی پەیوەندیە لەنێوان هێلکەدان و منداڵدان) دەجوولێ بەرەو منداڵدان، کە تیایدا دەچینرێت وەکوو چۆن تۆو لە زەویدا دەچینرێت. منداڵدانیش شوێنی گەشو نماکردنی کۆرپەلەیە بەر لەوەی ببێتە منداڵێکی تەواو و لەدایکی ببێ .

* هەروەها کۆرپەلە لەنێو منداڵدان بەچەند پەردەیەکی جیاواز دەورە دراوە کە شلەی (ئەمینۆ سی) بەرهەم دەهێنن کە کۆرپەلەکەی تێدا مەلە دەکات و لە کاریگەریەکانی دەرەکی دەیپارێزێت.

* قوناغی پیتاندن و گەیشتنی هێلکۆکە پیتێنراوەکە بۆ منداڵدان، نزیکەی (٦) رۆژ بەردەوام دەبێ و هەروەها چاندن و گەشەکردنیشی لەناو دیواری منداڵدانەکە هەتا رۆژی (١٥) پازدەهەم بەردەوام دەبێت کەلەوێوە قۆناغی سەرەمێکوتە (العلقة) دەست پێدەکات .



## سەرە مێکوتە ( العلقة )

قۆناغی سەرەمێکوتە لە رۆژی پازدەهەم دەست پێدەکات و لەرۆژی بیست و سێهەم یا بیست وچوارەم کۆتایی دێت کە بە شێوە یەکی پلە بەندی بەرەو تەواو بوون دەچێ، هەتا کۆرپەلە لەسەر شێوەی سەرەمێکوتەیەك خۆی دەنوێنێ کە لە ناو ئاودا دەژی

. وەکوو لە وێنە کە بەدیار دەکەوێت . وە ئەو سەرە مێکوتەیە بە هۆی د پەتی ناوکەوە خۆی بەدیواری منداڵدانەوە هەڵدەواسێ و خوێن لە نێو دەمار لەسەر شێوەی دوورگە داخراوەکان دروست دەبن کە وا لە خوێنەکە دەکات لەنێو دەمار نەجوولێ کە دیمەنی خوێنێکی مەییوی پێ دەدات .

شایە نی باسە لێرەدا شریتی یەکەم سەرەتا شتەکە لەنێو کۆرپەلەدا لە رۆژی (١٤ یان ١٥) دروست دەبێت، پاشان گرێی یەکەمینی تێدا بەدەردەکەوێت،

کورە شیرینەکەم لەم شریتەدا خانەکانی دایك و سەرچاوەکانی شانە سەرەکی یەکانی لێ پێك دێت کە لەپاشاندا ئەندامەکان و شانە جیاوازەکانی لێ دروست دەبێت، هەروەکو لە وێنەکە دەیبینی.

لەکۆتایی هەفتەی (٣) سێ یەمدا شریتی یەکەمین دەچێتەوە یەك و بچووك دەبێتەوە ئەوەی لێی دەمێنێتەوە دەچێتە شوێنێکی دژوار لەکۆتایی کلکی بڕبڕەی پشت واتە کلێنجە دا کە لەسەر پاشماوەی خانەکانی دایك لەو ناوچەیەدا دەمێنێتەوە..

## گۆشتپارە



کۆرپەلە لەقۆناغی سەرەمێکوتەوە دەگۆرێت بۆ سەرەتای قۆناغی گۆشتپارە هەر لە رۆژی (٢٤) هەتا رۆژی (٢٦) کە ئەگەر بەروارد بکرێت لەگەڵ ماوەی گۆرینی نوتفە بۆ سەرەمێکوتە ئەوا ماوەیەکی کورت خایەنە.

ئەو قۆناغە بە دەرکەوتنی بارستەیەکی لاشەیی کۆرپەلە بەدیار دەکەون.

لەرۆژی (بیست و هەشتەم) دا کۆرپەلە کە چەندین لەتی لێ دروست دەبێ کە چاڵاکی تیایاندا بەدیار دەکەوێت، شێوەی کۆرپەلەکە وەکو بنیشتێکی جواوی لێدەکات، کۆرپەلەکە لەماوەی ئەو قۆناغەدا دسورێت و هەلگێڕ و

وەرگیر دەبێت كە بەكۆتایی هاتنی هەفتەی شەشەمین كۆتایی بەو قۆناغە دێت .

كوڕی شیرینم بزانە كە قۆناغی گۆشتپارە بە قۆناغێك دەست پێدەكات كە بە گەشەكردن و زێدە بوونی قەبارەی خانەكان بەژمارەیەكی زۆر جیادەكرێتەوە- واتە گۆشتپارە كە وەكو پارچە گۆشتێكی لێدێت كە پێكهاتەیەكی جیاوازی نییە - لەدوای چەند ڕۆژێكی كەم قۆناغی دووەم دەست پێدەكات ، ئەویش قۆناغی دروست بوون (التخلق) ە بەوەی دەركەوتنی هەندێ ئەندام دەست پێ دەكات ، وەكو چاودو زمان (لەهەفتەی چوارەم) داو لێوەكان (لەهەفتەی پێنجەم) دا ، بەڵام بەتەواوی بەدیار ناكەوێت تەنیا لە هەفتەی هەشتەم نەبێت. هەروەها لەو قۆناغە دا پەلەكان وەكوو(دوو دەست و دوو پێیەكان) بەدیار دەكەون.

ئەو ریز بەندیەش هاورێكە لەگەڵ ئەوەی كە لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە : ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ (المؤمنون:١٤).

**واتە : (پاشان سەرمێكوتە كەمان كردوە بە گۆشت پارەیەك)**

كورە شیرینەكەم بزانە لەسیفەتەكانی گۆشتپارە ئەوەیە كە درێژ دەبێتەوە و لەكاتی جویندا شێوەی دەگۆرێت ئەوەش بەتەواوی لەسەر كۆرپەلەكەدا جێ بەجێ دەبێت لە و قۆناغە دا.

هەروەها وەكو باسمان كرد گۆشتپارەش پێش دروست بوون و پێكهاتنی ئەندامەكان قۆناغێكی هەیەو قۆناغێكی دیكەشی لەدوای دروست بوونی ئەندامەكان هەیە، هەروەكو چۆن قورئانی پیرۆز رایگەیاندوە : ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ (الحج :٥)

**واتە: (ئەی خەڵكینە ئەگەر ئێوە گومانتان لەزیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن ئێمە سەرەتا ئێوەمان لەخاك و خۆڵ دروست كردووە ، لەوەو دوا لە نوتفەیەك پاشان نوتفەش دەبێتە خۆهەڵواسەرێك (سەرەمێكوتەیەك) لەناومنداڵداندا لەوەو دوا دەبێتە گۆشتپارەیەكی تەواو و سەروسیمادار یان ناتەواو تا بۆتان روونبكەینەوە ئێمە ئاوا ئێوەمان دروست كردووەو دووبارە دورستكردنەوەشتان لامان ئاسانە، ئەوەش بمانەوێت لە منداڵدانەكاندا جێگیری دەكەین تاكاتی دیاریكراو)** كەواتە گۆشتپارە دوو قۆناغی هەیە:

(المضغة غير المخلقة) واتە : گۆشتپارەی ناتەواوو (المضغة المخلقة) واتە : گۆشتپارەی تەواو. ئەو

دوو قۆناغە بەهەردوو لایەوە لە (هەفتەی شەشەم) دا واتە (دوای ٤٠ ڕۆژان) کۆتایی دێت. ئیمامی بۆخاری و موسلم لەسەحیحەکەی خۆیانداو لە عەبدوڵڵاوە دەگێڕنەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) قسەی بۆ کردین کە ڕاست گۆو باوەڕپێکراوە: (ان احدکم یجمع خلقه في بطن امه اربعین یوماً، ثم یکون في ذلك علقة مثل ذلك، ثم یکون في ذلك مضغة مثل ذلك، ثم یرسل الملك فینفخ فیه الروح ویؤمر بأربع کلمات یکتب رزقه وأجله وعمله وشقي أو سعید، فوالذي لا أله غیره أن احدکم لیعمل بعمل اهل الجنة حتی مایکون بینه وبینها الا ذراع، فیسبق علیه الکتاب فیعمل بعمل أهل النار فیدخلها، وإن احدکم یعمل بعمل أهل النار حتی مایکون بینه وبینها الا ذراع فیسبق علیه الکتاب فیعمل بعمل اهل الجنة فیدخلها) واتە: (بێگومان هەریەك لەئێوە ئەو ماددەیەی کە لێ ی دروست دەبێ واتە نوتفەی پیاو و ژن، بۆ ماوەی چل ڕۆژان وەکو خۆی لەنێو منداڵدانی دایکی دا دەمێنێتەوە، پاشان دەبێتە خۆ هەڵواسەرێك (سەرەمێکوتەیەك) چل ڕۆژی دیکە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت، ئینجا لە قۆناغی سێ یەمدا دەبێ بە گۆشتپارەیەك و چل ڕۆژی دیکە بەم شێوەیە بەردوام دەبێت، پاشان فریشتەی بۆ ڕەوانە دەکرێت و گیانی بەربەردا دەکات و فەرمانی بەچوار شت پێ دەکرێت. نووسینی ڕزق و مردن و کردەوەو بەدبەخت دەبێ یاخود خۆش بەخت، جا سوێند بەو زاتەی کە هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە جگە لە زاتی ئەو نەبێ، بێ گومان هەریەکێتان لە ئێوە وادەبێ کارو کردەوەی بەهەشتیان ئەنجام دەدات هەتا وای لێ دێت کە تەنیا باڵێك دەمێنێ لەنێوان ئەوو بەهەشتدا، بەڵام ئەو نووسراوەی لەنێو منداڵدانی دایکی دا لەزانستی خودای گەورەدا هەبوو، پێشی لێ دەگرێتەوە ئینجا دەست دەکات بەئەنجام دانی کاروکردوەی دۆزەخیی و دەچێتە ناوی، هەروەها یەکێك لەئێوە کاروکردەوەی ئەهلی دۆزەخیی ئەنجام دەدات هەتا وایلێ دێت لەنێوان ئەو و دۆزەخدا تەنیا باڵێك دەمێنێت، بەڵام نووسراوەکە پێشی لێدەگرێتەوەو دەست بەکارو کردەوەی ئەهلی بەهەشت دەکات و دەچێتە ناوی).

بۆ زانین هەندێك ئەندام بەر لە هەندێکی دیکە دروست دەبن (ئەوەتا چاوەکان و زمان) لەهەفتەی چوارەم دا بەر لە لێوەکان دروست دەبن کە ئەمان لەهەفتەی (پێنجەم) دروست دەبن. قورئانی پیرۆزیش باسی چاوەکان و زمان لەپێش لێوەکان دەهێنێت: **﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ * وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ﴾** (البلد:٨٩).

**واتە: (ئایا جوتێك چاومان پێ نەبەخشیوە * هەروەها زمان و دوو لێویشمان پێ نە بەخشیوە؟).**

كێ ئەو هەموو راستی یەی بە (محمد) (ﷺ) گوتـووە ؟ ئایـا ئـامێری توێكـاری و پێوانكـاری و مایكرۆسكۆبەكانی لاهەبووە تاكو وەسفەكانی كۆرپەلەمان پێ رابگەیـەنێت، كـە درێژیەكـەی لـە (١) سانتیمەتر تێپەر ناكات ؟ بێگومان ئەمە تەنیا خودای داناو زانا پی ی راگەیاندووە.

# قۆناغی ئێسك

لە(هەفتەی شەشەم) دا پەیكەرە ئێسكی كرِكرِاگەیی لەناو لەشدا دەست بە بلاوبوونەوە دەكات .

بەلام هەتا سەرەتای (هەفتەی حەوتەم) ئەدگاری وێنەی ئادەمی بە كۆرپەلەكە نابینرێت كە شێوەی پەیكەرە ئێسك وەردەگرێت. گواستنەوەی لەشێوەی گۆشتپارە وە بۆ سەرەتای شێوەی پەیكەرە ئێسك، لەماوەیەكی زۆر كورتدا روودەدات، ئەویش لـەماوەی نێـوان كۆتـایی (هەفتـەی شەشـەم) و سـەرەتای (هەفتەی حەوتەم) و ئەو قۆناغـەش بەدیاركـەوتنی پەیكـەرە ئێـسك جیادەكرێتـەوە، كـە دێمـەنێكی ئادەمیانە بە كۆرپەلە دەبەخشێت.

خودای گەورە دەفەرمووێت : ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون : ١٤)

**واتە: ئینجا گۆشتپارەكەمان بە پەیكەری ئێسك گۆریـوە بەگۆشـت پەیكـەرە ئێـسكەكەمان داپۆشیوە ، ئەوجا لە شێوەیەكی تردا دەرمان هێناوە بەراستی خوای مەزن بەرزو پیرۆز و موبارەكـە و چاكترین بەدیهینەرو چاكترین دروسـت كـارە)**. هـەروەها دروسـت بـوونی ئێـسك لـەو قۆناغـەدا، دیارترین پێكهاتەیە بە شێوەیەك كە گواستنەوەی لەشێوەی گۆشتپارەكە ئەدگاری وێنەی ئادەمی پێـوە نابینرێت، لە بۆ سەرتای شێوەی پەیكەری ئێسك لە ماوەیەكی زۆر كورتدا ئەنجام دەدرێت، كە لەچـەند رۆژێكی كەم تێپەر ناكات، ئەویش لەمیانەی كۆتای (هەفتەی شەشەم) (هەروەها لەبەر ئەوەشـە پیتـی پەیوەندی (ف) ی بەكارهێناوە، كە مانای خێرا بەدوا یەك داهاتن دەگەیەنێت). ئەو پەیكـەرە ئێـسكە كە شێوەی ئادەمیانـە بەكۆرپەلەكەدەبەخـشێت لـەدوای ئـەوەی بەگۆشـت (ماسـولكە) دادەپۆشـێت و هـەروەها هـەردوو چـاوەكان و لێوەكـان و لـووتی بەدەردەكـەون و سەریـشی لـە قـەدو پەلـەكانی جیادەكرێتەوە، ئەوەش بەراستخستنەوەی گوتەی پێغەمبەرە (ﷺ) : (اذا مرَّ بالنطفـة اثنـان واربعـون لیلة بعث الیها ملكاً فصورها وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها ثم قال : یـاربّ أ ذكـرٌ أم

انثی)(رواه مسلم) واتە : (ئەگەر چل و دوو شەوان بەسەر نوتفەدا تێپەربوو، فریشتەیەكی دەنێردرێتە لای وێنەی دەكێشێ و گوێو چاو و پیست و گۆشت و ئێسكەكانی بۆ دروست دەكات ، پاشان دەڵێ : ئەی پەروەردگار نێر بێت یاخود مێ).

لەدوای ئەوەی (٤٢) چل و دوو شەو (شەش هەفتە) بەسەر نوتفەكەدا تێپەر دەبێت ، وێنە كێشانی دەست پێ دەكات، تاكو شێوەی ئادەمی وەربگرێت، ئەویش بەدەركەوتنی پەیكەری ئێسكی كرِكراگەیی، پاشان ئەندامەكانی زاوزێ لەدوای (هەفتەی دەیەم) بەدیاردەكەوێت. لەهەفتەی حەوتەمین دا وەكو لەوێنەی كەدا بەدی دەكرێت، بەشێوەیەكی روونو ئاشكرا وێنەو شێوەی ئادەمیانە دەست پێ دەكات، ئەمەش بەتێروانینی سەرەتای بڵاوبونەوەی پەیكەری ئێسك ، جا ئەو هەفتەیەی(لە نێوان رۆژی ٤٠و ٤٥) دەبێتە سنووریكی جیاكەروە لەنێوان گۆشتپارەو شێوەی ئینسانی.

## قۆناغی ماسولكەكان ( بەگۆشت دا پۆشین )

ئەو قۆناغە بەبڵاوبوونەوەی ماسولكەكان بەدەوری ئێسكەكان و داپۆشینیان جیادەكرێتەوە، بە تەواو بوونی داپۆشرانی ئێسكەكان بە گۆشت، وێنەی ئادەمی بە شێوەیەكی میانەیی دەست پێدەكات، لەدوای تەواو بوونی دروست بوونی ماسولكەكان كۆرپەلە دەتوانێت بجولێت . قۆناغی دروست بوونی ماسولكەكانیش لەكۆتایی (هەفتەی حەوتەمین) دەست پێ دەكات . بەدرێژایی (هەفتەی هەشتەم) بەردەوام دەبێت و ئەمەش راستەوخۆ دوا بەدوای قۆناغی ئێسك بەماوەیەكی زۆر كورت دێتەدی . فتبارك الله احسن الخالقين.

## چەند تێرامانێكی قورئانی

قۆناغی داپۆشینی ئێسكەكان بەگۆشت لەكۆتایی (هەفتەی حەوتەمین) دا دەست پێ دەكات و تاكۆتایی (هەفتەی هەشتەمین) بەردەوام دەبێت، لەدوای قۆناغی ئێسك دێت، هەروەكو چۆن قورئانی پیرۆز ئەمەی بەدیارخستووە: ﴿ فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ﴾ (المؤمنون : ١٤)

**واتە : (ئینجا شێوازی گۆشتپارەكەمان بەپەیكەری ئێسك گۆریوە و بە گۆشت پەیكەری**

**نێسکەکەمان داپۆشیوە).**

ئەو قۆناغەی کە بەکۆتایی هاتنی هەفتەی هەشتەمین کۆتایی دێت، بەکۆتایی قۆناغی دروست کردن دادەنرێت، وەکو چۆن زانایانی کۆرپەلە ناسین کۆتایی هەفتەی هەشتەمینیان بەکۆتایی قۆناغی کۆرپەلەی هەلگیراو داناوە...پاشان لەدوای ئەودا قۆناغە تایبەتیەکەی کۆرپەلە دێت کە هاورێکە لەگەڵ قۆناغی (النشأة) هەروەکو قورئان دەفەرمووێت : ﴿**فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ**﴾ (المؤمنون :١٤)

**واتە : (ئینجا بە گۆشت پەیکەرە ئێسکەکەمان داپۆشیوە ، لە پاشان کردمانە دروستکراوێکی تر بەراستی خوای مەزن بەرزو پیرۆز موبارەکە و چاکترین بەدیهێنەرە و چاکترین دروستکارە).**

## توانای ژیان بەسەربردن

بەکۆتایی هاتنی (هەفتەی هەشتەمین) قۆناغێکی نوێ دەست پێ دەکات کە چەند کردارێکی گرنگی تێدا روودەدات، ئەویش ئەوەیە کە تێکرایی گەشەکردنی بەبەراوردکردن لەگەڵ ئەوەی پێشوو، خیراتر دەبێت و هەروەها کۆرپەلە کە دەگۆرێت بۆ دروست کراوێکی دیکە، ئەویش بەوەی کە قەبارەی سەرو لەش و پەلەکان لەنێوان هەفتەکانی (٩و ١٢) دا دەست بە هاوسەنگ بوون و رێك و راست بوون دەکەن.

لە(هەفتەی دەیەم) دا ئەندامەکانی زاوزێ ی دەرەکی دەست بەدەرکەوتن دەکەن و، بینای پەیکەری ئێسك لە کرکراگەیی نەرم بۆ ئێسکی کلسی رەق دەگۆرێت ئەمەش لە (هەفتەی دوازدەهەم) دا روودەدات.

لە هەمان هەفتەدا پەلەکانو پەنجەکان و رەنگەزی کۆرپەلەکە دیاری دەکرێت، ئەویش بە دەرکەوتنی ئەندامەکانی زاوزێ ی دەرەکی بەشێوەیەکی روونتر. کێشی کۆرپەلەکە بەشێوەیەکی دیار زیاد دەکات و ماسولکە خۆ ویستو خۆ نەویستەکانیش بەرەو پێشقەچوون دەچن، هەروەك چۆن جوولەی خۆیستیش لەو قۆناغە دا دەست پێ دەکات.

هەروەها لەو قۆناغەدا ئەندامەکانو کۆ ئەندامەکان ئامادەدەبن بۆ جێ بەجێ کردنی فرمانەکانیان

و كۆرپەلەش بۆ ژیان لە دەرەوەی منداڵدان ئامادە دەكرێ ئەوەش لە(هەفتەی بیست و دووەم) و لە (هەفتەی بیست و شەشەم) یشدا (واتە دوای تەواوكردنی شەش مانگی سك پڕی) كۆتایی پێ دێت، ئەمە لەو كاتەی كە كۆ ئەندامی هەناسەدان ئامادە دەبێ بۆ جێ بەجێ كردنی فەرمانەكانی و ، هەروەها كۆ ئەندامی دەمار ئامادە دەبێ بۆ رێكخستنی پلەی گەرمی لەشی كۆرپەلەكە.

وەلێرەدا هیچ كۆئەندامێك یاخود ئەندامگەلێكی نوێ لەدوای ئەوەی كە هەموویان ئامادە بوونە بۆ كاركردن دروست نابن، منداڵدانیش خۆراك و ژینگەیەكی گونجاو بۆ كۆرپەلەكە دابین دەكات هەتا قۆناغی لەدایك بوون.

## لەدایك بوون



لەدوای تێپەربوونی شەش مانگی هەیڤی (سی وهەشت هەفتە) كۆرپەلە لەناو منداڵداندا گەشەی تەواو دەبێ، لەدوای تەواوكردنی ئەو ماوە دیاریكراوە ئێستا كاتی دەرچوونی هاتۆتە پێش، خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿....وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (الحج : ٥)

**واتە : (ئەوەش بمانەوێت لە منداڵداندا جێگیری دەكەین، تاكاتێكی دیاریكراو) كە وابێ** ماوەكە سنووردار و دیاریكراوە و كاتەكەش ئەندازەكەی بۆ دەستنیشان كراوە. خودای كارلەجێ دەفەرمووێ : ﴿فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ (٢١) إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُومٍ (٢٢) فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ (٢٣)﴾ (المرسلات: ٢١-٢٣)

**واتە : (ئینجا لە جێ ی مەحكەم و قایمدا نوتفەكەمان داناوە ❊ بۆ ماوەیەكی دیاریكراو ❊ خۆ توانیمان ،ئای كە چەندە چاكمان توانی).**

باری ژان گرتن كە بەر لە دایك بوون كۆتایی دێت (چوار) قۆناغ لە خۆی دەگرێت:-

١- قۆناغی فرەواونبوو ملی منداڵدان و گرژبوونی ماسولكەی منداڵدان : ئەوەش لە ئەنجامی چەند فاكتەرێك روودەدات كە میكانیكیو هۆرمۆنیان تێدایە، بە شێوەیەك كە كۆمەڵێك لە هۆرمۆنەكان دەردەرێن، كە یاریدەی دەست پێكردنی ژان هاتن دەدەن، ئەو قۆناغە نزیكەی (٧-١٢) كاتژمێر دەخایەنێت، بە شێوەیەك كەملی منداڵدان ئامادە دەكرێ بۆ فراوانبوون و درێژبوونەوە بۆ پیدا رەتبوونی كۆرپەلەكە، وەكو لە وێنەدا تێبینی دەكرێت.

٢-قۆناغی هاتنە دەرەوەی كۆرپەلەكە: ئەو قۆناغە نزیكەی (٣٠-٥٠) خولەك دەخایەنێت و لەدوای فراوانبوونی ملی منداڵدان بەگوێرەی پێویست، دەست پێ دەكات و لە ئەنجامی گرژبوونەوە و چوونەوەیەكی یەك لەدوای یەكی منداڵدان، یەكەم جار سەری كۆرپەلەكە دەست بەهاتنە دەرەوە دەكات.

وە ئەوەی مایەی سەرەنج راكێشانە تیرەی سەری كۆرپەلە كە لە (١٢) سم تێپەر دەكات، ئەوەش لە سێ هەندی تیرەی كەناڵی زێ لەباری ئاسایی تێپەر دەكات ! جا كاتێك ئێمە ئەوە دەبینین و هەروەها رۆڵی چەندین فاكتەری خودیی یاریدەدەریش بۆ دەرچوونی كۆرپەلەكە دەبینین لە گەڵ درێژبوونەوەی بەستەرەكانی حەوزو ماسولكەكان بۆ ئاسان كردنی ئەو دەرچوونە، حیكمەتی ئەو فەرموودەی خوای گەورە دەزانین : ﴿ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ﴾ (عبس :٢٠)

**واتە : (پاشان رێگەی هاتنە دەرەوەشی بۆ خۆش كرد)**. پاك و بەرزی بۆ خودای داناو كار لەجێ.

٣- قۆناغی دەرچوونی وێلداش دروست بوونی زنجیرەیەكی خوێنین لەدوای دا هەروەكو لەوێنەكە دەبینرێ، ئەو قۆناغەش نزیكەی (١٥) خولەك بەردەوام دەبێت.

٤- قۆناغی گرژبوونەوەو وێكچوونەوەی منداڵدان: ئەمەش بۆ كەمكردنەوەی خوێن بەربوونی دوای كرداری لە دایك بوون ، ئەو قۆناغەش نزیكەی دوو كاتژمێر دەخایەنێت.

لەدوای لەدایك بوون و برینی پەتی ناوكەوە، كە كۆرپەلە بەدرێژایی ماوەی سك پری بۆ بەدەست هێنانی خۆراك لەدایكی پشتی پێ دەبەست ، كۆرپەلە لەدایك بووەكە قۆناغێكی دیكە لەوێستگەیەكی نوێی ژیانی دا دەست پێ دەكات!

كۆتایی : كورە شیرینەكەم ئەوەی لە پێشدا رابوورد لە پێشاندانێكی كورت وپوختی ئایەتە پیرۆزەكان و شیكردنەوەی زانستیانەی تەواوی قۆناغ بەندی كۆرپەلەدا، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە كە ئەم ئایەتە قورئانیانە وەسفێكی وردی ئەو قۆناغە سەرەكیانە پێشكەش دەكات كەوا كۆرپەلە پێدا

تێپەر دەبێت هەر لە ساتەوەختی پەیدابوون و دروست بوونیەوە هەتا لەدایك بوونی تەواو دەبێت، هەروەها سەرەنج دەدەین كە ئەو گۆڕانكاریە قورئانیانە بەتەواوی هاورێكە لەگەڵ سەرنج و تێبینیەكانی زانستی كۆرپەلە ناسی نوێ، بەشێوەیەك هیچ یەكێ لەو زانایانە لەدوای ئەوەی قۆناغەكانی پێشڤەچوونی كۆرپەلە لە ئامێری نوێ و پێشكەوتووی دیت، بەدرۆی ناخاتەوە.

هەر چەندە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو قسەیەی لەو سەردەمە فەرمووە كە قورئانی پیرۆزی تێدا دادەبەزی، هیچ ئامێرێكی پێشكەوتوو نە لەلای ئەو نە لەلای كەسانی دیكەش بەدی نەدەكرا، بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) بەزاراوە گەلێكی ورد كە لەگەڵ دەستوورەكانی مەعریفەی نوێ دەگونجێ هەواڵی لەبارەی قۆناغەكانی دروست بوونی كۆرپەلەی پێ ڕاگەیاندووین، لەوانە دروست بوونی كۆرپەلە و پێشڤەچوونی ، بەشێوەی قۆناغ بەندی بەڕێوەدەچێ وەكو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَاراً ۞ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً﴾ (نوح :١٣-١٤)

**واتە : (ئەوە چیتانە ئێوە قەدری خوا نازانن ، بۆ ڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن۞ خۆ ئێوە پێشتر نەبوون، هەر خوا ئێوەی بە چەند قۆناغدا تێپەڕاند و دروستی كردن).**

زانایانی توێكاری نا موسڵمانی ئەو كات باوەڕیان وابوو كەوا مرۆڤ لە خوێنی بێنوێژی ئافرەتان دروست دەبێت!، هەتا ئەوان لە سەدەی (حەڤدەهەم)دا لەو باوەڕە دابوون كە كۆرپەلە بەتەواوی لە نوتفەی پیاو دروست دەبێت، پاشان لەدوای چوونی بۆ ناو منداڵدان ئینجا دەست بە گەورەبوون دەكات، هەروەها بیرو باوەڕیان وابوو كە مرۆڤ تۆوێكە (وەكو نەمامێكی بچكۆلانە) بەتەواوی ئاخنراوەتە نێو ئەو نوتفە بچووكە! هەتا سەدەی (هەژدەهەم) هات و میكرۆسكۆب چەسپاندی كە نوتفە و هێلكۆكە هەردووكیان بەیەكەوە بۆ سك پڕبوون پێویستن، ئەمەش چەندین سەدە دوای ئەوەی كە قورئانی پیرۆز باسی كردبوو، (فتبارك الله أحسن الخالقين) پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ (النمل ٩٣)

**واتە : (وەبڵێ سوپاس و ستایش بۆ خوا لە ئایندەیەكی نزیكدا هەموو بەڵگەو نیشانەكانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیناسنەوە)**

۞ لە كۆتاییدا كوری شیرینم پرسیارێكی گرنگ دێتە نێو زەینت: بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) باسێكی زانستی لە زەمانێك پێشكەش دەكات و دەخاتە ڕوو، كە هیچ بەدیهێنراوێك زانیاری لەبارەی نەبوو؟ هەروەها لەوێدا هیچ كەرستەیەكی زانستی پزیشكی نوێ بەدی نەدەكرا، پێغەمبەر (ﷺ) ئەو

زانستەی لە كوێ هێناوە ئەگەر لە ڕێگەی نیگاوە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی پێی نەگەیاندبێ و فێری نەكردبێ ؟

بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین : كە خودای گەورە بە زانستەكەی كە سەرتاپای بوونی داپۆشیوە، دەزانێ كەوا مرۆڤ ڕۆژێك لە ڕۆژان دەگاتە ناسینی قۆناغەكانی كۆرپەلە و لە داهاتوودا ڕۆڵی شریتی یەكەمین دەزانێ، بۆیە خوریەی خستۆتە دڵی دوایین پێغەمبەرەكەی كە ئەو هەقیقەتە بدركێنێ، تاكوو تیایدا ئەو بەڵگەو شاهێدانە ببێننەوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەریتی و پەیامەكەی كە لەگەڵ هەموو كات و سەردەمێك بگونجێت.

## كلێنچكە ( عجب الذّنب )




لە ژمارەیەك لە فەرموودە پیرۆزەكانی پێغەمبەر(ﷺ) دا باسی كلێنچكە كراوە كە بەشێكە لەو كۆرپەلەیەی كەوا جەستەی لێوە دروست دەبێت، ئەوەی كە لە دوای مردنی و تەنیا لە جەستەكەی دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لێیەوە زیندوو ببێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) باسی كردووە جەستەی مرۆڤ هەمووی دەرزێ و لەناو دەچێ تەنیا كلێنچكە نەبێت، جا ئەگەر خودای گەورە ویستی مرۆڤ زیندوو بكاتەوە، بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت هەركەسێك لە كلینچكەی خۆیەوە شین دەبێتەوە وەكوو چۆن پاقلە لە لە تۆوەكەی خۆی شین دەبێتەوە!.

وە لە و فەرموودانەش كە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گێردراوەتە وە كە فەرموویەتی: (كل بن آدم

تأكله الارض الاعجب الذنب منه خلق وفيه يركب) واتـه : (زەوى هـەموو ئادەمیزادێـك دەرزێنـێ و دەیخوات تەنیا كلێنچكە نەبێت كە لێیەوە بەدیهێنراوە و هەر لەسەر ئەویشەوە زینـدوو دەكرێتـەوە) .
ئەو فەرموودە پیرۆزە بەنرخانەى پێغەمبـەر (ﷺ) هەقیقـەتێكى زانـستى دەگرنـە خۆیـان كەزانـستە بەدەست هێنراوەكان نەگەیشتبوونە ناسینى تەنیا پێش چـەند سـاڵێكى كـەم نـەبێت، ئـەویش كاتێـك كەپسپۆڕانى زانستى كۆرپەلە ناسى دووپاتیان كردەوە لاشەى مرۆڤ لە شـریتێكى زۆر بـچووك دروسـت دەبێت كە بە (شریتى یەكەمین) ناو دەبرێـت كـە بـە قـودرەتى خـواى گـەورە، لـە پازدەهـەمین رۆژى پیتانـدنى هێلكۆكـە و چـاندنى لـە دیـوارى منداڵـدان دروسـت دەبێـت، دوا بـەدواى بەدیاركـەوتنى كۆرپەلەكە بەهەموو چینەكانى یەوە دروست دەبێت بەتایبەتى كۆئەندامى دەمار، سەرەتاكانى هەریەك لە بڕبڕەى پشت و پاشماوەى ئەندامەكانى دیكەى لەش، چونكە خوداى گەورە توانـاى بـەو شـریتە وردە بەخشیوە كە پاڵ بە خانەكانەوە دەنێ بۆ دابەش بوون و تایبەتمەندىو جیابوونەوەو كۆبونەوە لـە شـانەى تایبەتكراو، هەروەها ئەندامەكان یەكتر تەواو كەر لـە یارمەتیـدانى بـۆ جـێ بـەجێ كردنـى سـەرجەم فەرمانەكانى لەش.

هەروەهاچەسپاوە ئەو شریتە یەكەمینە لەناودەچێ تەنیا بەشێكى بچووكى نەبێ، كـە لـە كۆتـاى بڕبڕەى پشتدایە، پێى دەڵێن (كلێنچكە) دەمێنێتەوە، كە مەبەسـت پێـى ئـەو (عجـب الـذنب) ەیـەى فەرموودەكانى پێغەمبەرى خودایە (ﷺ) كاتێك مرۆڤ دەمرێت لاشەكەى دەرزێ و نامێنێ تـەنیا ئـەو (عجب الذنب) ە نەبێ. هەر لەویەوە بەبارینى بـارانێكى تایبـەت لەئاسمانـەوە مرۆڤـەكان سـەرلەنوێ دروست دەكرێنەوە، خـوداى گـەورە هـەركاتێك بیـەوێ دەیبارێنـێ ئـەو كاتـە هـەر بوونـەوەرێك لـە (كلینچكەكەى) خۆیەوە دەڕوێتەوە، وەكو چۆن پاقلە لە تۆوەكەى شین دەبێتەوە.

هەروەها كۆمەڵێك لە زانایانى چـین لـە ژمارەیـەك لـە تاقیـكردنـەوەكانى تاقیگـەیى دا لـەرووى كیمیاییـەوە چەسـپاندویانە كـە ئەسـتەمە (كلێنـچكە) (عجـب الـذنب) بەتوانـەوە لـەناو بـەرزترین ترشەڵۆكەكان، یاخود لەرووى فیزیاییەوە بە سوتاندن، یان بە هاڕین، یاخود بەدانە بەر تیـشكى جـۆراو جۆر ەوە لەناو بچێ. ئەوەش راستى فەرموودەى پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنێ كە بە لایەنى كەم بەهەزار و چوارسەد ساڵ پێش زانستە وەرگیراوەكان كەوتووە...

# سێ پەردە تاریكەكە

خودای گەورە لە سورەتی (الزمر) دا دەفەرموێت : ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ﴾ (الزمر : ٦)

**واتە: (... لەوەو دوا لەسكی دایكتاندا ئێوە دروست دەكات بەچەند قۆناغێك لەناو سێ تاریكیدا....)** ئەمە بەردەوام بوونی پێشفەچوونی كۆرپەلەیی و گواستنەوەی لە قۆناغێك بۆ قۆناغێكی دیكە روون دەكاتەوە وەكو لەپێشدا روونمان كردەوە.

هەروەها زانایانی كۆرپەلەناسی چەسپاندویانە كە كۆرپەلە لە میانەی قۆناغەكانی دروست بوونی لەناو منداڵداندا بەسێ پەردە دەور دەدرێ كەبریتین لەمانە:

١- پەردەی ئەمینۆسی: ئەم پەردەیە شلەیەكی تێدایە، دەوری كۆرپەلەكە دەدات و وایلێدەكات لەحالەتی مەلەكردن دابێ، كە لە و زەبرانە دەیپارێزێت بەر منداڵدان بكەوێت ، هەروەها جوولەشی ئاسان دەكات تاكو لەكاتی لەدایك بووندا هاتنە دەرەوەی ئاسان بێت! وەكو لە وێنەدا دەیبینی .

٢- پەردەی كۆریون .

٣- پەردەی (Decidua). لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە زاناكانی دیكە ئەو سێ تاریكییەیان بەپەردەی ئەمینۆسی دەوری كۆرپەلە و دیواری منداڵدان و دیواری سكەوە راڤەكردووە، خوداش لە هەموان زاناترە.

# كەمترین ماوەی سك پڕی ( شەش مانگە )

وەكو پێشتر باسمان كرد كۆرپەلە لەدوای تەواوكردنی (شەش مانگ) ی سك پڕی دا ئامادە دەبێت بۆ ژیان بەسەر بردن لەدەرەوەی منداڵدان، لە شتە سەرسورهێنەرەكان ئەوەیە كە سەرنج دەدەین قورئانی پیرۆز لەسورەتی (الاحقاف) دا روونی كردۆتەوە كە قۆناغی سك پڕی و شیرە خۆری ماوەی (٣٠) سی مانگان دەخایەنێت، خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْراً﴾ (الاحقاف : ١٥)

**واتە : (سك پڕبوون و لە شیر پڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندووە).**

لەسورەتی (لوقمان) دا خوای گەورە باس دەكات كە ماوەی لە شیر بڕینەوە بریتی لە (٢٤) مانگ

خودا دەفەرمووێت : ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ (لقمان : ١٤)

**(واتە : وەلەشیر برینەوە شی لە دوای دوو ساڵە).**

بە كردارێكی بیركاریانەی سادە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە ڕاگەیاندنی قورئانی بریاردەدات كە كەمترین ماوەی سك پڕی بریتی یە لە (شەش مانگ) واتە : (٢٤) مانگی لە (٣٠) مانگ دەركەین = (٦) مانگ دەمێنێتەوە ، هەروەكو لە پێشدا روونمان كردەوە.....

بەر لە (هەفتەی بیست و دووەمین) كە ئەو قۆناغەی تێدا دەست پێ دەكات، زۆربەی كۆرپەلەكان بە ناكامی لەدایك دەبن واتە لەبار دەچن ئەگەر بێت و لەدایك بن. فتبارك الله احسن الخالقین.

# سنووردارکردنی وەچە

ئیمامی ئەحمەد لە مەعقەلی كوری یەسار ریوایەت دەكات دەڵێ : پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی : من تووشی ئافرەتێكی جوان و خانەدان بوومە، بەڵام منداڵی نابێ و نەزوكە ئایا بیخوازم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (نەخێر) پاشان دووبارە هاتەوە لای دیسان قەدەغەی كرد، دواتر سێ بارە هاتەوە فەرمووی : (تزوجوا الودود الولود فأني مكاثر بكم الامم) (الصحیح) واتە : (ئافرەتێك بخوازن بچێتە نێو دڵان و منداڵی ببێ، چونكە من بە ئێوەوە ژمارەی ئومەتەكەم زیاتر دەبێت).

كورە شیرینەكەم ئەو فەرموودەیە بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ بانگەشەی سنووردار نەكردنی وەچە یا هاوشێوەی ئەوە دەكات .

لەڕووی زانستی یەوە چەسپاوە كە بە كارهێنانی هەر جۆرێك لەهۆكارەكانی سنووردارکردنی وەچە، شوێنەوارێكی خراپی لەسەر باری تەندروستی دایكەكە دەبێ . چونكە كۆئەندامی زاوزێی ئافرەت سەروكاری فەر مانی كۆمەڵێك لە هۆرمۆنەكانی زاوزێ دەكات، كە لە بەشی پێشەوەی ڕژێنی نوخامی و هێلكەدان دەردەدرێن...

لە باری ئاسایی دا ئەو هۆرمۆنانە بە ڕێژەیەكی ئەندازەیی و دیاریكراو دەردەدرێن، بەشێوەیەك

ئەگەر هەر زیادەیەك یاخود کەم بوونێکی تێدا روویدات ئەوا دەبێتە هۆی دروست بوونی حاڵەتی نەخۆشی لە لای ئافرەتەکە....

ئالێرەش پزیشکەکان دان بەوەدا دەنێن کەوا ئەو هۆکارانەی کە وا بۆ منداڵ نەبوون بەکار دێن (وەکو حەبی قەدەغەکردنی سك پڕی و ئەوانی دیکە) زیانیان هەیە لەسەر ئەو کەسانەی کە بەکاریان دەهێنن، ئەمەش لەئەنجامی توێژینەوەو پشکنینی زۆرەوە دەرکەوت:-

١- کەلێن دروست بوون لەهاوسەنگی هۆرمۆنیی لەلە شدا .

٢- زیاد بوونی کێشی لەش و گردبوونەوەی بڕێکی زۆر شلەمەنی.

٣- دروست بوونی هەوکردنی توند لە کۆئەندامی زاوزێی دایك.

٤- زیاد بوونی گومانی توشبوون بە نۆرە دڵی کوژەر، بۆ ئەوانەی کە تەمەنیان لە سی ساڵ ڕەتی کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتوونەتە نێو چل ساڵیەوە. هەورەها نیشانەی دیکەش کە کۆتاییەکەی چاك نابێ.

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) ڕاستی فەرموود کە دەڵێ : (تناكحوا تكثروا، فأني أباهي بكم الامم يوم القيامة) (رواه عبدالرزاق في مصنفه) واتە : ژن بهێنن ژمارەتان زۆر بێت، چونکە من لەڕۆژی قیامەت دا لەناو ئوممەتەکانی دیکەدا شانازیتان پێوە دەکەم).

## سیفەتە بۆماوەیەکان



بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکەی خۆیاندا، لە (ئەبو هورەیرە) دوە ریوایەتیان کردوە لادێ نشینەك هاتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و گوتی: (خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە و لەئێمە ناچێ منیش گومانم لێی کرد: پێغەمبەری خوداش (ﷺ) پێی فەرموو : (ئایا تۆ حوشتر بەخێو دەکەی ؟) گوتی : بەڵێ — فەرمووی : (باشە ڕەنگیان چۆنە؟) گوتی:

ڕەنگیان سۆرە، فەرمووی: (هل فیها من اورق؟) واتە (ئایا هەیانە ڕەنگی خۆڵەمێشی بێ) ، فـەرمووی : (فأنی تری ذلك جاءها) واتە : (باشە دەبێ ئەو ڕەنگەی لەکوێ بۆ هاتبێ ؟) گوتی ئەی پێغەمبـەری خودا : (عِرقٌ نزعها) . واتە : لەباب و باپیرانیەوە بۆی هاتووە . فـەرمووی : (ولعـل هـذا عـرقٌ نزعـه) واتە : (لەوانەیە ئەو منـاڵەی تۆش ئەو ڕەنگەی لەباب و باپیرانیەوە بۆی پەریبێتەوە) وەرێگەی پێ نەدا منداڵەکە لەناو ببات.

## * ڕاڤەکردنی واژەی فەرموودەکە

(من اورق) ئەوەیە کە ڕەنگەکەی ڕەشی تەواو نەبێت . (نزعة عِرق) لە کتێبی (النهایة) دا دەڵێ : (یقال نزع الیه في الشبه أذا اشبهه) واتە : ئەگەر کەسێك بەکەسێکی دیکە بچێ، دەڵێن سیفەتی ئەوی بۆ پەریوەتەوە. هەروەها ئیمامی نەواوی دەڵێ (مەبەست لە(عِرق) لێرەدا واتە ڕەسەنێتی لـە ڕەچـەڵەك دا هاوشێوەی ڕەسەنێتی لە بەروبوومەوە، (نزعـة) واتە شێوەی لەوی کردو سـیفەتی ئـەوی بـۆ هـات و ڕەنگی ئەوی لەسەر بەدیار کەوت.

کورە شیرینەکەم پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرموودەدا ئاماژەی بە یاساکانی بۆ ماوەیی داوە کـە لـەو زووانـە دۆزراوەتـەوە، زۆربـەی دۆزینەوەکـەش لەلایـەن زانـای ئـەورووپی (منـدل) وە بـوو. جـا لـەو فەرموودیەدا - وەکو یەکێ لە پزیشکە پسپۆڕەکانی ئەو بوارە لە ڕاڤەکردنی ئەمەدا دەڵـێ — هەنـدێ سیفەتی شاراوە هەن کە لە سەر هەڵگری سیفەتە بۆ ماوەییەکان هەڵگیراون و نەچوونە باری جێ بـەجێ کردنەوە، هۆکەشی ئەوەیەکـە سـیفەتی دیکـە ی بـە پـێش کـەوتووە، یـاخود هـەڵگری سـیفەتە بـۆ ماوەییەکانی دیکە بەسەری دا زاڵ بووە، هەر بۆیە مرۆڤ سیفەتێکی لە باپیرەیەوە یاخود لەداپیرەیـە وە بۆ دەمێنێتەوە، کە لەوانەیە ماوەی نێوانی لەگەڵ هەر یەکێکیان سەدان سـاڵ بێـت، ئـەو دیاردەیـەش لەزانستی بۆ ماوەیی نوێدا ناسراوە و ئاماژەی پێدراوە، پێغەمبەری خوداش (ﷺ) لەو فەرموودیـەدا ئاماژەی پێداوەو بە سیفەتەکانی پێشووی ڕەچەڵەکەکان هەتا دەگاتە ئادەم (سـەلامی خـوای لـێ بـێ) یاساکانی ئەم حەقیقەتەی ڕاڤە کردوە، جـا ئایـا ٠ منـدل) و زانایـانی بـۆ مـاوەیی هاوچـەرخ، هـیچ شـتێکیان خستۆتە سەر تازە بێ ؟ سوێند بەخوا نەخێر، ئەوان هیچ شتێکیان لەوە زیاتر نەگوتووە تـەنیا ئەوە نەبێ بە شێوازێکی جیاواز گوزارشتیان لە گوتەی پێغەمبەری خودا کردووە (ﷺ) .

خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْـيٌ يُـوحَى* عَلَّمَـهُ شَـدِيدُ

الْقُوَى﴾ (النجم :٣-٥)

واتە : (قسەو گوفتاریشی لەهەوا و هەوەسە وە نییە * ئەمەی كە رایدەگەیەنێت تەنیا نیگاو وەحی خودایە * جبریلی فریشتە خاوەنی هێزو توانایی زۆرفێری كردووە).

## خەتەنەكردن

بوخاری و موسلیم لە سەحیحەكەی خۆیاندا، لە (ئەبو هورەیرە) ەوە (خوا لیّ ی رازی بێ) ریوایەتیان كردووە دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (الفطرة خمس : الختان والاستحداد وقص الشارب وتقليم الاظفار ونتف الآباط) واتە : (پێنج شت هەن لەفیترەی ئادەمیزادن : خەتەنەكردن و تاشینی مووی ژێر ناوك و برین و كورت كردنەوەی سمێڵ و نینۆك كردن و هەڵكەندنی مووی ژێر باڵەكان).

كورە شیرینەكەم بزانە بنەچەی فیترەت : واتە دەستپێكی دروست بوون، مەبەستیش پێی لەو فەرموودەیە ئەوەیە : ئەگەر یەكێ لە و كارانەت ئەنجام دا ئەوە بەو فیترەتە وەسفی دەكرێت كە خودای گەورە بەندەكانی لەسەر دروست كردووە و هانی داون، پێی خۆشە ئەنجامی بدەن تاكو لەسەر تەواوترین و بەرزترین سیفەتەكان بن.

مانای (ختان) یش : برینە ، مەبەستیش لە مە برینی ئەو پێستەیە كە سەری چووكی داپۆشیوە، و(الاستحداد) یش واتە بە كارهێنانی مووس – یان ئامێری موولابەر – بۆ لابردنی موو بریتییە لەو مووەی كە لە سەرەوەی دەورو بەری چووكی مرۆڤدا هەیە.

بەو دواییە ئاشكرا بوو وەكو لە گۆڤارێكی پزیشكی بەریتانیایی بەناوی (BMG) – كە لە بەناو بانگترین گۆڤارە پزیشكیەكانە – گوتارێكی لەساڵی ١٩٨٧ لەبارەی ئەو شیرپەنجەی كە تووشی میزەڕۆ دەبێت لەگەڵ هۆیە راستەوخۆ كانی تووشبوو بەنەخۆشییەی بڵاوكردەوە، لەو گوتارە هاتووە:

بێگومان ئەو شیرپەنجەی كە تووشی میزەڕۆ دەبێت لەلای جوولەكە ولاتە ئیسلامیەكان زۆر دەگمەنە، بەوەی كە لەتەمەنی منداڵیدا منداڵەكانیان خەتەنە دەكەن، هەروەها ئامارە پزیشكیەكان ئەوەیان چەسپاندوە ئەو شیرپەنجەیەی تووشی بۆریەكانی میز دەبێ لەلایەن جوولەكەكانەوە تەنیا لە (نۆ) نەخۆشان لەسەرتاپای جیهاندا بەدی كراوە.

وەکو لە ڕاپۆرتێکدا کە ئەکادیمیەی ئەخۆشیەکانی منداڵان بڵاوی کردۆتەوە کە تیایدا هاتووە: بێگومان خەتەنەکردن هۆکارێکی کارایە لە خۆپاراستن لەشێرپەنجەی چووکدا.

هەروەها کورە شیرینەکەم ئەو کارە لەسووننەت و ئاکاری پێغەمبەر و نێردراوەکانە، وەکو لەهەردوو سەحیحیاندا هاتووە، لە (ئەبو هورەیرە)، کە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (اختتن ابراهیم (علیه السلام) وهو ابن ثمانین سنة بالقدوم) واتە : (ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا بە (القدوم) خەتەنەکرا) .

ئیمامی نەواوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ : (القدوم) ئامێرێکی دارتاشینە.

# شیر پێدان



* خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموێت : ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (البقره : ٢٣٣)

واتە : (دایکان دوو ساڵی تەواو با شیر بە منداڵەکانیان بدەن، بۆ هەرکەس کە دەیەوێت شیری تەواو بدات و پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خاونی منداڵەکەیە، رزق و رۆزی و پۆشاك بەشێوەیەکی جوان و پەسەندی ئایین ئامادە بکات، ئەرك لەسەر هیچ کەس دانانرێت جگە لە توانای خۆی،

**نابێت هیچ دایكێك زیانی پێ بگەیەنرێت بەهۆی منداڵەكەیەوە، هەروەها باوكیشی نابێت زیانی پێ بگەیەنێت بەهۆی منداڵەكەیەوە و لەسەر میرات گری منداڵەكەشە وێنەی ئەو مافانەی باسكران، خۆ ئەگەر دایك و باوك هەر كاتێك بە رەزامەندی و پرس و رای هەردووكیان ویستیان منداڵەكە لە شیر ببڕنەوە ئەوە قەیناكات و هیچ گوناهیان لەسەر نیە لە و بارەیەوە، خۆ ئەگەر ویستتان دایەن بۆ شیر پێدانی منداڵەكانتان بگرن ئەوەش قەیناكات و هیچ گوناهتان لەسەر نییە بە مەرجێك ماف و كرێیان بەجوانیو شایستە پێ بدەن لەخوا بترسن و پارێزكار بن و چاك بزانن بەڕاستی خوا زۆر بینایە بەو كار و كردەوانەی ئەنجامی دەدەن).**

كوری شیرینم ئەو ئایەتە بانگی دایكان دەكات بۆ شیر پێدانی منداڵەكانیان لە گەڵ دیاریكردنی ماوەی نموونەیی بۆ ئەو شیر پێدانە ئەوەش ئەوەیە كە پزیشكی تازە قسەی لەبارەیەوە كردووە و چەسپاندوویەتی.



## شیری دایك لەچی پێك هاتووە ؟

١- پێشەچوون : پێكهاتەی شیری دایك رۆژ بە رۆژ بەرەو پێشەوە دەچێت، لەگەڵ پێویستی خۆراكی منداڵە شیرخۆرەكە و بەرگەگرتنی لەشی ، هەروەها لەگەڵ غەریزەی كۆ ئەندامەكانی كە رۆژ بەرۆژ بەرەو پێشەوە دەچێت، بە پێچەوانەی شیری دەست كرد كە پێكهاتەكەی ناوی جێگیرە، نموونەشیان وەكو شیری (نیدۆ) و (نان ١) و (نان٢) و (نان ٣) و هی دیكەش .

٢- هەرس كردن: شیری دایك ئاسانتر هەرس دەكرێ، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەنزیمی هەرسكەری تێدایە . لەكاتێكدا هەرس كردنی ئەنزیمەكانی شیری مانگا لەناو لەشی كۆرپەلە كە دوا دەكەوێت .

٣- پاك و خاوێنی : شیری دایك پاككراوەیە، بەڵام شیری دەست كرد لەكاتی شیر پێدانی منداڵەكە لە پیس بوون بە میكرۆبەكان خاڵی نابێ .

٤- پلەی گەرمی هاوسەنگ : پلەی گەرمی شیری دایك لەگەڵ پلەی گەرمی منداڵەكە گونجاوە، بەڵام ئەمە لە شیر پێدانی دەست كرد دا بەبەردەوامی فەراهەم نابێت.

٥- بەرگری كردن: شیری دایك جۆرە دژە تەنێكی تێدایە، كە یاریدەی منداڵ دەدات بۆ بەرگری كردن لە نەخۆشیەكان. ئەو دژە تەنانە بەرێژەیەكی زۆر كەمتر لەشیری مانگا و ئەوانی دیكە بەدی دەكرێن.

## * لەسوودەكانی شیرپێدانی سروشتی :

١- گەڕانەوەی منداڵدان بۆ باری ئاسایی خۆی لەدوای لەدایك بوون.

٢- كەمبونەوەی توشبوون بە شێرپەنجەی مەمك لەلای ئەوانەی كە شیری خۆیان بەمنداڵ دەدەن.

٣- شیر پێدانی سروشتی رێگایەكی نموونەییە بۆ رێكخستنی وەچەو لەدایك بوون .

٤- شیر پێدانی سروشتی پەیوەندی گیانی لە نیوان دایك و منداڵەكەی بەهێز دەكات.

٥- یەكەمین شیرپێدان كە منداڵی شیرەخۆرە لەمیانەی دوو رۆژی یەكەمین دوای لەدایك بوونی لەمەمكی دایكی وەریدەگرێت پێی دەگوترێت (ژەك) ، پێكهاتەی بەرزی پرۆتیناتی تایبەتی تێدایە كە دژی گەشەكردنی ئەو میكرۆبانەیە كە دەبنە هۆی نەخۆشی یەكان، كە پێی دەڵێن دژە تەنەكان)، ئەو تەنانە فاكتەرێكی گرنگن كە منداڵە ساواكە پێویستی پێیەتی، چونكە ئەو منداڵە هێشتا لەویەری حاڵەتی لاوازی دایە، شیری دایك بە سروشتی خۆی پاك كراوەیە، ئەو میكرۆبانەی تێدا نیە كە دەبنە هۆی نەخۆشی یە پەتاكان، یاخود ئەوانەی تووشی ریخۆڵەكان دەبن، هەروەها ئەو شیرە هەموو كاتێك ئامادەیە بە پێ ی داواكاریمنداڵەكە، هەروەكو چۆن پێكهاتەكەی بەپێی پێویستی یەكانی ئەو منداڵە و گۆڕانی تەمەنی گۆڕانكاری بەسەر دا دێت. فتبارك الله احسن الخالقین.

# ئێسکەکان ، کارگەی بەرهەمهێنانی خوێنن




* کوری شیرینم بزانە کە قورئانی پیرۆز بەسەدان ساڵ پێش زانست کەوتووە لەدان نان بە زیندەگی ئێسکەکان و گرنگییان لە فەرمانەکانی لەشی مرۆڤدا.

لەسورەتی (مریم) دا گەورەمان زەکەریا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) داوای لەخودای گەورە کرد منداڵێکی پێ ببەخشێت سەردرای ئەوەی کە خێزانەکەی نەزۆك بوو خۆشی ئیسکەکانی لاوازو بێ هێز ببوون. خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ (مريم : ٤) واتە : **(گوتی پەروەردگارا بەڕاستی من ئێسکەکانم لاواز بوون وقژی سەرم هەمووی سپێتی دایگرتووە بەڵام هەرگیز لەدرعا و پاڕانەوە لە زاتی تۆ نا ئومێد نەبووم).**

بێگومان قورئانی پیرۆز پەیوەندی ئێسك بە منداڵ بوونی ڕاگەیاندووە. ئەمەش ئەوەیە کە بەو دوایە زانست دانی پێداناوە: ئێسکەکان فەرمانگەلێکی گرنگیان هەیە کە ژیانی مرۆڤیان لە سەر دەوەستێت ، چونکە سەرجەم ئەو شتانەی تێدایە لەش پێویستی پێیان دەبێت ، وەك فوسفۆر و کالیسیۆم، هەروەهاکرداری دابەشکردنی ئەو ماددانە ڕێك دەخات بەشێوەیەك کە لێدانەکانی دڵ و جوولەی ماسولکەکان دەپارێزێت.

هەروەها ئێسك، خرۆکە سوورو سپیەکان بە درێژایی ژیانی مرۆڤەکە بەبێ پچران بەرهەم دەهێنن.

هەروەها زانست لەم زووانەدا دانی بەوە داناوە کە حاڵەتی ئێسکەکان ڕاستەوخۆ کاریگەری دەکەنە سەر کۆئەندامی دەمار، هەر لەبەر ئەمەش ڕاستەوخۆ دەچێتە نێو توانای مرۆڤ لەمنداڵ بوون و وەچە نانەوە، ئەمەش ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی.

# ژمارەی ئێسك و جومگەگان لەناو لە شی مرۆڤدا




لە خاتوو عائیشەوە ریوایەت كراوە فەرموویەتی : پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت : (انه خلق كل انسان من بنی ادم علی ستین و ثلاث مئة مفصل، فمن كبر الله ، وحمد الله ، وهلل الله ، وسبح لله ، واستغفر الله ، وعزل حجراً عن طریق الناس ، او شوكة او عظماً عن طریق الناس ، وامر بالمعروف أو نهی عن منكر عدد تلك الستین وثلاث مئة السلامی ، فانه یمشی یومئذ وقد زحزح نفسه عن النار) (رواه مسلم) . واتە : (بێگومان هەموو مرۆڤێك لە نەوەكانی ئادەم دا لەسەر سێ سەدوو شەست جومگە دروست كراوە ، جا هەریەكێك خودای بە گەورەی گرت و ستایشی خودای كرد، (لا اله الا الله) ی گوتو (سبحان الله)ی كرد، داوای لێخۆشبوونی لە خودا كرد، بەردێكی لەسەر رێگەی خەڵكی لابرد. یا دڕكێكی لابرد، یا ئێسكێكی لەسەر رێگەی خەڵكی لابرد و فەرمانی بەچاكە كرد یا قەدەغەی خراپەی كرد، بەقەدەر ژمارەی ئەو سێ سەدوو شەست ئێسكە، ئەوە ئەوكەسە لەو رۆژەوە خۆی لە ئاگری دۆزەخ رزگار كردووە).

پزیشكەكان دەڵێن : دەتوانین ئێسكەكانی لەش لەدوای تەواو بوونی گەشەكردنیدا لە (٢٠٦) ئێسك كۆ بكەینەوە وەكو ئەوەی خوارەوە:

سەر (٢٨) ، بڕبڕەى مل (٧) ، بڕبڕەى پشت (١٢)، بڕبڕەى كەلّەكە(٥)، بڕبڕەى سێ بەندە (٥)، كلێنچكە (٤)، پەراسووەكان (٢٤)، سینگ (٣) ، هەروەها تەختى شان(٢)، گەردەن (٢)، باسك (٢)، كەوەردو زەند(٤)، مەچەك (١٦)، هەردوو لەپى دەست (١٠)، پلى پەنجەكانى دەست (٢٨)، حەوز (٦)، ڕان (٢)، لولاق (٤)، ئێسكە بچووكەكانى پێ (١٤)، پلى پەنجەكانى پێ (٢٨)، لەگەڵ ئێسكە ژێيەكانى هەرسەرە پەنجەيەك (٢)، پەنجەى گەورە (٣)، سەرجەميان دەبێتە (١٠) ئێسكە ژێ، جا ئەگەر ژمارەى ئێسكەكانى لەش لەگەڵ ئێسكە ژێيەكان و لەگەڵ مەڵبەندە ئێسكيەكانى بەرايى كە كۆرپەلەكەى لەسە ر دروستكراوە بخەينە سەر، ئەوا سەرجەمى ئەو ئێسكانە ى كە ئێمە ى لەسەر دروست دەبين بەم شێوە دەبێت :

٢٠٦+ ١٠+١٤٤= ٣٦٠ ئێسك

لەبارەى جومگەكانى لەش پزيشكەكان بەم شێوەيە دياريان كردووە:

بڕبڕەى پشت (١٤٧) و (٢٥ خەپلەكرِكراگەيى نێوان بڕبڕەكان + (٧٢) ى نێوان پەراسوو بڕبڕەكان + (٥٠) ى نێوان بڕبڕەكان لە ڕێگەى پاروچكەى لابەلا).

سینگ (٢٤) (٢) ئێسكى قەفەزى سینگ+ (٨١) ى نێوان قەفەزى سینگ و پەراسووەكان+ (٢) ى نێوان چەڵەمەو تەختى هەردوو شان+ (٢)ى نێوان هەردوو تەختى شان و سینگ).

دووباڵ (٤٣) (جومگەيەكى شان+ ٣ باسك +٤ مەچەك+٣٥ ئێسكى دەستە كان).

دوولاق (٤٤) (جومگەيەكى ڕان + ٣ ئەژنۆ+٣ پاژنە+ ٣٧ ئێسكەكانى پێ).

حەوز (١٣) (٢ ئێسكى سمت + ٤ بڕبڕەى كلێنچكە+ ٦ ئێسكۆكەكانى ئێك + جلەوەلكان) شەويلگە (٢) .

جا سەرجەمى هەرهەموويان دەكاتە: ١٤٧+٢٤+٨٦+٨٨+١٣+٢= ٣٦٠ جومگە.

پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستى فەرمووە لە وەى كە

خاتوو عائيشە ڕيوايەت دەكات (خوا لێى ڕازى بێ) : (انه خلق كل انسان من بنى ادم على ستين و ثلاثمئة مفصل، فمن كبر الله عز وجل وهلل الله وسبح الله واستغفر الله ، وحرك حجراً عن طريق ، او حمله او عظماً ، أو امر بالمعروف ونهى عن المنكر عدد الستين وثلاثمئة السلامى ، يمشى يومئذ وقد زحزح نفسه عن النار) واتە : (خوداى گەورە هەموو مرۆڤێكى لە نە وەى ئادەم لەسە ر سێ سەدو شەست جومگە دروست كردوە، جا هەريەكێ بە قەدەر ژمارەى سێ سەد و شەست ئێسكەكە (الله اكبر)

و (لا اله الا الله) و (سبحان الله) و (استغفر الله) ی کردو، بەردێکی لەسەر ڕێگەی لابرد یاخود ئێسکێکی لادا لەسەر ڕێگە، یاخود فەرمانی بەچاکە کردو قەدەغەی خراپەی کرد، ئەوا ئەو ڕۆژە ئەو کەسە دەرواو خۆشی لە ئاگری دۆزەخ رزگار کردووە).

لە ریوایەتێکی دیکە دەفەرمووێت : (فعليه ان يتصدق عن كل مفصل منه صدقه) . واتە : (جا پێویستە لەسەر ی لەبەرامبەر هەرجومگەیەك خێرو سەدەقەیەك بکات).

وە لە ڕیوایەتێکی دا دەفەرمووێت : (فعليه لكل عظم منها في كل يوم صدقة) واتە : (پێویستە لە بەرامبەر هەر ئێسکێك دا لە هەموو ڕۆژێك سەدەقەیەك بکات) . (رواه مسلم).

(السلامى) ش : واتە ئێسکەکانی لەش و جومگەکانی. دەبێ کێ لە زەمانی پێغەمبەر (ص) دا ژمارەی ئێسك و جومگەکانی بە ئەو ڕاگەیاندبێت؟

# مرۆڤ بە باشترین شێوە خولقێنراوە

لە سورەتی (التين) دا ئایەتێك وەکو وەڵامدانەوەی سوێندێك هاتووە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ* ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ* إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ (التين ٤-٦) واتە : (بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین و ڕێك و پێك ترین شێوەدا دروست کردوە لە هەموو ڕوویەکەوە* سەرەنجام دەیخەینە نزمترینی شوێنە نزمەکانەوە* جگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە پاداشتی هەمیشە و نەبڕاوە بۆیان ئامادەیە).

بەڕاستی خودای گەورە هەموو شتێکی بە وردەکاری دروست کردوە، تۆ ﴿ا مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ﴾ (الملك : ٣) واتە : (لەنێو بەدیهێنراوەکانی ئەو خواییە میهرەبانەدا هیچ ناڕێکی و ناتەواویەك بەدی ناکەیت).ئەمە لەڕووی دروستی و تەواوی درووست کراوەکانی ، لەگەڵ ئەوەشدا خودای گەورە لەو ئایەتەو هەندێ ئایەتی دیکە دا مرۆڤی تایبەت کردوە بەجوانی و دروستی پێکهاتە :: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ (الانفطار : ٨)

واتە : (لەهەر شێوە و شێوازێکدا کە ویستوویەتی تۆی ڕێکخستوە و ئەندامەکانتی بەیەکەوە لکاندوە). بەباشترین ئەندازەو شێوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (التين :٤).

**واتە : (بەراستی ئێمە مرۆڤمان لە جوانترین شێوە و ڕێك و پێك ترین شێوازدا دروست کردوە لەهەموو ڕوویەکەوە). بەجوانی و هاوسەنگی : ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الانفطار : ٧)**

**واتە : (ئەو پەروەردگارە تۆی دروست کردوە بەرێك و پێك ترین شێوە ، بەجوانترین شێواز ، ئەندامەکان هەمور لەشوێنی تایبەتی خۆیاندا دانراون کە بتوانن کارو فەرمانی خۆیان بەچاکی ئەنجام بدەن).**

ئەمەش فەزلی چاودێریکردنی ئەو مرۆڤە ڕێز لێگیراوەیە، ئاماژەیەکیشە بۆ ئەوەی کە ئەو مرۆڤە پلەو پایەکی لەلایەن خودای گەورە وە هەیەو هەروەها قورسایەکی لە سیستەمی ئەم بوونەوەردا هەیە.

* جا ئەو مرۆڤە کە ئالۆزترین ئامێرە لەو بوونەوەردا ، لەخانەکانی و لەشانەکانی ، لە ئەندامەکانی و کۆ ئەندامەکانیو وردەکاری و ڕێك پێکی کە زاناترینی زانایان لەبارەی تێگەیشتن لە بونیادو ڕێگەی کارکردنی ، دەستە وەستان دەکات.

* لەو مرۆڤەدا دەروونێك هەیە کە هەستو سۆزەکانی تێدا کۆ دەبێتەوە، هەوەس و بەهاکان ، پێداویستیەکان و پرەنسیپەکانی تێد ا جێگیر بووەکە شارەزاترینی زانایانی دەروونناسی لە دەرککردن بە تایبەتمەندیەکانی دەستەوەستان دەبن .

* هەروەها لە مرۆڤدا ئەقل و، پرەنسیپەکان و ، هێزی دە رك کردن و ، شیکارکردن و ، داهێنان کاری هەیە، کە شیاوی ئەوی هەیە ببێتە گەورەی بەدیهێنراوەکان ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسراء : ٧٠)

**واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گر تووە).**

ئاشکراو روونە مرۆڤ بەباشترین شێوە دروست کراوە ، کۆ ئەندامی بەرگریی وەرگیراو، یاخود هێڵی بەرگری سێیە لە ناو لەشی مرۆڤدا.

بێگومان خودای گەورە مرۆڤی تایبەتمەد کردووە بە کۆئەندامێکی بەرگری یەکجار ورد کە بریتین لە مانە:

(پێست) بریتی یە لە قەڵغانێکی فراوان کە لەشی مرۆڤی داپۆشیوە، میکرۆبەکان و، پەتاکانی لێ لێ قەدەغە دەکات ، ئەمە هێڵی بەرگری یەکەمینە، خودای گەورەو کارلەجێ هەمور ئەندامێك و هەمور کۆ ئەندامێك و هەمور هەستەوەرێکی مرۆڤی بە کۆ ئەندامێکی بەر گری تایبەتمەند کردووە.

بۆ نموونە چاوەکان، برژانگ و پێلوو ، فرمێسکیان پێ تایبەتکراوە ، ئەو کۆ ئەندامە تایبەتەش بریتی لە هێڵی (بەرگری دووەم).

هەرچی هێڵی (بەرگری سێ یەمە) : بریتی یە لە خوێن و سوپاکەی لە خرۆکە سپی یەکان، ژمارەی ئەو خرۆکە سپیانەی کە سوپای هێڵی بە رگری سێ یەمە (بیست و پێنج ملیۆن) خرۆکەیە لەکاتی لەش ساغی دا، ئەو ژمارەیە لەحاڵەتی نا ئاسایی د ا زیاد دەکات ، لەکاتی جەنگ کردندا دەگاتە سەدان ملیۆن، ئەمەش لە ماوەیەکی ئەوتۆ دا کە لە چەند کاتژمێرێکدا یاخود چەند رۆژێکدا تێپەرناکات، ئەو سوپا زۆرەی خرۆکە سپی یەکان چەکی ئاماژەکردنیان هەیە کە لە چەند ماددەیەکی کیمیاوی پێکهاتووە کە بە هۆکاری پەیوەندی کردن و لە یەکتر گەیشتن لە نێوانیاندا دادەنرێت.

بەڵام ئەخشەی نامێری بەرگری لە بەرگری کردنی لەشدا وردەکارو هەماهەنگ و کاریگەرو زیرەکی لەرادەبەدەر ، بەشێوەیەك کە بڕواپێکردنی ئەستەمە، کوڕی شیرینم ئەمەشیان خرۆکە سپیەکانە وەکو هەندێ لە زانایان دەڵێن - جا ئەمە چ لە سیستەمی کارکردنی بێ ، یا لە دابەشکردنی ڕۆڵە کوشتارییەکان بەسەر تاکەکانی بێ، یانیش لەجێ بەجێ کردنی ئەو چالاکیانە بێ کە پێ ی سپێردراوە ،ئینجا لەدوای چەند چرکەیەکی کەم لەپاش ئەوەی هەر تەنێکی نامۆ کە هێڵەکانی بەرگری یەکەم و دووەم دەبڕێت، ئەو خرۆکە سپیانە روو لەو تەنە نامۆیە دەکەن ، لەو خرۆکە سپیانە ش هەیانە کاریان تەنیا بردنی شیفرەی کیمیاوی تایبەت بەو دوژمنەوەو پارێزگاری کردنێتی ، پاشان گواستنەوەی بۆ ناوەندە لیمفاویەکان ، لە وێدا خانە پارێزراوەکان هەڵدەستن بە شەن و کەوکردنی هێماکانی ئەو شیفرەیە وەکو رێ خۆشکردنێك بۆ دروست کردنی سیرەمی دژ بەو تەنە .

لەدوای د روستکردنی ئەو دژە تەنە، خانە جەنگاوەرەکان کە ئەو چەکەیان هەڵگرتووە کە بریتی یە سیرەمەکە، ڕوو دەکەنە ئەوتەنە نامۆیە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەری، لەدوای ئەوەی کە بەو چەکە کارایە بەسەری دا زاڵ دەبن، خانەکانی (ماشینەوە) دێن بۆ ئەوەی گۆڕەپانی جەنگەکە لە پاشماوەی لاشەی دوژمنەکان خاوێن بکەنەوە، بۆئەوەی خوێنەکە وەکو جاران پاك و ساغ ببێتەوە، ئەو خرۆکە سپیانە کە ڕەگەزی بنەرەتینە لەکۆئەندامی بەرگری تیرەکەیان لە پازدە میکرۆن تێپەرناکات، خودای گەورەش راستی فەرمووە کە دەفەرموێت : ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (التين : ٤).

# دڵ



دڵ لەنێو لەشدا یەکێکە لە سەرسوڕهێنەرترین بەدیهێنراوەکانی خودا، کە بریتی یە لە ترومپایەکی دوولایەنە، کە پاڵ بە خوێنەوە دەنێ کە خۆراکی هەڵگرتووە، لەگەڵ سووتەمەنی بۆ هەموو خانە و شانە و ئەندام و کۆ ئەندامەکان، لەڕێگەی تۆڕێك لە دەمار کە درێژییەکەی لە سەدو پەنجا مەتر تێپەڕدەکات، ئەو دڵە هەر لە مانگی دووەمی کۆرپەلە دەست بەکارکردن دەکات، هەتا کاتی وەستانی دێت کەخودای گەورە بۆی داناوە ، ئەبێ ئاگادەبێ و ئەلەکار دەکەوێ، ئە لە یاد دەکات و ئەهەڵە دەکات ، ئەبێزاردەبێ و ئەئارەزەیی دەردەبڕێ ، بەبێ پشودان و پێداچوونەوە ، بێ چاك کردنەوەو بێ ئاراستە کردن کاردەکات! ...

دڵ بنچینەی ژیانی مرۆڤە، خۆری جیهانەکەیەتی، لەهەمووکاروبارەکانیدا پشتی پێ دەبەستێتو هەموو هێزو جولانەوەکانی لەوییەوە سەرچاوە دەگرێ ... ئامێرێکی نا ئاساییە!... ماندوبوون نازانێ چیە، بۆ ڕووبەرو بونەوەی حالەتی لەناکاو تواناکەی چەندان جار زیاد دەکات ، دڵ یەکێکە لە ئاڵۆزترین ماسولکەکان لە رووی دروست بوون و کارکردن و جێ بەجێ کردنەوە، هەروەها لە پتەوی و بەهێزیەکەی دا، لە خولەکێك دا هەشتا جار گرژو خاو دەبێتەوە، لەماندوبوونی لەناکاودا لێدانی دەگاتە سەدو هەشتا جار لێدان، دڵ لە ڕۆژێکدا (هەشت هەزار لیتر) خوێن پاڵ پێوە دەنێ، کە دەکاتە هەشت مەتر سێ جا خوێن، هەروەها بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ دڵ ئەوەندە خوێن پاڵ پێوە دەنێ کە بایی ئەوە دەکات، کۆگەیەکی بەقەدەر یەکێ لە گەورەترین هەوربڕەکانی دونیا پڕ بکات...

هەروەها دڵ تەنیاو سەربەخۆیە و سەربە کۆئەندامی دەمار نیە، بۆیە لێدانەکانی لەناوەندی وەبەرهێنانی خۆیەتی فەرمانی بەسەردا دەکرێ و بە هێمای کارەبایی ڕێكو پێك دەخرێت، کەبنچینەی

نەخشەکانیەتی، ماسولکەی دڵ بەرێگەیەکی ناوازە خۆراکی بۆ دێت !!

سەرسورهێنەرترین شت کەتیایدایە ئەو دەرچە توکمانەن کە رێگە بەخوێن دەدەن تەنیا بەیەك ناراستە بڕوا ت، ئەمەش حاڵەتێکی جێگیرە لە نێو ترومپاکاندا. هەتا کاتێك دڵ لەناو قەفەسەکەی خۆیدا کپ دەبێت و لەکارو خەمەکانی پشوو دەدات، ئەوا لاشەیەکی ساردو سڕ لەدوای خۆی بەجێ دێلێت.. پێغەمبەر (ﷺ) ڕاستی گوتوە کە دەفەرموێت: (الا وان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله، واذا فسدت فسد الجسد كله ، الا وهي القلب) . (متفق عليه)

واتە بزانن کە لە ناو لاشەدا پارچە گۆشتێك هەیە ، ئەگەر چاك بوو ئەوا هەموو لەش چاك دەبێت، ئەگەر خەراپ بوو، ئەوا هەموو لەش خەراپ دەبێت، بزانن کە ئەو پارچە گۆشتە دڵە).

# سووڕانەوەی زەوی




خودای گەورە دەفەرموویت :

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل : ٨٨) واتە : **(تۆ کێوەکان دەبینیت وا دەزانیت وەستاون و بێ جوولەن، لەکاتێکدا ئەوانیش وەکو هەور لە جوڵەدان ، ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی هەموو شتێکی بەوپەری ڕێکوپێکی دروستکردووە، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن).**

هەرلە کۆنەوە خەڵك سەرنجی زەوی داوە کە لەژێر پێیان وەستاوە، ئینجا واگومانیان بردووە کەوا زەوی چەقی بوونەوەرەو لە شوێنی خۆی ناجوڵێت. ئەو کەسەی ئەوەی گوتووە زانا (بطلیموس) ە و زۆران کەسیش پشتگیریان لێکرد.

جگە لەو، زانایانی دیکە گوتوویانە: زەوی دەسوڕێتەوە، لەوانە فەیلەسوفی یۆنانی (فیساگۆرس) بەڵام نەیتوانی تیۆرەکەی بسەلمێنێ، هەتا زانای گەردوونناسی ئیتاڵی (گالیلۆ) لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدەهەم هات و تە لیسکۆپێکی گەردوونی دروست کرد تاکو بەهۆیەوە جووڵەی زەوی ببینێ، دواتر گەردووناس (کیبلر) لەسەدەی حەڤدەمی زاینی هات و چەند بەڵگەیەکی زانستیانەی سەبارەت بە سوڕانەوەی زەوی تەواوی تەنەکان و هەسارەکانی ئاسمانی پێشکەش کرد.

چەند ڕاستی یەکی زانستی کە زانایان باسیان کردووە:

* زەوی دوو جوڵەی هەیە : یەکیان بەدەوری خۆی کە تەوەرە خەیاڵیەکەیەتی (واتە ئەو تەوەرەی کە ئێمە بەخەیاڵی دەیکەین) و ئەوەی دیکەشیان بەدەوری خۆردا.

* زەوی لە ماوەی : (٢٣ کاتژمێرو ٥٦ خولەك و ٤،٠٩٦ چرکە) جارێك بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە کە جولەکەی لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵاتە .

* خێرایی سوڕانەوەی زەوی لەناوچەی هێڵی یەکسانی دا (١٦٧٠)ە کم لە کاتژمێرێك، واتە نزیکەی (٤٦٥) مەترە لە چرکەیەکدا، پاشان لەگەڵ هێڵە پانیەکانی سەرەوە خێراییەکەی کەم دەبێتەوە کە دەگاتە (٣١٢) مەتر لە چرکەیەکدا لە لای پلەی (٥٠) ی هێڵەکانی پانیدا وە لە هەردوو جەمسەردا خێراییەکەی بەتەواوی نامێنێ.

* لە سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا سێ دیاردەی گەردوونی لێ بەرهەم دێت :

١- دروست بوون و بەدوا یەك داهاتنی شەو و رۆژ.

٢- جیاوازی کاتەکان لە سەر زەویدا بەپێی هەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونی.

٣- دروست بوونی هێزی دەرپەریوی ناوەندی کە بووەتە هۆی هەڵاوسانی زەوی لە ناوچەی هێڵی یەکسانی دا.

## ڕاڤەی زانستیانە :

بێگومان ئەو سیستەمە خۆرییەی کە ئێمەی تێدا دەژین کە لە یەکەیەکی بینای توکمە پێك دێت کە خۆرو (نۆ) هەسارە بەیەکەوە گرد دەکاتەوە . ئەوەی هەتا ئێستا ناسراوە – هەریەکەکیان لە خولگەیەکی جیاوازدا دەجولێنەوە.

هەسارەی زەوی لە رووی دووری لە خۆرەوە بە سێیەمین هەسارە دادەنرێت سورانەوەکەی بە دەوری خۆردا لەماوەی (سێ سەدو شەست رۆژو چواریەکی رۆژ) دا تەواو دەکات .

* لە ئەنسکۆلۆپیدیای ئەکادیمیەی ئەمریکایی داهاتووە : (زەوی لە ماوەی یەك رۆژدا بە دەوری تەوەرەی خۆیدا دەسوڕێتەوە، لە ماوەی ساڵێکیشدا بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە .... خێراییە ماما ناوەندی یەکەی بەدەوری خۆردا دەگاتە (٣٠ کم لەچرکەیەکدا).

چەندین هەیڤیش بەدەوری هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆردا دەسوڕێنەوە، کە تائێستا (٤٩) چل و نۆ

هەیڤیان لێ ناسراوە ، بەڵام سەبارەت بە هەبوونی هەیڤی دیكە هێشتا نەدۆزراوەتەوە، بەتایبەتی بە دەوری نۆرانۆس و نیبتۆندا، ئەو دوو هەسارەی كە لە هەموو هەسارەكانی دیكە لە خۆرەوە دوورترن.

بەڵام هەیڤی زەوی سوڕانەوەكەی بە دەوریدا لەماوەی (٢٩ رۆژو ١٢ كاتژمێرو ٤٤ خولەك) بە شێوەیەكی پلە پەندی لە قۆناغەكانی یاخود لەشوێنە جیاوازەكانی دا تەواو دەكات.

جا سوڕانەوەی زەوی لە خولگەی خۆیدا بە دەوری خۆردا، شتێك بوو زانستی گەردووناسی هەتا سەدەی شانزەهەم پەی پێ نەبردبوو، كاتێك گەردووناسی پۆڵۆنی (نیقۆلاس) تیۆروانینی خۆی لەبارەی بوونەوەرەوە راگەیاند خۆر چەقەكەیەتی و زەوی و ئەو هەسارانەی كە ئەو كات ناسرا بوون بە دەوری خۆردا دەسووڕێنەوە . لە كاتێكدا لە پێشتر وا باوبوو كە زەوی لەچەقی بوونەوەردا جێگیرە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر قورئانی پیرۆز، ئەوا لەو ئایەتەی خودای گەورە ئەوە بەدی دەكەین كە دەفەرموێت: ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل : ٨٨)

زەوی بە بەدیهێنراوەكانیەوە كە لەسەری دان لەگیاندارو بێ گیان بەهەمان خێرایی دەسووڕێنەوە ، هەر بۆیەش وامەزندە دەكەین كەوا چیاكان جێگیرن، لەكاتێكدا بەهەقیقەت هاوڕێ لەگەڵ زەویدا دەسوڕێنەوە، زانایان نمونەیەكی روونكردنەوەی مەزندەییان بۆ ئەمە هێناوەتەوە، كوڕە شیرینەكەم، ئەگەر ئێمە دووشەمەندفەرمان هێنایە پێش چاوی خۆمان كە لەیەك كات و بەیەك ئاراستە و خێرایی دەردەچن، .. ئەوا ئەگەر سەرنشینی یەكێكیان سەیری سەرنشینی هاوتەریبی خۆی لەسەر شەمەنەفەرەكە ی دیكە بكات، وادەزانێت وەستاوەو ناجولێت، جا جوولەی چیاكانیش لەگەڵ زەویدا هەر بەم شێوەیە .

ئینجا پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی فەرموویەتی: ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل : ٨٨)

كوڕە شیرینەكەم فەرموو لەگەڵ ئەم وێنەدا كەتیایدا ئەستێرەكان لەسەر شێوەی چەند هێڵێك دەبینرێن، هۆیەكەشی جولانەوەو سوڕانەوەی زەویە.

# داماڵینی ڕۆژ



کوری شیرینم زانستی نوێ ئەوەی ئاشکرا کردووە کە شەو زەوی لە هەموو شوێنێك دا دادەپۆشێت، ئەو بە شەی کەوا حاڵەتی ڕۆژی لێ پەیدا دەبێت ئەو بەرگە هەوایەیە کە زەوی داپۆشیوە، وەکوو توێکڵێکی تەنك وایە کە لە پێست دەچێت.

ئەگەر زەوی سوڕایەوە، حاڵەتە تەنکەکەی ڕۆژ دادەماڵدرێت کە بە هۆی شکانەوەی ئەو تیشکانە دروست بووە کە لە خۆرەوە دێن بەسەر ئەو گەردانەی لەناو هەوادا هەن، دەبێتە هۆی دروست بوونی ڕۆژ، جا بەو سوڕانەوەیە داماڵینی ڕۆژ لە شەو دا ڕوودەدات. خودای گەورەش دەفەرموێت : ﴿وَآيَةٌ لَهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾ (يس : ٣٧) واتە : (**هەروەها بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرای تر بۆیان، شەوە کە پۆشاکی ڕووناکی ڕۆژی لەبەر دادەماڵین، بەو هۆیە وە دونیایان لێ تاریك دەبێت**) . بەمەش نیوەی گۆی زەوی دەبێتە تاریکایی و شەوە زەنگ ، لەکاتێکدا نیوەکەی دیکەی دەبێتە ڕۆژو ڕووناك دەبێتەوە، وکو لە وێنەی پێشوو دەبینین.

# کێشکردنی زەوی

خودای گەورە لە سورەتی (المرسلات)دا دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا ۞ أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا﴾ (المرسلات : ٢٥-٢٦) واتە : (**ئایا ئێمە زەویمان نەکردوە بە هۆکاری کۆکردنەوە ۞ بۆ زیندووان و مردووان**).

وشەی (كفاتاً) لەكار (كفت) وەرگیراوە، (كفت یكفت كفتـاً) واتـە : (كێـشی كـردوو گرتـی ، لـە ئامێزی گرت ، جا یەكێ لە سیفەتەكانی زەوی ئەوە یە كێش دەكات و بەخۆیەوە دەگرێت، ئەم ئایەتـە زۆر بەروون و ئاشكرایی ئاماژە بە كێش كردن دەدات، هەرچی شتێك لەسەر ڕووی زەویدا هەیە بۆ خۆی كێش دەكات، لەڕاستیدا وەزنی شتەكان تەنیا هێزی كـێش كردنیانـە بـە رەو زەوی، كێـشی شـتەكان لەگەڵ قەبارەی زەویدا دەگونجێن، جا ئەو شتەی كە لە سەر ڕووی زەوی كێشەكەی سەد كیلۆگرام بێت ، لەسەر ڕووی مانگدا دەبێتە شەش یەكی ئەو كێشە، هەروەها ئەو مرۆڤەی كە لەسەر زەویدا كێشەكەی شەست كیلۆگرامە لەسەر ڕووی هەیڤدا دەبێتە (دە) كیلۆگرام ! كەواتە كێشی شتێك بریتییە لە هێـزی كێش كردنەكەی بۆ زەوی، كێشی شتێك لەسە ر ڕووی هەیڤدا كێشكردنییەتی بەرەو چەقی هەیڤدا.

جا ئەگەر هێزی كێش كردن نەبووایە ژیان چۆن دەبوو؟ ئەگەر هێـزی كـێش كـردن نەبووایـە چـۆن چۆنی ئاو لەسـەر ڕووی زەوی جێگیر دەبوو؟ ئەگەر هێزی كێش كردن نەبووایە چـۆن هەوابـە زەوی یـەوە پەیوەست دەبوو؟ ئەگەر زەوی هەوای بۆ خۆی كێش نەكردبایە ئـەوا هـەوا جـێگیر نـەدەبوو وجوولـەی نەدەما، زەویش دەجولاًیەوە لەگەڵ جوولـەی زەوی، بەوەسـتانی هـەوا شـەپۆلگەلێك لـە رەشـەبایەكان دروست دەبوون كە خێراییەكەیان لە هەزارو شەش سەد كیلۆمەتر لە كاتژمێرێكدا تێپەری دەكرد ، ئەو خێراییەش بەس بوو بۆتەفروو توناكردنی هەموو شتێك لەسەر ڕووی زەوی ..!

چ وای لە هەوا كردوە كە بەزەوی یەوە پەیوەست بێ ؟ بێگومان هێـزی كێـشكردنە .كـێ وای لـە دەریاكان كردوە كە بەهۆی كاری كێشكردنەوە بەزەوی یەوە بلكێن.

بێگومان نەمانی كێش حاڵەتێكە بەرگەی ناگیرێ، خـودای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿أَمَّـن جَعَـلَ الْأَرْضَ قَرَاراً﴾ (النمل :٦١) واتە : **(ئایا كێ وای لە زەوی كردوە جێگیر بێ ....)** خـودا وای لێكـردوە بسوڕێتەوەو لەهەمان كاتیشدا جێگیر بێ ،هەروەها وای لە شتەكانیش كردوە كە لە سەری جـێگیر بـن و، بۆ لای خۆیان كیش بكات، وەزنەكانیش تەنیا هێزێكن بۆ كێـشكردن، ئەگـەر هێـزی كـێش كـردن نەبوایە ژیان دروست و ڕێك پێك نەدەبوو، هەروەها ئەگەر ئەو وەزنانە نەبوونایە ژیان لەسەر ڕووی زەوی دروست و ڕێك پێك نەدەبوو.

هەندێك كەس گومانیان وایە زەوی لە كۆتاییدا مرۆڤەكان بۆ لای خۆی كـێش دەكـات تـاكو ژێـر خاكیان بكات ، بەلاًم خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿أَلَـمْ نَجْعَـلِ الْـأَرْضَ كِفَاتـاً * أَحْيَـاء وَأَمْوَاتـاً﴾ (المرسلات : ٢٥-٢٦) واتە : **(ئایـا ئێمـە زەویمـان نـەكردوە بـە هۆكـاری كۆكردنـەوە بـۆ زینـدوو**

مردووان).

واتە مرۆڤی زیندوش بەهەمان شێوە پەیوەستە بە زەوی یەوە ، بۆ لای ئەو کێش کراوە، وەزنەکەشی هەر بریتی یە لەمە، ئەی مانای چیە کە ئەو مرۆڤە کێشی هەشتا کیلۆگرامە؟ مانای کێشە کە هێزی کێش کردنی بۆ زەوی دەکاتە ئەو ژمارەیە. خودای گەورەش باشتر دەزانێت.

## لەرزینەکانی خاک

خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿وترى الارض هامدة فاذا انزلنا عليها الماء اهتزت وربت وانبتت من كل زوج بهيج﴾ (الحج : ٥) واتە : (تۆ زەویش دەبینیت وشك و برینگە جا کاتێك ئاوی بارانمان بەسەردا باراند دادەچڵەکێت و دەلەرزێت و تۆوەکان چەکەرە دەکەن و رەگ و چڵ دەردەکەن و دەڕوێن، ئەوسا لە هەموو جۆرە گژوگیا و گوڵ و گولزارێکی جوان جووت دەڕوێنێت).



ئەی کوری شیرینم بزانە گەردیلەکانی خاک لەکاتی تێکەلاو بوونی بەئاو دەلەرزێت و گەردەکانی دیاریکراو نیە بۆ ناراستەیەکی دیاریکراو دەجوڵێن ، ئەمەش مانای ئەوەیە زەوی (اهتزت) واتە لەرزی پێکەوت.

کرداری کەڵەکە بوونی ئاو لەنێوان چینەکانی دا لە ئەستووری و قەبارەی گەردیلەیەك زیاتر دەبێت، دوایش لە هەموو گەردیلەکان. ئەمەش مانای (ربت) دەگەیەنێت و هەلاوساوە بۆ خەزنکردنی ئاوی پێویست بۆ زیندوو کردنەوەی زەوی، ئینجا تۆوەکان و ئەوانی دیکەش ئەو ئاوە هەڵدەمژن، کۆرپەڵەکە لە ژێر ڕووی خاکەکە دەڕوێت ئەمەش بە دەرکەوتنی ڕەگۆلکەکان و ڕیشاڵەکان ، بەمەش

مانای ئەوەیە زەوی (انبتت) واتە رووانیدیەتی. پاشان ئەمامە رِوواوەکە لەسەر رِووی خاکەکە بەدیار دەکەوێت و گەورە دەبێت و بەروو بووم دەگرێت کە دەبێتە رزق و رۆزی بۆ بەندەکان، هەموو ئەو بەڵگەو نیشانانە بە پێ ی ریز بەندیەکی تۆکمەو کاتێکی وردو رێك و پێك تەواو دەبن، چونکە ئەمە لە دروست کراوەکانی خودای گەورەیە کە هەموو شتێکی بە وردەکاری و دروستو رێك و پێکی یەوە بەدیهێناوە. ﴿فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الروم : ٥٠)

**واتە : (جا ئیتر سەرنج بدەو تەماشای چەندەها ئاسەواری رەحمەتی خودا بکە چۆن زەوی زیندو دەکاتەوە دوای مردنی، بێگومان ئەو زاتەی کە ئەو کارانە ئەنجام دەدات مردووان زیندوو دەکاتەوە و هەر ئەو زاتە دەسەڵاتی بەسە ر هەموو شتێك دا هەیە).**

## مەدینەی پیرۆز و کۆشکە سپی یە کەی



ئیمامی ئەحمەد دەڵێ : یونس قسەی بۆ کردین، حّماد (واتە ئیبنو سەلەمە)ش قسەی بۆ ئەو کردووە. لەسەعیدی کوڕی جورەیرییە ئەویش لە عەبدوڵلای کوری شەقیقەوە، ئەویش لە میحجەنی کوڕی ئەدرەعەوە، کە پێغەمبەری خودا (ص) گوتاری بۆ خەڵکەکە خوێندەوەو فەرمووی: (یوم الخلاص وما یوم الخلاص یوم الخلاص وما یوم الخلاص یوم الخلاص وما یوم الخلاص) ثلاثاً، فقیل له وما یوم الخلاص ؟ قال (یجیء الدجال فیصعد احداً فینظر المدینة فیقول لاصحابه: أترون

هذا القصر الابيض هذا مسجد احمد، ثم يأتي المدينة فيجد بكل نقب منها ملكاً مصلتاً ، فيأتي سبخة الجرف فيضرب رواقه وثم ترجف المدينة ثلاث رجفات فلا يبقى منافق ولا منافقه ولافاسق ولافاسقة الا خرج اليه فذلك يوم الخلاص) (صحيح لغيره) .

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) سێ جاران فەرمووی دەزانن رۆژی (خلاص) چیە؟ پێیان گوت رۆژی خەلاص چیە؟ فەرمووی: دەجال دێت و دەچێتە سەر چیای ئوحد ئینجا لەوێوە دەروانێتە شاری مەددینەوە جا دەڵێتە هاوەڵەکانی : ئایا ئەو کۆشکە سپی یە دەبینن ئەوە مزگەوتی پێغەمبەرە ، پاشان دەچێتە شاری مەدینە وەو دەبینێ لەسەر هەر ڕێگایەك دا فریشتەیەکی لێ یە و شمشێرێکی دەرکێشراوی لەدەستە ، ئینجا دەچێتە زەویەك کەوا خاکەکەی خوێاویە و بارو بارگەی لێ دەخات پاشان مەدینە سێ جاران دەهەژێتەوە، بەمە هیچ پیاو و ژنێکی دوو ڕوو و فاسیقی تێدا نامێنێتەوە، هەموویان لەو شارە دەردەچن و دێنە لای ئەو، جا ئەمەیە رۆژی (خلاص).

## ڕاڤەی فەرموودەکە :

(صلتاً) واتا شمشێرێکی هەڵکێشراوی لە دەستە . دەڵێن : اصلت السيف ، واتە : شمشێرەکەی لە کالان هێنایە دەرەوە. (نقب) ڕێگایەکە لە نێوان دوو شاخاندا. (السبخة) ئەو خاکەیە کە خوێی بەسەر دا زاڵەو هیچ شتێکی لێ ناڕوێت جگە لە هەندێ درەخت نەبێ . (ترجف) وشەی (الرجف) لە بنچینەدا بە مانای جوولەو تەنگەتاوی دێ. واتا دەلەرزێ و دەشلەژێ. ئیبنو حەجەر لە (الفتح) دا دەڵێ : مەبەست لە (الرجفة) واتا بلاوبوونەوەی هاتنی دەجال و هیچ کەسێك توانای ئەوی نیە ، ئەو کاتە هەرچی مونافیق و فاسیق هەیە خێرا دەچنە لای ، ئەو کاتە ش بە تەواوی بە دیار دە کەوێت کە ئەو نکوولی لە پیسی وئەگریسی خۆی دەکات.

کوڕە شیرینەکەم چاك لەو گوتەیەی دەجال رابمێنێ : (هذا القصر الابيض ، هذا مسجد احمد) واتە: (ئەو کۆشکە سپی یە ، مزگەوتی پێغەمبەرە) پاشان لە وێنەی مزگەوتی پێغەمبەریش ڕابمێنە کە لە ڕێگەی مانگە دەستکردەکانەوە وێنەی گیراوە، بێگومان وەسفی سپیێتی بەڕاستی لێ ی هاتۆتەجێ . لەمە ڕابمێنە و پاشان لە دڵی خۆتدا بڵێ : (خۆم بەخودا دەپارێزم لە شەڕو خراپەکاری فیتنەی مەسیحی دەجال).

# ئاسن



كانزای ئاسن لە بۆشایی دەرەوە هەناردراپتە خوارەوە، خودای گەورە دەفەرموویت : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (الحديد: ٢٥)

**واتە: (ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشكراوە و وێڕای ئەوان، كتێب و هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردە خوار، هەتا خەڵك بێ جیاوازی لەناو یەكا ڕەفتار بكەن. ئاسنیشمان ناردۆتە خوار كە هێزی بڕشتی زۆرە و زۆر بەهرەی بۆ مەردووم تێدایەو، تا خودا بۆخۆی بزانێ كێ لە نادیار دێتە یاری خۆی و پێغەمبەرەكانی. دیارە خودا خاوەنی هێزو دەسەڵاتە)**. كوڕی شێرینم لە زانایانی ڕاڤەی قورئانەوە — ڕەحمەتی خوایان لێ بێ — لە ڕاڤەی ئەو ئایەتەوە گواستراوەتەوە : كەوا ئاسن لە ئاسمانەوە هەناردراوەتەوە خوارەوە. وە ئەم ئایەتە پیرۆزەشیان كردۆتە بەڵگەی قسەكەیان. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان ئەوەیان لانەبوو كە ناودەبرێ بە زانستە تازەكان یاخود ئامێرە پێشكەوتووەكان..

## چەند هەقیقەتێكی زانستی:-

١-زانایانی جیۆلۆجیا ئاشكرایان كردووە كە (٣٥ ٪)ی پێكهاتووەكانی زەوی ئاسنە.

٢-ئاسن لە هەموو كانزاكانی دیكە جێگیرترە و چڕییەكەی دەگاتە (٧٨٧٤) كگم/ م٣ بەمەش پارێزگاری لەهاوسەنگی زەوی دەكات.

٣- ئاسن بە بەرزترین تایبەتمەندی موگناتیسی جیا دەكرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی پارێزگاری لە

كێشكردنی زەوی بكات.

٤- سەرچاوەی ئاسن لە پاشماوەی ئەستێرەی كشاوو نەیزەكەكانە، كە لە بۆشایی دەرەوە دەكەونە سەر هەسارەی زەوی، بە شێوەیەك كە بە هەزاران نەیزەك دەكەونە خوارەوە كێشی هەندێكیان دەیەها تەنە، هەندێك لەوانە لە ئوستراليا و ئەمریكا دۆزراونەتەوە.

* یەك گەردیلە لە كانزای ئاسن دروست نابێ و پێك نایەت، مەگەر بە وزەیەكی یەكجار زۆر نەبێت، كە ئەم وزەیە چوار هێندە لە سەرووی تێكڕای وزەی خۆر دەبێ.

## ڕاڤەی زانستیاكان:

خودای گەورە دەفەرموێت ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (الحديد: ٢٥) بێگومان قورئان لەو ئایەتەدا پێ دادەگرێ لەسەر ئەوەی كانزای ئاسن لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە، پێشتر لەسەر هەسارەی زەوی بوونی نەبووە. زانایانی ڕاڤەی قورئان باسی ئەو هەقیقەتە زانستی یەیان كردووە، هەروەك چۆن باسی توانای ئاسن و سوودەكانی كردووە. بەڵام هەرچی زانستە ئەم هەقیقەتەی پێ نەگەیشت بوو تەنیا لە سەرەتای شەستەكان نەبێ، كاتێك زانایانی بۆشایی ئاسمان، دیتیان سەرچاوەی كانزای ئاسن لەسەر هەسارەی زەوی نیە، بەڵكو لە بۆشایی دەرەوەی زەوییە. هەروەها لێرەدا لە پاشماوەی نەیزەكەكانە بەرگەهەوای زەوی هەندێكیان بۆ خۆڵەمێش دەگۆڕێت، كاتێك دێنە ناو سنووری زەوی، هەندێكیشیان لەسەر شێوە و قەبارەی جیاواز دەكەونە خوارەوە. لەو دواییەدا زانایانی بۆشایی ئاسمان ئاشكرایان كرد كە ڕەگەزی ئاسن ناتوانێ لەناو كۆمەڵەی خۆردا دروست بێت، چونكە خۆر خۆی ئەستێرەیەكە خاوەن گەرمی و وزەیەكی ئەوتۆیە كەوا بەس نیە بۆ پێكەوەنانی توخمی ئاسن، ئەمەش پاڵی بە زاناكانەوە نا كە بڵێن كانزای ئاسن لە دەرەوەی كۆمەڵەی خۆری ئێمە پێكهاتووە، پاشان لە ڕێگەی ئەستێرە كشاوەكان و نەیزەكەكانەوە دابەزیوەتە سەر زەوی. ئێستا زانایانی گەردوونناسی لەو باوەڕەدان كە نەیزەكەكان بریتین لە دەرهاوێشتەی گەردوونیی كە گەردیلەی قەبارە جیاوازن و لەكانزای ئاسن و هیدیكەش پێك هاتوون، هەر بۆیەشە كانزای ئاسن یەكەمین كانزا بووە كە مرۆڤ لەسەر ڕوی زەوی ئاسیویەتی، چونكە بە شێوەیەكی پاك و خاوێن لەسەر شێوەی نەیزەكەكان لە ئاسمانەوە دەكەوێتە خوارەوە.

((ئارسەر پێرز)) لە كتێبەكەی بە ناوی (زەوی) دەڵێ : نەیزەكەكان بە گشتی دەكرێن بە سێ بەش:

١- نەیزەكە ئاسنیینەكان : كە لە ٩٨٪ پتری لە ئاسن و نیكل پێكهاتووە.

٢- نەیزەكە بەردینە ئاسنیینەكان : نزیكەی نیوەی لە ئاسن و نیكل و نیوەكەی دیكەشی لە تاوێری ناسراو بە ناوی (نولیفین) پێكهاتووە .

٣- نەیزەكە بەردینەكان: ئەوانەن كە لە بەرد پێكهاتوون، بەردەكانیشی دەكرێن بە چەند جۆرێك.

كوڕە شیرینەكەم لەم توێژینەوە زانستیی یەدا ئەم وەسفە قورئانیە (أنزلنا الحديد) روون دەبێتەوە. بەڵام دەبێ (بأس الشديد) چی بێ؟ ئەو سوودانەش چین كە قورئان ئاماژەی پێداون كە دەفەرموێت : (فيه بأسٌ شديد ومنافع للناس)؟ زانایانی كیمیا دۆزیانەوە كە كانزای ئاسن لە هەموو كانزاكانی دیكە جێگیرترن، زانست هەتا ئێستاش نەگەیشتۆتە ئەوەی كانزایەكی دیكە بدۆزێتەوە كە تایبەتمەندیەكانی ئاسنی هەبێ لە بەهێزی و توندیو جیڕی و بەرگە گرتنی بەرامبەر پاڵەپەستۆ.

هەروەها لە هەموو كانزاكانی دیكە چڕی زیاترە، بە شێوەیەك كە بڕی چڕیەكەی دەگاتە (٧٨٧٤ كگم/م٣) ئەمەش سوودی بۆ زەوی هەیە لە پارێزگاری كردنی هاوسەنگیەكەی.

هەروەك چۆن كانزای ئاسن (٣٥٪)ی پێكهاتەی زەوی پێكدەهێنێ، لە هەموو توخمەكان موگناتیسی ترە،ئەمەش بۆ پاراستنی كێشكردنەكەی زەوی.

لەواقیعدا مرۆڤ گرنگی ئاسنی لە ڕووی پیشەسازیەوە هەتا سەدەی هەژدەم بۆ بەدیار نەكەوت، واتە دوازدە سەدە دوای دابەزینی قورئان، بەشێوەیەك لەناكاوێكدا جیهان ڕووی لە پیشەسازی ئاسن كرد و ئاسانترین هۆكاری بۆ دەرهێنانی دۆزیەوە. ئێستا ئاسن وەكو بناغەیەك چۆتە نێو سەرجەم بوارەكانی پیشەسازیەوە، بەڵكو بۆتە بەردی بناغە لە هەموو بەكارهێنانەكانی مرۆڤ، ئەوەتا وەكو گونجاوترین كانزا لە پیشەسازی، چەك و بناغەیەك بۆ سەرجەم پیشەسازیە قورس و سووكەكان بەكار دێت. وە دەبێ ئەوەش باس بكەین، ئاسن توخمێكی بنەڕەتی پێكدێنێ لە نێو زۆرێك لە بوونەوەرە زیندووەكان دا، هەروەها لە بونیادی ئەو ڕووەكانەی كە پێكهاتەكانی لە نێو زەویەوە هەڵدەمژێت، هەروەها لە نێو هیمۆگلۆبینی نێو خانەكانی خوێنی مرۆڤ و گیانلەبەریشدا هەیە. ئەمە كاری خودای پەروەردگاری بەدیهێنەری بوونەوەرەكانە كەلە كتێبەكە پیرۆزەكەیدا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (الحديد: ٢٥).

# نهێنی چیاکان



خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ (فاطر:لە ئایەتی٢٧)

واتە : (هەروەها هەندێ لە کەژ و کێوەکانمان بە زنجیرە کێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشیانە ڕەشێکی تاریك و تۆخە).

کوڕی شیرینم بزانە چیاکان بارستە گەلێکی پێکهاتووی مەزنن، لە بەردەکان و تاوێرەکان لەسەر پارچەیەکی زۆر گەورە بەدی دەکرێن لەسەر ڕووی زەوی، کە لە هەمان مادده پێکدێن. جا بارستاییەکی مەزن لە تاوێرە بەردەکان لەسەر بارستەیەکی دیکە وەستاوە کە ئەویش ڕووی زەویە .. ئەمە هەر ئەوەندەیەکە خەڵك دەربارەی چیاکان دەزانن.

بەڵام کاتێك مرۆڤ لە ڕوانینی خۆی قووڵ بۆووە ئەوەی ژێر ئەو چینانە و، ئەوەی ژێرپێیەکانی خۆی دیت و، ئەو چینانەی ئاشکراکرد کە زەوی لێیان دروست بووە. دیتی چیاکان چینی یەکەمینی زەوی دەبڕن کە بەرزیەکەی دەگاتە پەنجا کیلۆمەتر لە تاشەبەردەکان کە بریتی یە لە توێکڵی زەوی.... ئەو چینە دەبڕێت بۆ ئەوەی ڕەگێکی بۆ چینی دووەم درێژ بکاتەوە کە چینێکی بزواوە لە ژێر زەویەکەی نێمەدایە. ئەمەش چینێکی دیکەیە دەجوولێ بەڵام خودای گەورە ئەو زەویەی لەسەر ئەو چینە جولاوە بە چیا گەلێك جێگیر کردووە کە هەردوو چینەکەی زەوی دەبڕن هەروەکوو چۆن مێخەکان ڕەشماڵ لە سەر زەوی ڕاگیر دەکەن، ئا بەم شێوەیە کوڕی شیرینم لەژێر هەر چیایەکدا ڕەگێکیان بەدی کردووە...

لێکۆڵەران و توێژەران تووشی سەرسامیەکی زۆر گەورە هاتن، کاتێك دیتیان ئەو شتانە لە پێشدا لە کتێبی خودا تۆمار کراوە، وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً ﴾ (النبأ:٧)

**واتە: (کێوەکانمان وەکو مێخ بۆ دانەکوتاون؟).**

هەروەها دەفەرمووێت ﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾ (النازعات: ٣٢).

**واتە: (کێوەکانیشی بۆ تۆکمەیی دامەزراندووە).**

هەروەها دەفەرمووێت ﴿ وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ ﴾ (لقمان : ١٠)

**واتە: (لە زەویشدا کێوەکانی دامەزراندووە، لەنگەری زەویان ڕاگرتووە، نەوەکو ژێر و ژوور بێن و لاربینەوە).**

ئا بەم شێوەیە زاناکان دوابەدوای ئەمە کەوتنە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە بە بەکارهێنانی ئامێری (سیزمۆگراف) جا ئەمانەی خوارەوەیان بۆ ڕوون بوویەوە:

١- کێوەکان ڕەگێکیان هەیە کە لە ژێر ڕووی زەوی درێژ دەبێتەوە کە دەگاتە (٤/٥) هێندەی بەرزیەکەی لەسەر ڕووی زەوی.

٢- کارو فەرمانی ڕاگیرکردنی زەوی و پاراستنی هاوسەنگیەکەیەتی.

ئەم نهێنیە کوڕی شیرینم توێژەرەکان لێی دڵنیا نەبوون، تەنیا لە ساڵی (١٩٥٦ز) نەبێت، وەکو یەکێ لە مامۆستا پسپۆڕەکانی زانستی جیۆلۆجیا باسی کردووە، ئەم نهێنی یە قورئانی پیرۆز بەر لە (هەزار و چوارسەد ساڵ) باسی کردووە. خودای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَاراً وَسُبُلاً لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ (النحل:١٥)

**واتە: (هەر خوا لەسەر ڕووی زەوی چیاکانی چەسپاندووە تا لەنگەری بگرێت و ئێوە نەلەرزێنێت و لارتان نەکات و ژێرە و ژوور نەبن، هەروەها چەم و ڕووبارو ڕێگا و بانی تێدا بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێ دەرکەن و بە مەرامی خۆتان بگەن).**

# چیاکان چۆن دروست بوونە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ﴾ (الحجر:١٩)

**واتە: (زەویشمان ڕاخستووە، چیاو کێوەکانمان لەسەر داناوە، لە هەموو جۆرە ڕووەك و بەروبوومێکمان تێدا ڕواندووە، بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بە ئەندازەی پێویست و دیاری کراو).**

هەروەها خودا دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ﴾ (لقمان : ١٠)

**واتە: (لە زەویشدا کێوەکانی دامەزراندووە کە لەنگەری زەویيان ڕاگرتووە و نەوەکوو ژێر و ژوور بێ و لار ببنەوە، جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەریشی تیادا بڵاو کردۆتەوە).**

کوڕی شیرینم بزانە وشەی (ألقی) ئیعجازێکی قورئانییە. چونکە زانایانی جیۆلۆجیا گوتویانە: بێگومان دروست بونی چیاکان لەسەر ڕووی زەویدا بەرێگەی دەرهاوێشتنەوە بووە، ئۆقیانووس ئەم دەرهاوێشتنەش بە شێوەی جیۆلۆجیاوە بە درێژایی سەدەکان بووە، کە لە خوارەوە بۆ سەردوە بووە ئۆقیانۆس و دەریاکان لەسەر ئاستی قوڵاییان ئەوەی ناویان فڕێداوەتە دەرەوە، ئەمەش بەهۆی بورکانەکان یاخود لە سەرەوە بۆ ژێرەوە بووە، ئەمەش بەهۆی ڕێڕەوی ڕووبارەکان و نیشتە بەردیەکانەوە، یەك لەدوای یەك.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ (الطارق:١١-١٢) واتە: **(هەروەها**

سوێند بە زەوی کە درزی تێ دەبێت بەهۆی ڕووەکەوە).
جوولەی چینەکانی زەوی کە لە ژێر توێکڵەکەیدا هەن، پاڵەپەستۆیەکی یەکجار گەورەی لە خوارەوە بۆ سەرەوە دروست کردوە و لە ئەنجامی ئەو پاڵەپەستۆیەش چیا و کێوەکان دروست بووینە.

بێگومان لە ڕووی زانستی یەوە سەلماوە چیاکان نزیکەی چوار جارو نیو هەندی خۆی لەناو چینەکانی ژێرەوەی زەویدا درێژ بۆتەوە. ئەمە زانای ئەڵمانی (الفریدکرۆنز) زانایەکی جیۆلۆجی گەورەیە باسی کردووە، بەڵام ئەو یەکێ بوو لە گەورەترین مولحیدەکان.. لەکاتی سەردانی بۆ زانکۆی (شا عبدالعزیز) گفتوگۆی لەگەڵ زاناکانی ئەوێ، پێی گوترا: موحەمەد(ﷺ) ئەو هەموو زانست و زانیاریەی لەکوێ بوو؟ لە وەڵامدا گوتی: (دەبێ لە سەرووتر لە سەرەوە بۆی هاتبێ).

زەوی خاوەن درز:

خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ (الطارق:١٢) واتە: (سوێند بەو زەمینەی کە زۆر درزوو کەلێنی هەن) ئەم ئایەتە لە شێوەی سوێند خواردنەوە هاتووە، خوای مەزنیش زۆر لەوە بەرز و گەورەترە پێویستی بەوە هەبێت سوێند بخوات، کەواتە ئەی کوڕی شیرینم تێدەگەین ئەم سوێندە ئاماژەیەکە بە گرنگی و پڕبایەخی ئەو شتە کە خودای گەورە سوێندی پێ دەخوات، ئێمە لە سۆنگەی ئەم ئایەتەوە دەپرسین، دەبێ گرنگی و بایەخی هەبوونی درز و کەلێن لە نێو گۆی زەویەکەمان چی بێت؟

بێگومان ڕاڤەکارانی قورئان هەر لەکۆنەوە لەم ئایەتە دواون و گوتویانە: ئەو درز و کەلێنانەی کە لە خاکی زەوی لە دوای ئاودانێکی چاك دروست دەبێ، بۆ ئەوەیە تاکو ڕێگەیەکی ئارام بدۆزێتەوە بۆ دەرچوونی کۆپکە سەوزە نەرم و نۆڵەکان لە زەویدا، لەدوای ئەوەی لەناو زەویەکەدا لە تۆوەکانیان دێنە دەرەوە.. بێگومان ڕاڤەکاران هەڵەیان نەکردووە لەوەی کە تۆ کاتێك تۆوێك لە زەویدا دەچینیت و ئاوێکی باشی دەدەیت، تۆوەکە دەست بە شین بوون دەکات، کۆپکەکەش دەست بە ڕێ کردنەوەو هەڵکشان بەناو خاکەکە دەکات بۆ ئەوەی گەشە بکات و هەراش ببێ، هەتا ببێتە ڕوەکێکی تەواوی پێگەیشتوو گوڵی جوان بگرێت یا میوەی خۆش و بەتام بگرێت، یا ببێتە درەختێکی جوان و ڕازاوە.. ئەم هەڵکشانەش لە میانەی درزو کەلێنی بچوکەوە ڕوو دەدات کە لەناو خاکەکەدا بەهۆی ئەو هەڵاوسانەوە ڕوودەدات، کە لە ئەنجامی ئاوێتەبونی ئاوو خۆڵ، ئینجا خوار و خێچیەکەی بۆ سەرەوە دروست دەبێت هەتا دەبێتە خاکێکی نەرم و شل و درزو کەلێنی لێ دروست دەبێت.

هەروەها درزو كەلێنەكان لە ناو قوڵایی زەریاكانیشدا هەنە، بەڵام زانایانی جیۆلۆجیا بەو دوایيە شتێكی دیكەیان دۆزیەوە، ئەویش ئەوەبوو كە چینی تاوێرەبەردینی دەرەكی گۆی زەوی كە ناسراوە بە (لیسوسفیر) كە ئەستوورییەكەی لەناو قوڵایی زەریاكاندا دەگاتە نزیكەی (٦٥-٧٠كم) و لەژێر كیشوەرەكاندا نزیكەی (١٠٠-١٥٠كم)ە، بە تۆڕێك لە درز و كەلێنی قوڵ بۆ دوازدە چینی ڕەق دابەشكراوە، سەرەڕای هەبوونی چەندین چینی بچوك بچوك كە ناودەبرێن بە (چینگەلۆچكە)، ئەو چینانە دەنیشنە سەر چینێكی پلاستیكی نیمچە تواوە كە ناسراوە بە (ئیسنوسفیر) واتە چینێكی لاواز، كە بە ئازادی بەرەو یەكتر یا دووركەوتنەوە لە یەكتر یا بەرەو جیابوونەوە لەیەكتر دەجوڵێنەوە. ئەو درزو كەلێنانە كیشوەریەكانیان دروست كردووە:

بێگومان كرداری لە یەكتر جیابوونەوە و لەیەكتر نزیك بوونەوە زێدەڕۆیی كردنی چینەكانی (لیسوسفیر) تەنیا لەناو قوڵایی ئۆقیانوسەكاندا ڕوو نادات، بەڵكو بە هەمان شێوە ش لە كەنارو نێوان و ناو كێشوەرەكانیش ڕوودەدات، هەر بۆ نمونە درز و كەلێنی دەریای سور ساڵانە بە ڕێژەی (٣سم) فراوان دەبێت و درز و كەلێنی كەنداوی كالیفۆرنیا ساڵانە (٦سم) فراوان دەبێت، هەروەها بەریەك كەوتنی چینی (هیندی) لەگەڵ چینی (یۆرۆئاسیوی) لە دوای ئەوەی كە چینی (موحیطي) كە كەوتبووە نێوانیان دایان ئاشی، بووە هۆی دروست بوونی زنجیرەشاخی (هیمالایا) كە بە بەرزترین لوتكە دادەنرێت لە سەر رووی زەوی.

## ئەگەر ئەو درز و كەلێنانە نەبوونایە ژیان ئەستەم دەبوو:

كوڕی شیرینم هەر لە میانەی شرۆڤەی پێشوودا، دەگەینە ئەو ئەنجامی كە ئەو تۆڕە مەزنە لە سیستەمەكانی درز و كەلێنەكان، كە بەدرێژایی هەزاران كیلۆمەتر لە هەموو ئاراستەكان دەوری گۆی زەویان گرتووە بوونەتە هۆی پارچە پارچە بوونی (لیسوسفیر) بۆ چین گەلی گەورە و مام ناوەندی و بچووك، لەگەڵ هەبوونی چینۆچكە و پاشماوەی چینەكان، كە بە دریارترین نیشانەكانی گۆی زەوی دادەنرێت، بەبێ ئەو چینانە گۆی زەویمان نەیدەتوانی ببێتە جێگەی دانیشتوان، هۆیەكەشی ئەوەیە كە ئەو درز و كەلێنانە لە ڕابردوودا و هەتا ئێستاش هۆیەك بوونە بۆ هەڵمژینی گازەكان لە بەرگەهەواو بەرگە ئاوی گۆی زەوی، هەروەك چۆن هۆیەكیش بوونە لە دروست بوونی كیشوەرەكان و تێكشكانیان و دروست بوونی چیاكان و بە پیت كردنی توێكڵی زەوی بە كانزا گەلێكی تازە بە شێوەیەكی ڕێك و پێك،

لە جولانی چینەكانی (لیسوسفیر)یش دەبنە هۆی بەرهەڵابونی پلەی گەرمی قەتیس بووی ناوەوەی گۆی زەوی بە شێوەیەكی پلەدار، دەبێ چ هەقیقەتێك لەمە چەسپاوتربێت... كە بە ئەوپەڕی زیندەگی دادەنرێت لە پێناو هەبوونی گۆی زەوی و پاشانیش مانەوەی ئێمەلەسەریدا، كەوا بێ جێی خۆیەتی كە لە قورئاندا خودای گەورە وەكو یەكێ لە بەڵگە و نیشانەكان لەسەر بەدیهێنەری خۆی باسی بكات.

كوڕە شیرینەكەم زاناكان ئاوڕیان لەو هەقیقەتە نەدایەوە تەنیا دوای جەنگی جیهانی دووەم نەبێ، بەباشی تێی نەگەیشتن تەنیا دوای شەستەكان و سەرەتای حەفتاكان نەبێ، پاشانیش پێش كەوتنی قورئانی پیرۆز بە زانستێكی دیاری چەسپاوی لەو جۆرە بە زیاتر لە (١٤) سەدە دەبێتە یەكێ لە نیشانەو بەڵگەكان، كە شاهێدی دەدەن لەسەر ئەوەی سەرچاوەی ئەو كتێبە لە لایەن خوداوەیە، شاهێدیش دەدەن كە پێغەمبەرێتی گەورەمان موحەمەد (ﷺ) ڕاست و دروستە.

## پەیوەندی ئاو بە ڕەنگی تاوێرەكانەوە



لەو ئایەتە ئیعجازە زانستیانەی پەیوەندیان بە ئاوەوە هەیە، ئەوەیە كە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ۞ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر:٢٧-٢٨)

واتە: (ئایا سەرنجت نەداوە كە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە

**جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێنا، هەروەها هەندێ لە كەژوكێوەكانمان بە زنجیرە كێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشیانە بەشێكی تاریك و تۆخە هەروەها بەو شێوەیە لە خەڵكیش، لە گیانداران و ماڵاتیش، جۆرەها ڕەنگ و قەبارەی جیاواز هەیە، بە ڕاستی هەر زاناكان پەی بەو نهێنیانە دەبەن و لە ناو بەندەكانی خودا هەر ئەوان لە خواترسن، بەڕاستی ئەو خوایە زۆر باڵا دەستە و زۆریش لێخۆشبووە).**

بێگومان لە سێ شوێنان لەو ئایەتانەدا جیاوازی ڕەنگەكان هاتووە، زاناكانیش توێژینەوەیەكی زانستیانەی درێژیان باسكردووە كە پوختەكەی ئەوەیە:- بێگومان ڕەنگاوڕەنگی تاوێرەكان بەرهەمی ڕەنگاوڕەنگی ئەو كانزایانەن كە تاوێرەكانیان لێ پێكهاتووە، هەروەها ڕەنگاوڕەنگی كانزاكانیش بەرهەمی توخمە پێكهاتەكان و، ژینگەو، كارلێكردنیانە لە ئاودا، جا ئاو فاكتەرێكی یەكلاكەرەوەیە لە ڕەنگ كردنی تاوێرەبەردەكانی چیاكان، بۆیەشە خودای گەورە فەرموویەتی: **(ألم تر أن الله أنزل من السماء ماءً فأخرجنا بة ثمرات مختلفاً ألوانها)**

**واتە: ئایا سەرنجت نەداوە كە بەڕاستی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی جیاوازمان دەرهێناوە).** بێگومان مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ لە هەبوونی پەیوەندی هاتنە خوارەوەی ئاو لە ئاسمانەوە، لەگەڵ جیاوازی ڕەنگەكانی چیاكانەوە، جا لە توێژینەوەیەكی دوور و درێژی زۆر ئاڵۆزدا لە بارەی ئاوەوە، ئەو توخمە زیندووە، كە بە بەرزترین توخمی توێنەرەوە و كاریگەر دادەنرێت، روون بۆتەوە كە ئاو فاكتەرێكی یەكلاكەرەوەیە بۆ ڕەنگكردنی چیاكان، كە ڕەنگەكانی خۆیان لە ڕەنگەكانی كانزاكانەوە وەردەگرن كە لە دروست بونیاندا هاوبەشن، كانزاكانیش بە گوێرەی ئۆكساندنیان ڕەنگەكە وەردەگرن، بە شێوەیەك كە ئاو پەیوەندی بەو ئۆكساندنەوە هەیە، بۆیە دەبینرێ كە یەكێ لە فاكتەری ڕەنگ و جیاوازی ڕەنگەكانیان لەچیای ڕەش و تۆخەكان و چیای چین و هێل سپی و سورور بۆ ئاو دەگەڕێنەوە.

هەر چەندی زانست پێش بكەوێت ئەوا پەردە لەسەر لایەنێكی ئیعجازی زانستیانەی قورئان لادەدات، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاكو بە دڵنیاییەوە بزانین كە ئەو زاتەی قورئانی دابەزاندوە هەر ئەویشە كە بوونەوەرەكانی بەدیهێناوە، ئەو ڕێكەوتنەی لە نێوان ئەوەی كە زانستی تازە دەیڵێت و لەگەڵ ئەو نیگایەی بۆ پێغەمبەر موحەمەد (ص) دابەزیوە بە درێژایی سەدان ساڵ، هەتا بڵێی لۆجیكیانەیە، چونكە ئەو نیگایە گوتەی خودایەو بوونەوەریش بەدیهێنراوی خودایەو، یەكبوونی سەرچاوەش واتە

یەکبووی لقەکان، کەواتە دەبێ ڕێکەوتن هەبێ لە نێوان زانستی هەقیقی و دەقی ڕاست و دروست، کەوا پێویستە بە دڵنیاییەوە بزانین کە ئەو زاتەی بوونەوەرەکانی بەدیهێناوە هەر ئەویشە ئەو قورئانەی دابەزاندووە، خودای گەورە دەفەرموێت: (**ألم ترا أن الله أنزل من السماء ماءً فأخرجنا به ثمرات مختلفاً ألوانها ومن الجبال**) لێرە پەیوەندیەك هەیە. خودا دەفەرموێت: (ومن الجبال جدد بيض و حمرٌ مختلفاً الوانها و غرابيب سودومن الناس والدواب والانعام مختلفٌ الوانه كذلك إنما يخشى الله من عبادة العلماء ان الله عزيزٌ غفور) (إنما) کورت هەڵهێنان و ناچاری دەگەیەنێ، واتە: ئەگەر بەدوای زانست و زانیاریدا نەگەڕێی ئەوا ڕێگای لە خواترسان ناگریتە بەر، کەواتە کوڕی شیرینم ئەگەر گەرەکت بوو بەڕاستی لە خودا بترسی ئەوا ناچار دەبێ بەدوای زانست دا بگەڕێی و فێری بی، چونکە خودای گەورە دەفەرموێت: (إنما يخشى الله من عباده العلماء) واتە: تەنیا زاناکانن کە لە خوا دەترسن، ئەوەك کەسانی دیکە. ئیبنوکەسیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە ڕاڤەی ئەو ئایەتە دا دەڵێ: خودای گەورە وەکو هۆشیارکردنەوەیەك دەفەرموێت لەبارەی تواناداری تەواوی لە بەدیهێنانی شتە هەمەجۆر و هەمەڕەنگەکان لە یەك شتدا، کە ئەویش ئەو ئاوەیە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت، بە هۆیەوە بەوبوومی هەمەجۆر و هەمەڕەنگ لە زەوی دەردێنێ، لە ڕەنگی زەرد و سوور و سەوز و سپی، ئەمانە بریتین لە ڕەنگی بەروبوومەکان هەروەکوو چۆن هەمەجۆری ڕەنگەکان و تامەکان و بۆنەکانیان بە چاوی خۆمان دەبینین، هەروەکو لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿**وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ**﴾ (الرعد:٤) واتە: (**لەسەر ڕووکاری زەوی پارچەی جۆراو جۆر هەیە لە پاڵ یەکدا، هەروەها باخی ڕەزی ترێ، کشتوکاڵی هەمەجۆر لە دانەوێڵە و بیستانەکاندا، دار خورمای یەك قەدو دوو قەد، هەموو ئەمانە بەیەك ئاو ئاودێر دەکرێن و لەیەك جۆر ئاو دەخۆنەوە و هەندێکیانمان لە هەندێکی تر بۆ خۆراکی ئادەمیزاد پەسەندتر کردووە، بەڕاستی ئا لەو شتانەشدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك عەقڵ و ژیری خۆیان بخەنەکار**).

هەروەها ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (ومن الجبالِ جُددٌ بيض و حُمرٌ مختلفٌ الوانها) واتە چیاکانیشی بە هەمان شێوە بە ڕەنگی جیاواز بەدیهێناوە وەکو دەیبینین، لە ڕەنگی سپی و سوور، لە هەندێکیاندا چەند ڕێچکە و ڕێگایەك هەنە کە ئەوە مانای (جدد) دەگەیەنێ کە ئەویش هەر هەمەڕەنگن، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەفەرموێت: (الجدد) واتە: (ڕێگەکان).. (الغرابيب)

: واته زغبیة: چیای ڕەش.. عەرەب ئەگەر وەسفی ڕەنگی ڕەش بکەن دەڵێن : أسود غربیب .. هەروەها دەفەرمووێت: (ومن الناس والدواب والانعام مختلف الوانه کذالك) واتە: (بەهەمان شێوە گیانلەبەران و مرۆڤ و زیندەوەرانیش ئەوانیش هەمەجۆرن)، جا خەڵکان بەربەرو حەبەشی و تەماتەم و، سەقالیبەیان تێدا هەیەو ڕۆمەکان ڕەنگیان زۆر سپیە، عەرەبیش لە نێوان ڕەش و سپی دان، هیندیەکانیش ڕەنگیان بەلای ڕەشی یە، هەر بۆیەشە خودای گەورە لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرمووێت: ﴿وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢)

**واتە: (جیاوازی زمان و ڕەنگتانە، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ زانایان و شارەزایان).**

بەهەمان شێوەش زیندەوەران و گیانلەبەرانیش ڕەنگیان هەمەجۆرە، هەتا ئەگەر لەیەك ڕەگەزیش دابن، بەڵکو لە یەك جۆریشیان هەمەجۆریان هەیە، بەڵکو لە گیانلەبەرێکیش دا ئەم ڕەنگەیان هەیە و ئەو ڕەنگەیان هەیە، فتبارك الله احسن الخالقین..

# بای پیتێنەر

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ ﴾ (الحجر:٢٢)

**واتە: (ئێمە شنەبامان ناردووە کە پیتێنەری ڕووەك و دار و درەختە، هەروەها بارانمان لە ئاسمانەوە باراندووە و ئێوەی پێ تێراو دەکەین بێ ئەوەی ئێوە ئەو ئاوانەتان زەخیرە کردبێ).**

## ڕاڤەکردنی زمانەوانی:

لە فەرهەنگی (مختار الصحاح) لە ماددەی (لقح)دا هاتووە: لَقَحَ : ألقحَ الفحلُ الناقة والریح السحاب. واتە: نێرە وشترەکە مێیەکەی ئاوس کرد و شنە بایەکەش هەورەکەی ئاوس کرد، (وریاحٌ لواقح) واتە: شنەباکان پیتێنەرن، ناگوترێت (ملاقح) کە بە دەگمەن دێ، دەشڵێن ئەسڵی وشەکە (مُلقحهٌ)یە واتە: پیتێنراو، بەڵام ئەمە نابێتە پیتێنراو مەگەر بەخۆی پیتێنەر نەبێت، جا ئەگەر بایەکە هەوری پیتاند ئەوە بە چاکە پیتاندوویەتی و بایەکە خێری تێدابووە و بە هەورەکەی گەیاندووە.

## ڕاڤەکارانی قورئان چی دەڵێن:

ڕاڤەکاران لە ئیبنو عەباسەوە لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەی خوای گەورە (و أرسلنا الرياح لواقح) دەڵـێن: پیتێنەری درەخت و هەور کۆمەڵێك لە ڕاڤەکاران دەڵێن: (لواقح) کۆی (لاقح) واتـە: هـەڵگری هـەور و خێرە، دژەکەشی بریتی یە لە (بای بێ خێر و نەزۆك).

وهەردوو گوتەکە ڕاستن، ئەمەش لەبەر ئەوەی بایەکە بە تێپەڕینی بەسەر خاك و ئـاوو درەخـت دا دەپیتێ، بەمەش خۆی خۆی پیتاندووە، هەروەك چۆن جگە لە خۆی هی دیکەش دەپیتێنـێ، پیتانـدنی هەور و درەخت واتە کاری تیایاندا کردووە.

## هەقیقەتەکانی زانستی نوێ چین؟

پەڕین بەهۆی (با)وە لە کردای پیتاندن دا زۆر پێویستە، بە تایبـەتی بـۆ ئـەو ڕووەکانـەی خـاوەن گوڵی ئەوتۆن کە سەرنجی مێش و مەگەز بۆ خۆیان ڕاناکێشن.

خودای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ (الحجر:٢٢) لـە ڕاڤـەکردنی ئـەم ئایەتـەدا هـاتووە کـە بایـەکان پیتێنەری درەخت و هەورەکانن، ئەمەش گوتەی ئیبنو عەبباس و هەندێ لە تابعییەکانە. بەڵام زانایانی ڕووەکناسی بۆتە شتێکی باو لە لایان کە پیتاندن کردارێکی بنەڕەتی یە بۆ زیاد بوون و دروست بـوونی تۆ، بە شێوەیەك کەتیادا دەنکۆڵەی پەڕین لە توخمی نێرەکی گوڵدا دەگوازرێتەوە بۆ توخمی مێییەك کە بەمە کرداری پیتاندن تەواو دەبێت.

پەڕین دەکرێ لە نێوان توخمی نێرینە و مێیینەی یەك گوڵدا یا یەك ڕووەك دابێت، ئەو کاتەش پێی دەگوترێت (خۆپەڕکی) (التلقيح الـذاتي). دەکرێ لە نێوان دوو ڕووەکی جیاواز بێ ئەو کاتە پێی دەڵـێن (تێکەڵە پەڕین) (التلقيح المختلط).

گواستنەوەی ئەو دەنکۆڵانەی پەڕین جیاواز دەبن بە جیاوازی جۆری ڕووەکەکە، جا لێرەدا جگە لـە پەڕین بە هۆی مرۆڤەوە بۆ نموونە وەکوو موتەربەکردنی دار خورما سێ ڕێگەی دیکە هەنە، کە ئەوانەن:

* پەڕین بە هۆی گیانلەبەرانەوە: وەکو مێش و مەگەز و باڵندە.
* پەڕین بەهۆی ئاوەوە.
* پەڕین بەهۆی (با)وە.

بێگومان (با)، وەكو ئەنسكلۆپیدیای جیهانی باسی دەكات، ڕۆڵێكی گرنگی لە كرداری گواستنەوەی پەڕین لەو ڕووەكانەدا هەیە كە گوڵی بۆندار و شیلە دار و ڕەنگداری سەرنج ڕاكێشەری مێش و مەگەزیان نییە، بە شێوەیەك بایەكە پەڕینەكە لە پانتاییەكی فراواندا بڵاو دەكاتەوە. بۆ نموونە: با پەڕینی سنۆبەر لە ماوەیەك بڵاو دەكاتەوە كە دووریەكەی دەگاتە (٨٠٠) كیلۆمەتر بەر لەوەی پەڕینەكە بگاتە توخمە مێیینەكان و كرداری پیتاندن ڕوودەدات. وە لە كۆی ئەو ڕووەكانەی كە بە شێوەیەكی بنەڕەتی پشت بە پیتاندن بە هۆی (با)وە دەبەستن: سنۆبەریەكان و قەڕاس و حور و سندیان و قەنیب و بوندقن.

## لە ئەنسكلۆپیدیای بەریتانی نوێ دا هاتووە:

ئەوەی كە بڵاو بوونەوەی پەڕین بە هۆی(با)وە ئاسان دەكات، هەبوونی توخمە نێرینەكانی گوڵە كە كاری بەرهەمهێنانی پەڕینی بە هەوا هەڵدراو دەگرێتە ئەستۆ بە شێوەیەك كە بڵاو بوونەوەی پەڕینەكە ئاسان دەكات. لەگەڵ هەبوونی گوڵێك كە هێشتا گەڵای دەرنەكردووە، یاخود كەوتۆتە سەرەوەی درەختەكە یا خود ڕووەكەكەوە.

كوڕی شیرینم ئەی ئەو هەقیقەتە زانستیانە دووپات كردنەوەی ئەوە نییە كە لە كتێبی خودای گەورە داهاتووە:﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ (الحجر: ٢٢).

ئایا پێغەمبەر (ﷺ) زانای ڕووەكناسی بوو تاوەكو قسەی لەم جۆرەمان پێ بڵێ كە خۆی پێغەمبەرێكی نەخوێندەوار بوو؟.

یان ئایا توێژینەوەی لە بارەی ڕووەكەكانی لا هەبوو، لە كاتێكدا چوارده سەدە زیاتر بەر لە ئێستا لە بیاباندا دادەنیشت؟

# بەشـــەکـانی ( بــــا )



کوڕی شـیرینم بێگومـان (بـا): گواسـتنەوەی بارسـتە گەلی هەوایە لـەو شـوێنانەی کە پاڵەپەستۆیان بەرزە بـەرەو ئـــەو شـــوێنانەی کـــە پاڵەپەستۆیان نزمە.

بایــەکان بــە جیــاوازی ناراســتەیان و، خێراییــان و، توندییان مەبەستیان لە یـەکتر جیاواز دەبن.

وشەی (ریح یاخود ریـاح) چــواردەجار، لـــە چـــواردە سورەتی قورئاندا هاتووە.

لەوانە: ئەوەی کە بۆ بەندەکان ڕەحمەتە و مـوژدەی بارانی ڕەحمەت دەدات، بۆ زیندووکردنەوەی ژیان لەسەر زەوی‌و، گەشەسـەندنی خێر، هەروەها بۆ لەناوبردنی قەومـە تاوانبـارو لـە سنووردەرچـووەکان و تەفرو توناکردنیان دەنێردرێت.

هەروەها (با) ڕۆڵێکی گەورەی لە دروست کردنی هـەورو تـەم و وروژانـدن و پێکهـاتن و کەڵەکـە بوونیان بەسەریەك و، بەرزکردنەوەیان بۆ چینە بەرزەکان و، پیتاندنیان بە ناوکۆکەی چرپووی جۆراوجـۆر و بەتاڵ کردنەوەیان لەبارگە کارەباییەکانی هەیە. ئەوە گەورەترین ڕۆڵی (با)یە، توێژینەوە زانسـتی یـە تازەکان دانیان پێداناوە، ئایەتە قورئانیەکان بـە چـواردە سـەدە پـێش ئـەوەی زانسـتی سـەر زەوی‌ـان بیسەلمێنێ هێناویانە، وە بەو پێش زانست کەوتنە دەبنە ئایەتی ئیعجاز.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِـي الـسَّمَاءِ كَيْـفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَـابَ بِـهِ مَـن يَـشَاءُ مِـنْ عِبَـادِهِ إِذَا هُـمْ

يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ (الروم : ٤٨)

**واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە چەندەها جۆر (با) دەنێرێت ئەو(با)یە هەور هەڵدەگرێت و لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی دەکات، جا خوا پەخشی دەکاتەوە بە ئاسماندا بەهەر شێواز و شێوەیەك کە بیەوێت، هەورەکان پارچەپارچە دەکات، ئینجا دەبینیت باران لە نێوانیان دەردەچێتو دادەبەزێتە سەر زەوی، جا کاتێك بارانەکەی باراند بۆ هەر تاقمێك لە بەندەکانی کە بیەوێت، ئەوانیش یەکسەر خۆشحاڵ و دڵ خۆش دەبن و موژدە دەدەن بە یەکتری...)**

لە توێژینەوە نوێیەکاندا جۆرەها (با) بە گوێرەی پەیوەندیان بە هەور و تەمەکان بەدی دەکەین:

١- هەیانە کارەکەی تەنیا ورووژاندنی ڕووی ئاوە بۆ دروست کردنی دڵۆپە ئاو لەسەر لوتکەی شەپۆلەکاندا.

٢- هەیانە بۆ هەڵگرتنی هەورەکان لە دوای دروست بوونیان و بەرزکردنەوەیان سەرەڕای قورس و گرانیان، کە پڕن لە هەڵمی ئاو بۆ چینە بەرزەکانی ئاسمان.

٣- هەیانە بۆ ڕاپێچ کردن و هاژوتن و بەسەریەك کەڵەکە کردنی هەورن بە نەرمی.

٤- هەیانە بۆ دابەش کردنی هەورە باریوەکان و پەرت کردنیانن بەسەر ناوچەکانی زەویدا.

ئەم چوار بەشە جۆرەکانی (با)ی پیشان داوە، هەروەها زنجیرەی کارەکانیانی پیشان داوە هەر لە دروست کردنی هەورەکان و، قۆناغەکانی ئەو دروست کردنە لە ورووژاندنی ڕووکاری ئاوەکان، هەتا هەڵگرتنی هەورو، بەرزکردنەوەیان بۆ شوێنی چڕ بوونەوە و بارینیان و، جولاندنیان بە نەرم و نیانی، هەتا دابەش کردنی بارینەکەی بەسەر ئەو شوێنەی کە خودای گەورە دەیەوێت.

وە لە سورەتی (الذاريات) دا خودای بەدیهێنەر سوێند بە جۆرەکانی (با)وە دەخوات وەکوو کە زانستی نوێ بەو دواییە ناسیویانن: ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْواً ۞ فَالْحَامِلَاتِ وِقْراً ۞ فَالْجَارِيَاتِ يُسْراً ۞ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْراً﴾ (الذاريات : ١-٤)

**واتە: (سوێند بەو ڕەشەبا و ئەو بایەی کە هەور و هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت و پەخشی دەکاتەوە، یان تەپ و تۆ بەرز دەکاتەوە ئینجا بە هەڵگرانی باری قورس و گران هەروەها بەو هەورانە کە بە ئاسانی بە ئاسماندا لە شوێنێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ شوێنێکی تر، ئینجا سوێند بەو بایەی هەورەکان دابەش دەکەن).**

خودای گەورە سوێندی بەو (با)یە خواردووە کە تۆز و هەڵم و دڵۆپە ئاو دەورووژێنێ (الذاريات

ذرواً) پاشان بەو (با)یەی كە هەوری قورس بوو بە هەڵمی ناو بەرز دەكاتەوە بەهۆی شەپۆلە هەڵگرە بەرزەڕۆكانەوە. (فالحاملات وقراً)پاشان بەو (با)یەی كە هەور و تەمەكان بە نەرمی و ئاسانیەوە لەگەڵ خۆیان دەبات (فالجاريات يسراً) پاشان بەو (با)یەی كە بڕی هەوری باریو پەرت دەكات و بەسەر زەوی دابەشی دەكات، خودای گەورە بارانی بە بەرەكەت و ڕەحمەتی بۆ بڕیار داون، یاخود تێكدان و بە هیلاك بردنی بۆ بڕیار داون (فالمقسمات أمراً).

كوڕی شیرینم ڕێكەوتنێكی موعجیزە ئاسا لەنێوان ئەنجامەكانی زانستی نوێ و لە نێوان ئەوەی كە لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە و هەروەها بە زنجیرە هێنانەوەی قۆناغەكان وەكو دیمەنێكی ڤیدیۆیی قەشەنگ خۆی دەردەخات. لە دەرهاویشتەكانی زانستە تازەكان دانانە بەرۆڵی (با) لە پیتاندنی جۆرەكانی هەور بە ناوكۆكەی خەست كردنەوە و بە ڕووداوەكانی خاڵی كردنەوەی كارەبایی لە نێوان بارگەی سالیب و موجەب لە ناو هەورەكاندا بۆ ڕەخساند و ئامادەكردنی بارودۆخەكانی باران بارین، هەروەها دان دەنێن بە ڕۆڵی (با) لە هەڵگرتنی تەپ و تۆز (بریتی یە لە دەنكۆڵەكان) لە كۆئەندامەكانی نێرینەوە بۆ كۆئەندام مێیینەی ڕووەكەكان بە مەبەستی پیتاندنیان.

## دوو خول هەنە بۆ پیتاندن

أ- خولی یەكەم: بروسكەیەك بە خێرایی ٣٠٠،٠٠٠كم لە چركەیەكداو هەورە تریشقە بە خێرایی ٣٣٣م لە چركەیەكدا بەرهەم دێنێت (بە بەدواكەوتنی پێنج چركە بۆ هەر میلێك) هەر بەم پێوانەیەش دووری هەورەكان دەپێورێن.

ب- خولی دووەمیش: بەروبووم بەرهەم دێنێت و ڕووەكەكانیش بە هەڵگرتنی دەنكۆڵەی پەرین دەپیتێنێت.

ئەم دوو خولە، هەردووكیان لە ئایەتی قورئانی پیرۆزدا لە بارەی (با)ی پیتێنەردا هاتووە وەكو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ﴾ (الحجر: ٢٢).

# نزم ترین ناوچە لە جیهاندا




خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿الم* غُلِبَتِ الرُّومُ* فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ* فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ* بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (الروم: ١-٥)

**واتە: (* رۆمەکان تێك شکێنران* لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا* بەڵام لە ئایندەدا رۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە* لەچەند ساڵێکدا هەموو کار و فەرمانێك تەنها بە دەست خودایە، لەوەو پێش و لەوەو دواییش، جا ئەو رۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و شاد دەبن * بە سەرکەوتنی خوا، هەر کەسێك یان هەر دەستەیەك ئەوزاتە بیەوێت، سەری دەخات، هەر ئەو خوایەش خاوەن دەسەڵاتی بێ سنوورە و زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە).**

زانایانی زمانەوانی دەڵێن: أدنى: واتە زۆر نزیك بوونە لە شتێك: واتە (نزیك). وە روایەتێك لە (کلبی)یەوە هەیە کە خوێندنەوەیەکی دیکە بۆ (في ادنى الارض) هەیەلەوێدا ئەو وشەیە بە مانای: (نزمترین) دێت. هەروەها راڤەکاران وەکوو (الرازي و القرطبي و الطبري) ئاماژەیان بە مانای یەکەم بۆ وشەی (أدنى) کردووە واتە (نزیکترین)، هەروەها باسیان کردووە کە (أدنى الارض) واتە (نزیکترینی).

ئیبنو عبباس و هی دیکەش ریوایەتیان کردووە کە جەنگەکەی نێوان ڕۆم و فارسەکان لە نێوان ئوردەن و فەلەستین ڕوویداوە.

* ئەی هەقیقەتە زانستیەکان کامانەن؟

* وێنە جوگرافیاکان، ئاستی ناوچە نزمەکانی زەوی لە جیهاندا روون دەکەنەوە، کە نزمترین ناوچە لەسەر ڕووی زەوی ئەو ناوچەیە کە کەوتۆتە نزیك دەریای مردوو لە فەلەستیندا بە شێوەیەك کە بە قوڵایی (٣٩٢) مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە نزم دەبێت.

وێنە و پێوانەکانی مانگە دەست کردەکانیش ئەمە دوویات دەکەنەوە.

ئێستاش ئەی کوڕی شیرینم فەرموو لەگەڵ ئەوەی کە ئەنسكلۆپیدیای بەریتانی گوتویەتی: (دەریای مردوو، شوێنێکی سوێراوی داخراوە لە نێوان (ئیسرائیل) و (ئوردەن) کە نزمترین ناوچەی ئاوییە لەسەر ڕووی زەوی، نزمیەکەشی دەگاتە نزیکەی (١٣١٢) پێ واتە (نزیکەی ٤٠٠ مەتر) لە ئاستی ڕووی دەریاوە، بەشی باکوری دەکەوێت ئوردنەوە، بەشی باشوریشی لە نێوان ئوردەن و ئیسرائیل دابەشکراوە، بەڵام لە دوای جەنگی نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵی (١٩٦٧)دا سوپای ئیسرائیلی لە تەواوی بەشی باشووردا مایەوە. دەریای مردووش دەکەوێتە نێوان گردۆڵکەکانی (جُدَيَّه) لە ڕۆژئاوا و بانەکانی ئوردەن لە ڕۆژهەڵاتدا: ﴿الم* غُلِبَتِ الرُّومُ* فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ* فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ* بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (الروم : ١-٥).

وەکو پێشتریش لە ئیعجازی پەنهانی دا باسمان کرد، کە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتانە بەرپا بوونی جەنگێك بوو لە نێوان هەردوو مەملەکەتی فارس و ڕۆم لە ناوچەی نێوان (ئەزرەعات و بەصرا) لە نزیك دەریای مردوو کە تیایدا فارسەکان بەسەر ڕۆمەکاندا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا، ئەمەش لە ساڵی (٦١٩ز) بوو.

ئەم ئایەتانە چەند موعجیزەیەك لە خۆ دەگرن:

یەکەم: لە شوێندا (أدنى الارض) واتە شوێنی جەنگەکە، کە جەنگی (مجدو) بوو کە بە ڕاستی لە نزمترین خاڵی سەر ڕووی زەوی لە نزیك دەریای مردوودا ڕوویدا.

دووەم: لە کاتدا (بضع سنين) دیاریکردنی ماوە، (بضع)یش مانای لە (دە) کەمتر دەگەیەنێت، ئەو سەرکەوتنەش دوای نزیکەی نۆ ساڵ بوو.

سێیەم: ئەو سەرکەوتنەی رۆمەکان هاوکات بوو لەگەڵ سەرکەوتنی موسڵمانەکان بەسەر موشریکەکان، ئەمەش هەروا دەرچوو وەکو پێغەمبەری راستگۆی بڕوا پێکراو هەواڵی لە بارەی دابوو. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم: ٣-٤).

**واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات، هەرچی دەیڵێ لە خوداوە نیگای بۆ کراوە و تێگەیەندراوە).**



# ئــاو و ژیـــان



كاتێـك خـوای گـەورە زەوی و ئاسمانـەكانی بـەدیهێنا و ویـستی مـرۆڤ لەسـەر ئـەو زەویـە دروست بكات، ئاوی بۆیان بـەدیهێنا كـە ژیـانی خۆیان و بوونەوەری زیندووی دەوروبەریان لەسـەر وەستاوە.

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَـرُوا أَنَّ الـسَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضَ كَانَتَـا رَتْقـاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء : ٣٠)

واتــە: (ئایــا ئەوانــەی بــێ بـاوەڕبوون نەیانبینیوە و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەكان و زەوی یەك پارچەبوون، لـەوەودوا لێكمـان جیاكردنەوە، لەئاویش هـەموو شـتێكی زینـدوومان فەراهـەم هێنـاوە، ئایـا ئەوانـە هـەر بـاوەڕ ناهێنن؟!)

ئاو ماددەی ژیان و نهێنی یەسیحراویەكەیەتی كە بەبێ بوونی، ژیان لەسەر ڕووی ئـەم هەسـارەیە ئەستەم دەبێت.

هەروەها خودای گەورە باسی ئاوی بە ئەناسراوی (ما)(٣٣) جار و،بە ناسراویش (الما)(١٦) جـاران لە قورئانی پیرۆزدا كردووە.

* خودای گەورە منەتی بەسەر باوەڕداران كردووە كە ئاوی بۆ باراندوونەتە خوارەوە كـە ژیانیـان لەسەر وەستاوە. خودای گەورە دەفەرمووێـت: ﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْـهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ * يُنبِتُ لَكُم بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالأَعْنَابَ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل: ١٠-١١)

واتە: (پەروەردگار ئەو زاتەیە كە لە ئاسمان بارانتان بۆ دەبارێنێت كە لێی دەخۆنەوە، هەروەها تێكەڵ بە جۆرەها شەربەت و شلەمەنیش دەیخۆنەوە و دەبێتە هۆی ڕووان و گەشـەكردنی درەخـت و

گژوگیا و ماڵاتی تیادا دەلەوەڕێنن، هەر بەو بارانــە خــودای گــەورە جۆرەهــا كــشتوكاڵ دەهێنێتــە بەرهەم بۆتان، هاوڕێ لەگەڵ زەیتوون و خورما و جۆرەها ترێ، لە هــەموو جــۆرە بــەروبوومێكیش، بەڕاستی ئا لەوەدا بەڵگەو نیشانەی تەواو هەیە بۆ كەسانێك كە بیر بكەنەوە).

* هەروەها خودای گەورە وەسفی ئاوی بەوە كردووە كە مویارەكە﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ﴾ واتــە: (لەئاسمانــەوە ئــاوێكی بــە پیــت و بەرەكــەتمان هــەردەم دابەزاندووە، جا بەهۆی ئەوەوە چــەندەها بــاخ و دانەوێڵــەی ئــەو كــشتوكاڵانەی كــە درەو دەكــرێن ئەروێنین).

* خودای گەورە باسی كردووە، دابەزانــدنی ئــاو لــە ئاسمانــدا و زیندووكردنــەوەی زەوی لــە دوای مردنی دا بەڵگە و نیشانەیەكە لەسەر هەبوونی خودای پەروەردگار، وەكو دەفەرموویت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة: ١٦٤)

واتە: (بەڕاستی لە دروست كردنــی ئاسمانــەكان و زەوی و ئــاڵ و گــۆڕی شــەو و ڕۆژدا و لــەو كەشتیانەدا كەو دەگەڕێن بە دەریادا و بە هۆیەوە سوود بە خەڵكی دەگەیەنن و لەو ئاوەی كە خــوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و ئینجا بە هۆیەوە زەوی پێ زیندوو دەكاتەوە دوای وشك بــوون و مردنــی، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مار و مێرووی لەسەر ڕووكاری زەوی دا بــڵاو كردۆتــەوە و گۆڕاندن و هات و چۆ كردنی باو شــەماڵ و ڕاگیركردنــی هــەورەكان لــە نێــوان ئاسمــان و زەویــدا، ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی كە عاقڵ و بیر و هۆشیان دەخەنە كارو بیر لــە دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەكەنەوە).

هەروەها دەفەرموویت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (الروم: ٢٤)

واتە: (هەروەها لە بەڵگە و نیشانەكانی تری ئەوەیە، هەور و بروســكەتان نیــشان دەدات كــە ترسی لێ دەكرێت و ئومێد بەخشیشە و لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، زەوی پێ زینــدوو دەكاتــەوە دوای ئەوەی كە مردبوو، بەڕاستی ئا لەو دیاردەیەشدا بەڵگە و نیــشانەی زۆر هــەن بــۆ كەســانێك ژیریان بخەنە كار).

خودای گەورە منەتی بەسەر کافرەکاندا کردووە بەوەی کە هەمووشتێکی لە ئاودا زیندوو کردووە، وەکو دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾(الانبياء: ٣٠).

**واتە: (ئایا ئەوانەی بێ باوەڕبوون نەیانبینیوە و بۆیان ڕوون نەبۆتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیا کردنەوە، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕناهێنن؟!).**

* هەروەها خودای گەورە باسی ئاوی کردووە، کە یەکێکە لە نیعمەتەکانی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخیش بەوە ئازار و ئەشکەنجە دەدرێن کە ئاویان لێ قەدەغە دەکرێت، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُواْ عَلَيْنَا مِنَ الْمَاء أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللّهُ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ* الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْواً وَلَعِباً وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَـذَا وَمَا كَانُواْ بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ (الاعراف: ٥٠-٥١)

**واتە: هاواریان لە بەهەشتیان کردوە لێیان پاڕانەوە و گوتیان: نەختێك ئاومان بەسەردا بڕێژن، بەشمان بدەن لەو رزق و ڕۆژیانەی کە خوا پێی بەخشیون، گوتیان: بەڕاستی خوا خواردن و خواردنەوەی بەهەشتی لەسەر بێ باوەڕان حەرام کردووە* ئەوانەی کە کاتی خۆی ئاینەکەیان بە گەمە و گاڵتە گرتبوو، ژیانی دونیا غەڕڕاو سەر گەردانی کردبوون و خەڵەتاندنی، جا ئێمە ئەمڕۆ ئەوانە فەرامۆش دەکەین، هەروەکو ئەوان ئەمڕۆژەیان فەرامۆش کردووە لە بیرخۆیان بردبۆوە، هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە کە دژی ئایەتەکانی ئێمە دەوەستان و ئینکاری و بەربەرەکانیان دەکرد).**

* هەروەکو چۆن خودای گەورە باسی کردووە کە ناو سەربازێکە لە سەربازەکانی خودا و هۆکارێکیشە بۆ لەناوبردنی کافرەکان، وەکو دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذَا جَاء أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلاَّ قَلِيلٌ* وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ* وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ* قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاء قَالَ لاَ عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ إِلاَّ مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ* وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (هود: ٤٠-٤٤)

واتە: هەتا ئەو كاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو لە تەنوورە پڕ لە ئاگرەكەوە ئاو فوارەی كرد، ئەوسا وتمان ئەی نوح، لە هەموو نێر و مێیەك دووان هەڵبگرە لە كەشتی یەكەت دا و ماڵ و خێزانت، جگە لەوانەی كە بڕیاریان لەسەردراوە تووشی تۆڵە بێن بەهۆی بێ باوەڕیان، ئەوانەش هەڵگرە كە باوەڕیان هێناوە كەسیش بڕوای بە نوح نەكردووە لە گەڵی دانەبوو، جگە لە كەسانێكی كەم نەبێت نوح گوتی: سواربن و بڕۆنە ناو كەشتییەكەوە، بە ناوی خواوەیە ڕۆیشتنی و وەستانی، بێگومان پەروەردگارم زۆر لێخۆشبووە و بەبەزەییە * كە كەشتیەكەش دەیبردن و بەناو شەپۆلی وەك چیادا، نوح بانگی كردە كوڕەكەی لە شوێنێكی چەپەك گیری خواردبوو پێی گوت: ڕۆڵە گیان، لەگەڵ ئێمەدا سواربە و لەگەڵ بێ باوەڕاندا مەبە * كوڕەكەی گوتی: پەنا ئەبەمە لای ئەو چیایە و دەمپارێزێت لەو زریان و ئاوە! (نوح) گوتی ئەمڕۆ هیچ پەنادەرێك نییە لە تۆڵە و خەشمی خوا كەس بپارێزێت، مەگەر كەسێك خوا خۆی ڕەحمی پێ بكات، ئەوسا شەپۆلی ئاو دای بە نێوانیاندا و جا چووە ڕیزی خنكاوەكانەوە * پاشان فەرمان درا بە زەوی: ئاوەكەت با روو بچێ بە ناخت دا، ئەی ئاسمان تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەكە ڕۆ چوو، فەرمانیش بە ڕێك و تەواوی ئەنجام درا، كەشتی یەكەش لەسەر كێوی جودی وەستا لەنگەری گرت و گوترا: دەك دووری لە بەزەیی خوا و تیاچوون بۆ بەرەی ستەمكاران).

* هەروەها خوای گەورە باسی لە یەكێ لە سوودەكانی ئاو كردووە ئەویش پاك كردنەوەیە، وەكو دەفەرموێت: ﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ (الانفال:١١).

واتە: (ئەو موژدە و ئارامی دڵە كاتێك بوو كە خوای گەورە بە وەنەوز دایگرتن بۆ ئەوەی هێمنی یەك بێت بۆتان لە لایەن خۆیەوە و ئاوێكیشی لە ئاسمانەوە بە سەرتاندا باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بكاتەوە پیسی و پۆخڵی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە و دڵەكانتان بەهێز و دامەزرا و بكات و بیان بەستێت بە خواوە و بەو ئاوە پێیەكانیشتان جێگیر و قایم بكات).

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً﴾ (الفرقان: ٤٨).

واتە: (هەر ئەو زاتەیە كە با دەنێرێت كە موژدەیەكە لە لایەن خوای میهرەبانەوە، ئێمەش لە ئاسمانەوە ئاوێكی پاك و خاوێنمان بۆ باراندووە).

* خودای گەورە فەرمانی پێكردووین كە لەگەڵ هەرنوێژێكدا دەست نوێـژ هـەڵگرین و لـە كـاتی لەشگرانیشدا خۆمان بە ئاو بشۆرین. وەكو دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَـكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (المائدة: ٦)

**واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: كاتێك ویستتان هەستن بۆ نوێژ ئەوە سەرەتا ڕوخسارتان بشۆن، ئینجـا دەسـتەكانتان لەگـەڵ ئەنیـشكتاندا، پاشـان دەسـتی تـەڕبهێنن بەسـەر سـەرتان، قاچەكانیشتان بشۆن لەگەڵ قوڵەپێتاندا، ئەگەر لەشتان گران بوو، ئـەوە خۆتـان خـاوێن بكـەن و خۆتان بشۆن، ئەگەرنەخۆش بوون یان لە سەفەردابوون، یان دەستتان بە ئـاو گەیانـدبوو یـان لـە ئافرەتی (نامەحرەم) كەوتبوون و ئاوتان دەست نەدەكـەوت بـە خـاكێكی پـاك تەیـەمموم بكـەن و بیهێنن بە روخسار و دەستتاندا، خوا نایەوێت لە ئاییندا تووشی سەغڵەتی و ناڕەحەتیتان بكـات، بەڵكو دەیەوێت پاك و خاوێنتان بكات و دەیەوێت ناز و نیعمەتی خۆیتان بەسەردا تەواو بكات، بۆ ئەوەی سوپاس گوزاربن).**

* پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێكردووین كە دەست گربین لە بەكار هێنانی ئـاودا و زێـدەڕۆیی لێ نەكەین. لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە كە فەرمانی بە سەعد كـردووە كاتێـك خـەریكی دەسـت نوێـژ شوشتن بوو پێی فەرموو (ما هذا السَّرفُ) واتە: ئەی سـەعد بـۆ لـە بـە كارهێنـانی ئـاودا زێـدەڕۆیی دەكەی؟ سەعد گوتی: ئایا لەدەست نوێژ شوشتنیشدا (نعم وإن كُنت على نهرٍ جارٍ). (حدیث حسن رواه إبن ماجه) واتە: بەڵێ، باتۆ لەسەر ڕووبارێكی ڕۆیشتووش بیت.

# پێكهاتنی ئاو

ئاو لـە چـەند گـەردێكی پێكـەوە نووسـاوی یـەكگرتوو پێـك دێـت، گـەردێكی لـە یـەكگرتنی گەردیلەیەكی ئۆكسجین لەگـەڵ دوو گەردیلـەی هایـدرۆجین پێـك دێـت، ئـەم یەكگرتنـەش بـە پێـی پەیوەندیەكی هاوبەشیانەی بەهێز دێتەدی كە بەهاكەی (٣٠-١٠٠) كیلۆ گەرمۆكە/مول دەبێت.

# شوێنی پەیدابوونی ئاو



چەندین بیردۆز بۆ ڕاڤەکردنی بنچینەی ئاو لەسەر ڕووی گۆی زەویدا بەدیار کەوتوونە، لەو بیردۆزانەش:

## أ- بیردۆزەی گەردوونیەتی پەیدابوونی ئاو:

پوختەی ئەم بیردۆزە ئەوەیە، ئاو لە بۆشایی دەرەوەی گۆی زەوی هاتۆتە سەر زەوی، بەوەی لەوێدا چەند ئەوژمێك لە بونەوەرە تیشك هەن، بە بەردەوامی لە بۆشایی گەردووندا لە جوولەدان کە لە تەنۆکەی خاوەن وزەی یەکجار زۆر پێکهاتوون، کە ناوکە گەردیلەی هایدرۆجینیان تێدایە، واتە پرۆتۆنەکانیان تێدایە، لەکاتی سووڕانەوەی هەسارەی زەوی بە دەوری خۆی و دەوری خۆردا، ئەو پرۆتۆنانە ئاسمانی زەوی دەبڕن و ئەلکترۆنەپێویستەکان بە دەست دەهێنن و، گەردیلەی هایدرۆجین پێکدێنن، بە شێوەیەك کە ڕاستەو خۆ لەگەڵ ئۆکسجیندا کارلێك دەکەن و چەند گەردێك لە شوێنی زۆر بەرز پێکدێنن، هەروەها لەژێر چەند پلەیەکی گەرمی نزمدا، بەسەر تەنولکەکانی تەپ و تۆزی گەردوونی دا چڕ دەبنەوە و هەورێکی زیوین پێك دەهێنن، بە شێوەیەك زاناکان لەو باوەڕەدان ئاو بەو ڕێگەیە لە میانەی مێژوویێکی دوور و درێژدا کە گۆی زەوی پێدا تێپەڕیوە، درووست بووە، جا کاتێك کە دروست دەبێت بارتەقای ئەوە دەکات کە هەموو زەریاکان لەسەر ڕووی زەویدا پڕ بکات.

خودای گەورە ئەو دیاردەیەی لە قورئانی پیرۆزدا باسکردووە بەوەی کە ئاوی لە ئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە و هەروەها باسی ماددەی ئاوی بە نەناسراوی کردووە بەبێ ئەوەی بیناسێنێ تاکو ئەو مانایە بگەیەنێت تەواوی ڕەگەزی ئاو لە ئاسمانەوە دابەزیوە، ئەمەش لە زیاتر لە بیست ئایەت دا هاتووە بەوانە: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاء بِنَاء وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ

رِزْقاً لَّكُمْ فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (البقرة: ٢٢)

واتە: (هەر ئەو زەوی كردووە بە فەرش و جێگای نیشتە جێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەكوو سەقفێك بەسەرتانەوە ڕاگیر كردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندوون، جا بە هۆیەوە جۆرەها بەرهەمی بەدەرهێناوە تا ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆتان، كەواتە شەریك و هاوتا بۆ خوا بڕیار مەدەن، كە خۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت).

هەروەها خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَّابِياً وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ﴾ (الرعد: ١٧).

واتە: (هەر ئەو زاتە لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بە ئەندازەی ئەو دۆڵ و نشێوە بەهۆی ئەو بارانە پڕ دەبن، ئەو لافاوە كەف و كۆڵی بەرز هەڵگرتووە، هەروەها لەسەر ڕووی ئەوكانزایانەی كە ئاگری تێبەردەدەن و دەیتوێننەوەبە ئاگر بۆ دروست كردنی خشڵ وەكوو (ئاڵتون و زیو و پلاتین) یاخود بۆ پێویستی تر، كەف و كۆڵ دروست دەبێت وەك كەف و كۆڵی سەر ئاوەكە، ئا بەو شێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە بۆ هەق و ناهەق، بۆ ڕاست و ناڕاست، جا ئەوەی كەف و كۆڵەو بێ سوود و بێ كەڵكە دەڕوات و دەپوكێتەوە، بەڵام ئەوەی كە سوود بەخش و بە كەڵكە بۆ خەڵكی لەسەر زەویدا هەر ئەوە دەمێنێتەوە، ئا بەو شێوەیە خوا نموونە جۆرا و جۆرەكان دەهێنێتەوە).

## ب_ بیردۆزی پەیدابوونی ئاو لە زەویدا:

پوختەی ئەو بیردۆزەش ئەوەیە ئەو تاوێرە بەردانەی كە ئەو چینانەیان پێكهێناوە كە كەوتوونەتە نێوان ناوكی زەوی‌و توێكڵی زەوی (چینی سیما) كە لە هەندێك شوێندا لە ژێر كاریگەری ئەو پلە گەرمییەی كە لە ئەنجامی لێك هەڵوەشانەوەی تیشكی تیشكدارە بینراوەكانەوە دروست دەبێت دەتوێتەوە بە شێوەیەك كە پێكهاتەگەلی فرێوی وەكو ئۆزۆن و كلۆر و پێكهاتەی جۆرا و جۆرەكانی كاربۆن و كبریت لێیەوە دەردەچن، زۆربەیان هەڵمی ئاون. خوداش باشتر دەزانێ.

# ئایەتەكانی خودا لە بارەی دەریا و زەریاكان



خـــودای گـــەورە دەفەرموویّت: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل: ١٤).

واتـە: (هـەر ئـەو زاتەیە كە دەریای بۆ بار هێناوین تا گۆشتی تەڕ و تازەی لێ بخۆن، تـا لەناویـدا جۆرەهـا گەوهـەر و مـرواری دەربهێـنن و لەدەست و ملی بكەن، هەروەها كەشتی یەكان دەبینن دەریا لەت دەكەنو تا فەزڵ و بەخششی تری پەروەردگار بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی سوپاس گوزاریش بكەن).

# مەزنێتی دەریاكان

دەریا و زەریاكان، پانتاییەكی گەورە لەسەر ڕووی زەوی داگیردەكەن، كە دەگاتـە سێ چـواریەكی ڕووكـاری زەوی. سـیفەتەكانی ئـاو لـە سـیفەتەكانی زەوی جیـاوازە لەبـەر ئـەوەی ئـاوە دەرچـوونی لەلایەكەوە بۆ لایەكی دیكە ئاسانە، لەگەڵ خۆشی دا گەرمی و ساردی هەڵـدەگرێت. هـەروەها هێـزی شكانەوەیەكی باشی هەیە بۆ تیشكەكانی خۆر. هەر لەبەر ئەوەشە كە پلەی گەرمیی دەریاكان لە ڕۆژدا زۆر بەرز نابێتەوە و، لە شەویشدا زۆر نزم نابێتەوە، پلەی گەرمیی شەویش لەگەڵ ڕۆژدا تـەنیا لـە دوو پلە زیاتر جیاواز نابێت.

وە یەکێ لە زاناکان دەڵێ: بێگومان دەریا لە بەردەوام بوونی دا بە پێش زەمان دەکەوێت و لە مانەوەشی دا ئەمریی زیاتر دەبێت بە هەزاران ساڵ بەڵکو بەدە هەزاران ساڵ و ملیۆنان ساڵ تێدەپەڕێت، ئەمڕۆی وەکو دوێنێ سبەینێیەتی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین چیاکان دەگۆڕێن بۆ دۆڵەکان و دۆڵەکانیش بۆ چیاکان.

توێژینەوە زانستی یەکان ئەوەیان سەلماندووە قوولترین دەریا یەکسانە لەگەڵ بەرزایی چیاکان، هەروەها کاپتن (جاك إيفن كوستو) کە دۆزەرەوەی قوڵایی دەریاکانە لە سەرەتاکانی سێیتێمبەری ساڵی (١٩٥٦ز) ئاشکرای کردووە کە توانیویەتی وێنەگەلێکی فۆتۆگرافی لە قوڵایی (٢٥٠٨٠) بگرێت و هەروەها چەند جۆرە ژیانێکی تازەی دۆزیەوە لەگەڵ هەندێ جۆری دیکەی کە هێشتا زانست پێی نەگەیشتووە.

ئەو وێنانەی کە لە قوڵایی زەریاکانەوە گیراوە ئەوە دەسەلمێنن کە قوڵایی زەریاکان تەخت نین وەکو پێشتر لێی حاڵی ببوون.

## هێزی دەریاکان



﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الْضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُورا﴾ (الاسراء:٦٧)

واتە: (کاتێك لە دەریادا ناخۆشی و تەنگانە تووشتان دەبێت، هەرچی پەرستراو هەیە لە بیر و هۆش و باوەڕتاندا نامێنێت و ون دەبێت جگە لەو زاتە، بەڵام کاتێك ڕزگارتان دەکات و دەتانخاتە وشکانیەوە، ئێوە پشت لە بەرنامەکەی دەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و نایناسن، بەڵکو زۆربەی

**مرۆڤەكان ناشوكرو سپلەن).**

ئاوی زەریاو دەریاكان و دەریاچە و ڕووبارەكان، جۆگە و ئۆكەندەكان هەموویان سەرچاوەكەیان یەكە... چەند گەردیلەكی هایدرۆجین.. لەگەڵ چەند گەردیلەیەكی ئۆكسجین یەكیان گرتووە و، بوونەتە ئاو..

ئاو هەمیشە بەیەك ئاراستەدا دەڕوات.. جیاوازی بەسەر دانایەت و ناگۆڕێت.. دەڕواو ژیانی هەڵگرتووە.. بەڵام ڕۆڵەی شیرینم ئایا ئاو هەمیشە دەڕوات بۆ ئەوەی ژیان و شادومانی بهێنێت..؟

ئای كە چەند بە هێزە! ئای كە چەند بەهێزو توندوتیژە بۆ لەناوبردن دەرچووان!!

هەندێ جار بەرەهایی دەبێتە هۆی بەهێزترین‌و توندوتیژترین بەدیهێنراوی بوونەوەر، جا بە بەردەوامی هەرچی یەكی بێتە سەر ڕێی ڕەگەڵ خۆی دەداو ڕای دەپێچێ، جا هەرچی یەك بێ!! كە كارەسات و لافاو دروست دەكات، تاشە بەردەكان‌و هەموو تەنە ڕەقەكانی دیكە لەژێر شەپۆلەكانی دادەڕمێن.. هەرچی ترس و قولایی و...نهێنی و بیم و.. مەترسی و دڵەڕاوكێ هەیە هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

تا ڕەهێڵەی دەریا.. سێ ڕۆژان یان چوار ڕۆژان بەردەوام دەبێت. هیچ شتێ خۆی لەبەر ناگرێ.. شەپۆلگەلێكی بەرزەڕۆ وەكو چیاكان و خەندەقگەلی نزم وەكو دۆڵەكان‌و پەیوەندیەكە لە نێوان دەریا و ئاسمانەوە، نە وشكاییەك و، نە ئاسۆیەكیش دەبینرێت..

شەپۆلێك لە حاڵەتی ئاسایی خۆی دا (٢٥) پێ بەرز دەبێتەوە بەڵام لە ڕۆژانی گەردەلوول و زریاندا بۆ (١٣٠) پێ بەرز دەبێتەوە، ئەگەر بزانین كە یەك پێ لە هەر شەپۆلێكدا هێزێكی وێران كەری ئەوتۆ هەیە كە كێشەكەی شەش هەزار ڕەتلە ئەوە دەتوانێت مەودای ئەو وێرانكاریەی كە ئەو شەپۆلانە دروستی دەكەن بێنێتە بەرچاو.

※ لە ساڵی (١٨٧٢ز) شەپۆلێكی بەهێز لەنگەرگایەكی ئاسنینی لە (ئوسكتلەندا) لە ڕیشەوە دەرهێنا كێشەكەی ملیۆنێك و ٧٠٠ هەزار ڕەتڵ بوو، یەكێكی دیكە تاشە بەردێكی كە كێشەكەی (١٧٥) هەزار ڕەتڵ بوو، هەڵیگرت و بۆ سەد پێ بەرزی كردەوە.

※ لە ساڵی (١٧٣٧ز) لە بەندەری (باجوك) دەریا هەستاو (٣٠٠)هەزار مرۆڤی كوشت و (٢٠) هەزار بەلەم و كەشتی تێكشكاند.

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ

بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾(النور: ٤٠)

**واتە: (یاخود (کردەوەیان) وەك چەندەها تاریکایی وایە، کە لەناو دەیایەکی قوڵدا شەپۆڵ لەسەر شەپۆل بدات بەسەریدا، لەسەروشیەوە هەورێکی تاریك دایگرتبێت، تاریکاییەکان چین چین لەسەریەك نیشتبن، کاتێك کە دەستی دەربهێنێت خەریکە دەستی خۆی نەبینێت بێگومان ئەوەی خوا نووری پێ نەبەخشێت، هەرگیز نووری دەست ناکەوێت).**

پاشان لە ناکاوێکدا، ئاو و هەوا ساف دەبێت و، با دێتەوە باری ئاسایی خۆی و، دەریاکە هێمن دەبێتەوە، ئاسمان و زەوی بەدیار دەکەونەوە، مرۆڤی لاوازیش لە بەرامبەر ئەو توانا مەزنەوە هیچی لە دەست نایەت تەنیا ئەوە نەبێت کە بڵێ پاك و بێگەردی بۆتۆ خودایە و ئەو ئایەتە بخوێنێتەوە: ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ (البقرة: ١١٧)

**واتە: (هەر ئەو زاتە بەدیهێنەری ئاسمان و زەویە بە جوانترین شێوە، جا هەر کاتێك بڕیاری هەر شتێك بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە، یان ئەو کارە دەبێت و ئەنجام دەدرێت).**

## گیانەوەرەکانی دەریا



دکتۆر (هدسون) دەڵێ سەیری ئەو جیهانە سەرسوڕهێنەرەی بکە لە ناو ئاودا بکە و لەو گیا و گیانەوەرانە ڕابمێنە، بەکاری خۆیانەوە سەر قاڵن، زۆر بە جوانی دێن و دەچن، بەلاشەکانیان سەرسام بە، چاودێریان بکە وا بەدوای خۆراکیان دا وێڵن و، نێچیرەکانی خۆیان ڕاو دەکەن و لە دوژمنەکانی خۆیان ڕادەکەن..

ژیانیش لەناو دەریاکاندا هەقە، جا ژمارەی پۆلە بوونەوەرە زیندووەکانی ناو دەریاکان، زیاترن لەژمارەی ئەوانەی سەر زەوی.. جا دەبێ کێ ئەم بوونەوەرانەی بەدیهێنابێ؟.

جیاوازیەکی زۆریش لە نێوان بوونەوەرە زیندووەکانی ناو دەریاکان هەیە، هەتا ئێستاش ژمارەی پۆلێن کردنە لە زیادبوون دان، لەوانەش (قەریسی دەریا) جۆرە بوونەوەرێکی بچووکن کە ژمارەیان لە یەك (میل)ی سێ جا دەگاتە(١٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠) واتە (بەلایین بەلایین).

یەکی دیکەش نەهەنگی (دورکال)ە کە درێژیەکەی دەگاتە (١٢٠ پێ)، هەروەها ماسی بچووکیشی تێدایە کە ماسییە گەورەکان لەسەریان دەڵەوەڕن، هی دیکەش -کاشلوت)ی نەهەنگە کە لەناو دەریادا بە درێژایی و بەرینایی دەسوڕێتەوە..شێر ئاسا لە ناوی دا دێ و دەڕوات.. چەند کەڵبەیەکی تیژی هەن و هێزێکی لە ڕادە بەدەریشی هەیە، لە توانای دا هەیە پەلاماری کەشتی یەکان بدات بەڵکو تێکیشیان بشکێنێ، لەشتە سەرسورهێنەرەکانی گیانەوەری دەریا، ماسی (نەرم و لیق)و، گیاندارە نەرم و نۆڵەکانە، دەریا باڵندەیەکی تایبەتی هەیە پێی دەڵێن (سەخاب) کە باڵندەیەکی زەبەلاحەو دەنگیشی یەکجار بەهێزە، درێژی هەردوو باڵەکانی هەر کاتێ درێژیان بکاتەوە دەگاتە (پازدە) پێ.

ئەو باڵندەیە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە ئاسماندا بەفریوی دەمێنێتەوەو دەڵێن هەر لەئاسماندا دەخەوێت.. هەروەها ئەوە بەسە کە مرۆڤ بیر لە ملیۆنەها ڕاوچی بکاتەوە کە تۆڕەکانیان لەناو دەریاکاندا بلاو دەکەنەوە و لە هەر کاتژمێرێکدا مەلایین مەلایین تەن ماسی لێ ڕاو دەکەن..

دەریاکان ئەو هەموو ڕاوەیان لێدەکرێ و کاریان لێ ناکات..!!

ئەو قوڵاییانەی کە ئەو گیانلەبەرانەی تێدایە جیاوازن، هەروەها لەهەر قوڵاییەکدا پۆلێ گیانداری جیاواز لەوی دیکەی تێدا دەژی!.

ئێمە لە ملیۆنەها نموونەی گیانەوەری دەریاکان، باسی چەند نموونەیەکی کەم دەکەین، کە شایەتی مەزنێتی بەدیهێنەر و، توانا و دەسەڵاتی دروست کار دەدات:

# ئەمیبیا




زیندەوەرێكی قەبارە وردە، لەناو گۆماو و زەلكاوەكاندا، یا لەسەر بەردە جێگیرەكانی ناو قوڵایی دەریاكاندا دەژی هەرگیز بە چاو نابینرێت، بە میكرۆسكۆبەكان لە شێوەی بارستاییەكی نەرم و لیق دەبینرێت كە بەگوێرەی گۆڕانی بارودۆخ شێوەكەی دەگۆڕێت... ئینجا كاتێك كە دەجوولێتەوە پاڵ بە چەند بەشێكی لاشەیەوە دەنێ كە بەگوێرەی گۆڕانی بارودۆخ و پێویستی یەكان شێوەی خۆی لێ دەسازێنێ. كاتێك دەجوولێتەوە، پاڵ بە چەند بەشێكی لەشی یەوە دەنێ ئەندامە زیادەكانی لێ دروست دەكات، وەكو قاچەكان بۆ پێ ڕۆیشتن بۆ شوێنی مەبەست بەكاریان دەهێنێ.

هەر بۆیە بەو ئەندامە زیادانە دەڵێن: (قاچە درۆیینەكان).. وە ئەگەر خۆراكێكی بۆخۆی بەدی كرد بە یەكێ یان دوو لەو ئەندامە زیادانە دەیگرێت و ئاوگێكی هەرسی بەسەردا دەرێژێت، ئینجا ئەوەی سوودی بۆ وی هەیە دەیكاتە خۆراكی و، پاشماوەكەشی لە لەشی دا دەردەكاتە دەرەوە.

ئەو زیندەوەرە بە هەموو لەشی یەوە هەناسە دەدات ئەویش بە وەرگرتنی ئۆكسجینی تواوە لە ناو ئاودا.. جا كوڕی شیرینم سەرنج بدە ئەو زیندەوەرەی كە بە هیچ جۆرێك بەچاوەكانی شت نابینێت!! لەگەڵ ئەوەشدا دەژی و دەجوولێتەوە و!! خۆراك دەخوات و هەناسە دەدات!! و پاشەڕۆكانی فڕێ دەداتە دەرەوە.. جا كاتێك گەشەی تەواو دەبێت، دەبێ بە دوو بەش.. تاكو هەر بەشێك ببێ بە گیانداریكی نوێ! فتبارك الله أحسن الخالقين.

## ئیسفەنج



ئیسفەنج هەتا سالانی (١٧٦٥ز)یش بە رووەك دادەنرا، بەڵام کاتێك زانا (ئەلیس) لە میانەی پشکنینی یەکێ لە جۆرەکانی ئیسفەنجی زیندوو، سەرنجی دا کە لە کنۆچکەکانی تەنیشتی ئاو دەچێتە ژوورەوە، لە دەرچەیەکی سەرەوەدا بە رێگەی دەرهاویشتن دەردەچێتە دەرەوە، گومانی لا درووست بوو لەوەی کە لەوانەیە ئەوەی وا دەیپشکنێ گیاندارێك بێت.

لە ساڵی (١٨٥٢ز) زانا (رۆبەرت گرانت) ئیسفەنجی خستە رێزی گیاندارەکانەوە.

هەروەها ئیسفەنج هەیە قەبارەی زۆر وردە بە ئەستەم نەبێ نابینرێت، هەشیانە قەبارەیان زۆر گەورەیە. هەروەك چۆن رەنگیشیان جیاوازە، زەرد و سەوز و، پرتەقاڵی و سور و شینیان هەیە..

لەسەر لاشەی دا چەندین کونی بچووك هەیە، لەسەرەوەشدا دەرچەیەکی فراوان هەیە.. جا ئاو لەو کونۆچکانەی کە کەوتۆتە لایەکانیەوە کە زیندەوەر و کەرستەی خۆراکی هەڵگرتووە دەچێتە ژوورەوە و، پاشەڕۆکانیش لە دەرچەی سەرەوە دەردەکرێنە دەرەوە، هەر لەبەر ئەمەش لە هەموو گیانلەبەرەکانی دیکەی جیهان جیا دەکرێتەوە بەوەی کە دەرچەی سەرەکی سەرەوەی بۆ دەردانی پاشەڕۆکان بەکار دەهێنێت نەك بۆ خواردنی خۆراك.

## ماسی

گیانەوەری ئاوین، لاشەیان وا دروست کراوە کە لەگەڵ ژیانیان لەناو ئاودا بگونجێت، لاشەیان لەبەلەم دەچێ، بۆ ئەوەی بتوانن لەناو ئاودا بمێننەوەو هەروەها چەند پەرەکەیەکیان لە شێوەی پانکە



هەیە، کە لەکاتی مەلەکردندا هاوسەنگیان لەناو ئاودا ڕادەگرێت، هەروەك چۆن یارمەتی سەرئاوکەوتنەوەشیان دەدەن، هەرچی کلکیانە دووفلیقانە و لەناوە ڕاست دا چەماوەتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن بەهۆیەوە ڕێڕەویان لەناو ئاودا بگۆڕن.. لە دروست کردنە سەیر و سەمەرەکانی خودای گەورە، هەبوونی توورەگەیەکی درێژکۆڵەیە لە بەشی پشتی ماسی یەکە کەوا بە ئەندازەیەك پڕە لە هەوا قەبارەی زیاد دەکات یاخود کەم دەکات، ئەمەش بەپێی پێویستی ماسی یەکە، ئەم توورەگەیەش پێی دەگوترێت توورەگەی سەرئاو کەوتن..

هەروەها ماسی چەند دەرچەیەکی دەرەکی هەیە، کە بریتی یە لە دەم و لووت و لمۆزەکان، لەگەڵ دەرچەکانی زاوزێ کردن و دەردانی پاشەڕۆ. لەو کۆئەندامە سەیر و سەمەرانەی کە لە ماسی دا هەن، لمۆزە، کە هەناسەی پێ دەدات کاتێك ئەو ماسی یە دەمی والآدەکات، ئینجا ئاو لێوەی دەچێتە ژوورەوە پاشان دەمی دادەخاتەوە، ئینجا ئاوەکە لە دەرچەکانی تەنیشتی دەمی ماسی تێدەپەڕێت بەرەو کەوانەی ریشەیی، لەوێوە ئۆکسجینی تواوە لە ئاوەکە بەدەست دێنێت و دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیش دەردەداتە دەرەوە.



## ئەستێرەی دەریا

گیاندارێکی ئاوییە لە شێوەی دا بە ئەستێرە دەچێت، لە رووی قەبارە و ڕەنگیاندا جیاوازن و، لە هەموو دەریاکاندا بەدی دەکرێن، لەشی ئەم گیاندارە لە خەپلەیەك پێك دێت، لە ناوەڕاستی دا دەم هەیە، لەو لەشە خەپلەیە پێنج پەلی هاوشێوەی یەکتری لێ دەبنەوە کە لە درێژی و قەبارەشیاندا یەکسانن.

ڕەنگی ڕووی سەرەوەی تیژترە لە ڕووی خوارەوەی.. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە پەڕەی ڕەق کە دەرکیان پێوە دیارە لەسەر لەشی بەدی دەکرێن، زۆر جاران گژوگیا و پاشەڕۆیان پێوە دەلکێت..

لەبەر ئەوەی دەبینین کە ئەو گیاندارە لەشی ئەندامۆچکەی هاوشێوەی مووکێشی لەسەر ڕوێنراوە کە بە هۆیانەوە پارێزگاری لە پاك و خاوێنی لەشی دەکات بەوەی کە ئەو پیسساییانەی کە بە درکەکانی یەوە نووساوە لایان دەبات و لێیان دەکاتەوە.

هەروەها ئەستێرەی دەریا ئەو گیاندارە نەرم و نۆڵانە دەکاتە خۆراکی خۆی کە دوو دەروازەیان هەیە، کە بە (موحار) دەناسرێن و بەرێگەیەکی زۆر سەیرو ڕاویان دەکات، کە ئەمە خۆی لەخۆی دا بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودای گەورە و ڕەحمەتی کە سەرجەم بوونەوەری داگرتووە، جا هەرکاتێك ئەستێرەی دەریا ئەو (موحار)ەی بەدی کرد، دەیخاتە ناو پەلەکانی یەوە و، لەشی خۆی بەسەردا دەچەمێنێتەوە و، هەروەها ژمارەیەك لە قاچەکانی بە دەروازەی (موحار)ەکەوە دەنوسێنێت، وە ئەوقاچانەی بە دوو ئاراستەی پێچەوانەی یەکتر توند و قایم دەکات بەهۆیەوە دەروازەکە دەبێتەوە.. وە ئەستێرەی دەریا زۆر خۆڕاگر و بە ئارامە، ئەگەر تووشی موحارەکی دەروازە بەهێز بوو، ئەوا بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو قاچانەی پێوە توند دەکات هەتا هێزی لەبەر دەبڕێ و، بە ناچاری لە بەرامبەر ئەو خۆڕاگری و بە ئارامی یەدا دەروازەکەی دەکاتەوە.

هەر کاتێك دەروازەکە کرایەوە ئەوا ئەستێرەی دەریا بەشێك لە گەدەی لە دەمی دێنێتە دەرەوە، ئینجا خۆی پێوە لوول دەدا پاشان دەست بە مژینی دەکات هەتا بە تەواوی قووتی دەدات.



## مـــەرجان

مەرجان لە بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکانی خودای گەورەیە، بە قوڵایی سێ سەد و پێنج مەتر لە ناو دەریاکاندا دەژی و، بە پەلەکانی خوارەوەی خۆی بە بەردێك یاخود گژوگیایەك ڕاگیر دەکات. دەرچەی دەمی کە لە سەرووی لەشی یەوە یە، بەرزترین شوێنی لاشەیەتی، کە بە ژمارەیەك گەندەپێ دەورە دراوە کە بۆخۆراکی بەکاری دەهێنێت، جا

ئەگەر نێچیرێك بەر ئەو گەندە پێیانە بکەون — کە زۆربەی جاران زیندەوەری ئاوی زۆر بچووکن- ئەوا دەست بەجێ تووشی ئیفلیجی دەبێت، ئینجا ئەو گەندە پێیانە بەرەو لای دەم دا وێك دێنەوە، کە لێرەدا نێچیرەکە بە کەناڵێکی تەسك دا، کە لە سورێنچکی مرۆڤ دەچێت، دەچێتە ژوورەوە.

یەکێك لە بەڵگە و نیشانەکانی توانای خودای بەدیهێنەر ئەوەیە کە گیانەوەری مەرجان بە رێگەیەکی دیکە زۆر دەبێت ئەویش تۆو پڕژاندنە، ئەو قۆپچانەی کە دروست دەبن بە یەکگرتوویی لەگەڵ ئەوتاکانەی کە تۆوەکەیان لێ پەیدا بووە دەمێننەوە، بەم شێوەیەش درەختی مەرجان دروست دەبێ کە خاوەن قەدێکی ئەستووره و، لقەکانیشی یەکجار وردن، درێژی درەختی مەرجانی دەگاتە سێ سەنتیمەتر، دوورگە مەرجانیە زیندووەکانیش ڕەنگیان جیاوازە، کەلەناو دەریاکاندا بەڕەنگی زەردێکی مەیلەو پرتەقاڵیە، یان سۆرێکی مەیلەو قاوەیی، یاخود شینێکی تۆخ، یا بە ڕەنگێکی ڕەشی تاریك دەبینین.

مەرجانی سوور، وەکو تەوەرەیەکی ڕەق دەمێنێتەوە لە دوای لەنێوچوونی بەشە زیندووەکانی ئەو گیانەوەرە، کە دەبنە پەیکەرگەلی بەردینی بیناکراوی زەبەلاح، پێشتر وا گومان دەبرا کە ئەو بینایانە لوتکەی گرکانینەو نقوومی ژێر ئاو بووینە!

زۆربەی ئەو بینایانە لەناو هەردوو زەریای هیندی و هێمن دا بەدی دەکرێن، بە شێوەیەك کە لە ئاوەکە بەرز دەبنەوە و فراوان دەبن هەتا لە فراوان بوونەکەیاندا دەگەنە ئەوەی کە شوێن داگیربکەن و شیاوی دنیشتوان بن، هەروەها ئەوانە هەر لە ژێر ئاوەوە دەمێننەوە، بەمجۆرە دەبنە مایەی مەترسیو هەڕەشە لە مەلەوانان دەکەن.

لەو بینایانە، زنجیرە تاوێرە بەردیە مەرجانیەکانە کە بە ناوی بەربەستی گەورەی مەرجانی ناسراوە، لە باکووری خۆرهەڵاتی ئوسترالیا بەدی دەکرێن، درێژی ئەو زنجیرەیە (١٣٠٠) میلە، پانییەکەشی (٥٠) میلە، لەو گیاندارە زیندووە قەبارە بچووکانە پێکهاتووە!!

## گيانەوەرى مروارى

لەوانەيە مروارى سەير و سەمەرەترين گيانەوەرى دەريا بێت، دەنيشێتە ناو قوولايى دەرياكانەوە، هەروەها ئەو گيانداراە لەناو سەدەفێكى توند و توكمەدايە بۆ ئەوەى لە مەترسيەكان بيپارێزێت، ئەو گيانداراە لە رووى پێكهاتن و رێگەى ژيانى دا لە گياندارەكانى ديكە جيادەبێتەوە، كە خۆى تۆرێكى وردە وەكوو تۆرى راوكردن، بە شێوەيەكى سەرسوڕهێنەر چنراوە، وەكوو پالاوگەيەك وايە كە رێگە بە چوونە ژوورەوەى ئاو و هەوا و خۆراك دەدات بۆ ناو لەشى، بەلام لم و وردە بەرد و هى ديكەش قەدەغەكات.

دەمەكانى ئەو گيانداراە لە ژێر ئەو تۆرە دايە، هەر دەمێكيش چوار لێوى هەيە، ئەگەر دەنكۆڵە لمێك ياخود پارچە بەردێكى بچووك، يانيش گياندارێكى زيانبەخش بە زبر بچێتە ناو ئەو سەدەفەوە، خێرا ئەو گيانداراە ماددەيەكى لينج دەردەدات و پێى پەردە پۆش دەكات، پاشان دەيبەستێت و دەبێت بە دەنكە مروارى، بە گوێرەى قەبارەى ئەو دەنكۆڵەى كە دەچێتە ژوورەوە قەبارەى مرواريەكەش جياواز دەبێت.

ئەمەو لەگەڵ هەزارەها بەڵكو مليۆنەها پۆلى ديكەى گيانداراە دەرياييەكانى وەكو پاراميسۆم و هى ديكەش. والله تعالى أعلم.

## تاريكى دەريا و، جووڵەى شەپۆلەكان



خوداى گەورە دەفەرموويت: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (النور: ٤٠)

واتە: "يا (كردەوەيان) وەك چەندەها تاريكايى وايە كە لە ناو دەريايەكى قووڵدا

شەپۆل لەسەر شەپۆل بدات بە سەریدا، لە سەروشیەوە هەورێكی تاریك دایگرتبێت، تاریكاییەكان چین چین لەسەر یەك نیشتبن، كاتێك كە دەستی دەربهێنێت خەریكە دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریكی) بێگومان ئەوەی خوا نووری پێ نەبەخشێت، هەرگیز نووری دەست ناكەوێت".

ڕاڤەكاران دەڵێن: لە (لسان العرب)دا هاتووە: (یغشاهُ): غَشَّيتُ الشيَ تغشيةً إذا غطَّيتُهُ. واتە: مانای (یغشاه): شتێك بە تەواوی داپۆشرێ و بشاردرێتەوە.

لُجِّي: واتە شەپۆلی دەریا: كە دەرك بە ژێرەكەی نەكرێ..وە (ولُج البحر)یش: ئاوێكی زۆرە كە ئەو سەر و ئەو سەری دیار نەبێت. وە (ولُج الليل): تاریكاییەكی زۆر ڕەشی شەو.

ئیمامی (قورطبي) لە ڕاڤەكردنی بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێ: (مەبەست لەو تاریكییانە: تاریكایی هەور و تاریكایی شەپول و تاریكایی شەو و تاریكایی دەریایە، ئەوەی لە نێو ئەو تاریكاییانە بێ هیچ شتێك نابینێت).

مرۆڤ لە كۆنەوە باوەڕی بە چەندین ئەفسانە لە بارەی دەریا و زەریاكانەوە هەبووە، ئەو كاتیش زانستی ڕاستەقینە لە بارەی حاڵی باوی ناو قوڵایی دەریاكان لای دەریاوانەكان فەراهەم نەبوو، بە شێوەیەك كە زانیاریەكان لە بارەی شەپۆڵەكانی دەریایی كەم و دەگمەن بوو.

ڕۆمانی كۆن باوەڕیان وا بوو كە ماسی مژۆك لەناو دەریادا هەنە و كاریگەری جادوویان لەسەر وەستاندنی جوولەی كەشتی یەكاندا هەیە سەرەڕای ئەوەی زۆر باش دەیانزانی كە بایەكان كاریگەریان لەسەر شەپۆل و ڕەوتەكانی ڕووی دەریاكاندا هەیە، بەڵام زۆر ئەستەم بوو توانرا، شتێك لە بارەی جوولە ناو خۆییەكانی ناو دەریاكان بزانرێ.

مێژووی زانستەكان بۆی باسكردووین، كە توێژینەوە پەیوەندارەكان بە زانستەكانی دەریا ناسی دەستی پێنەكردبوو تەنیا لە سەرەتای سەدەی هەژدەم نەبێت، كاتێك ئامێری گونجاو بۆ ئەو جۆرە توێژینەوە وردەكارانە داهێنران، لەوانیش ئەو ئامێرە بوو كە بۆ پێوانەی قووڵی تیشك بڕ لە ئاوی زەریاكاندا بەكارهێنرا كە ناوی (پەیكەی سیتشی) كە گوزارشتە لە پەیكەیەكی سپی كە بە ناخی ئاودا دەبرێتە خوارەوە بۆ ئەوەی ئەو قوڵاییەی كە ناتواندرێت ببینرێت وەكو خاڵێكی پێوانەیی تۆمار بكات.

لەگەڵ كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم هۆیەكانی وێنەگرتن بەكار هات كە لە میانەی ساڵانی سییەكانی سەدەی بیستەم پەرەی پێدرا، كاتێك كە خانە كارۆ ڕووناكی یەكان بەكار هێنرا.

فەزڵی ڕاڤەكردنی دیاردەی شەپۆڵە ناو خۆیەكانی دەریا بۆ دكتۆر (ئیكمان) لەسەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە.

# چەند ڕاستیەکی زانستی

* زاناکان ئاشکرایان کردووە کە دەریا و زەریاکان بە هەوری کەڵەکە بووی چڕ داپۆشراون کە بەری بەشێکی گەورەی تیشکی خۆر دەگرن.

* ئاوی دەریاکان بەرە بەرە ڕەنگەکانی شەبەنگە ڕووناکی هەڵدەمژن ئەمە هەر کاتێك ئەم ڕەنگانە زیاتر قووڵ بوونەوە، بەمەش ئاست گەلێك لە تاریکاییەکان لەناو ئەو دەریایانە دروست دەبن و لە دوای قوڵایی (١٠٠٠) مەتر تاریکایی گەلێك زۆر دەبێت، هەتا ئەگەر مرۆڤ دەستی خۆی دەربێنێت نایبینێت.

* زانستە دەریاییە تازەکان ئاشکرایان کردووە کە شەپۆڵ گەلێکی توند و بەهێز لەناو دەریا قوڵەکاندا هەیە.

* زاناکان توانیویانە لە نێو دەریا قووڵەکاندا بە قوڵایی نێوان (٦٠٠ تا ٢٧٠٠) مەتر ئەو ماسییانە ببینن کە ئەندام گەلێکی ڕۆشنکەرەوە بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی لەناو تاریکاییەکەدا ڕێ بەدی بکەن و نێچیری خۆیان ڕاو بکەن.

هەروەها (گیرلۆف) لە کتێبەکەی (marine optics) دا باسی کردووە کە ئاستی ڕۆشنایی لەناو ئاوی زەریا ئاشکراکاندا لە قوڵایی (٣٥) مەتردا بەبەردەوامی لەگەڵ ڕووکارەکەی بۆ ڕێژەی (١٠٪) دادەبەزێت، وە لە قوڵایی (٨٥) مەتردا بۆ ڕێژەی(١٪) دادەبەزێت، وە لە قوڵایی (١٩٠) مەتردا بۆ ڕێژەی (١. و ٪) دادەبەزێت. هەروەها لە دوای قوڵایی (١٠٠٠) مەتر تاریکاییەکە یەکجار زۆر دەبێت.

ڕۆڵەی شیرینم ئەو ڕاستی یە زانستی یە سەرسوڕهێنەرانەی سەرەوە قورئانی پیرۆز باسی کردوون کە دابەزیوەتە سەر عەرەبەکان لە بیاباندا، کە نە دەیانزانی مەلەوانی چیە، نەدەشیان زانی نقووم بوونو چوونە نێو دەریا و زەریاکان چی یە، وەکو لە سورەتی (النور)دا هاتووە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (النور: ٤٠).

ئەو ئایەتانە لەگەڵ ئەو ڕاستی یە زانستیانەدا هاوڕێکن، کە ئاشکرای کردووە زۆربەی جاران دەریا قووڵەکان هەورگەلێکیان بەسەرەوە دەبێت. هەروەها گوتەی خودای گەورە: (أو كظلمات) بەڵگەیە

لەسەر نەدیتنی شتەكان و ئەوەی جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە گوتەی خودای گەورەیە كە دەفەرمووێت: (في بحر لجيّ) جا وشەی (لجیّ) واتای تاریكاییەكی زۆر رەش و زۆر قووڵ دەگەیەنێت، هەروەها ماسی یەكان لەو قولاّییەدا چاویان نییە، بەڵكو لە جیاتی چاو، بە رونـاكی یـەكی بـایۆلۆجی ئامـادە كـراون هـەروەك لـە ئەنـسكلۆپیدیای بـەریتانی دا هـاتووە.. ئەمـەش واتـای ئـەو ئایەتـەی خـودای گـەورە دەگەیەنێت: (ومَن لم يجعل الله لهُ نورا فما له من نور) جا ئەو ماسـیانە لـە میانـەی ئەنـدام گـەلێكی رووناكی بەخشدا كە خودای گەروە لە لاشـەیانی دروسـت كـردووە دەتـوانن رێـرەوی خۆیـان ببیـنن و بناسنەوە!

قولاّیی لێژی دەریا، رەنگی بە شێوەیەكی پلە بەندی دەگۆرێت بۆ رەنگی شـین هـەتا لەگـەڵ زیـاد بوونی قولاّیی بە تەواوی دیار نامێنێت، هەروەكو چۆن رەنگە گوزەربووەكانی شەبەنگی رووناكی بۆ ناو دەریاكان لەگەڵ زیاد بوونی قولاّییەكەدا پێچەوانە دەگونجێت، چـونكە هەرچـەندی قـولاّیی زیـاد بێـت تاریكاییەك دروست دەبێت بەربەست دروست دەكات بـۆ بینـینی هەنـدێك لـە رەنگـەكانی شـەبەنگی رووناكی.

بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی (ظُلُمات) واتە تاریكاییەكان ونەیفەرموو (ظلمـة) واتە تاریكییەك، هەروەها فەرموویەتی: (ظلماتٌ بعضها فوق بعض) واتە: (تاریكاییەك چین چین لەسەر یەك نیشتوون).

دكتۆر (ولیام هی) سەرنجی دا كە راوچیەكان دەتوانن رەنگە جیاوازە دیارەكانی ئاو بەكار بهێنن بۆ دیاری كردنی قـولاّیی بەشـێوەیەكی زۆر ورد، سـادەترین ئـامێری زانـستی بـۆ پێوانـەكردنی قـولاّیی گوزەركردنی رووناكی بە ناو ئاوی زەریاكان، دیسكی سیتشی (the secchi disx)یەكە لـە ئاوەكـەدا دەبرێتە خوارەوە بۆ تۆمـاركردنی ئـەو قولاّییـەی كـە ناتوانرێـت ببینرێـت وەكـو خـاڵێكی پێوانـەیی (بنەرەتی).

# جووڵەی شە پۆڵەكانی ناوەخۆ



بێگومـــان وێنـــەی چـــینە شەپۆلەكان كە لەسەر رووی دەریاوە بەسەر یەكتر دەكـەون، مرۆڤـەكان سەرسـام دەكـەن، ئـەم دیاردەیـەی شـــەپۆلەكان بـــە تـــەواوی لـــەلای دەریـــاوان و راوچـــی یەكانـــەوە ناشنایە، بەلام لە هەموان سەیر و سەمەرەتر ئەوە كە مرۆڤ تەنیا سەد ساڵ پێش ئێستا پێی ئاشنا بـووە، ئەو شەپۆڵە ناوخۆیانەیە كـە لـەناو قولایی دەریاكاندا بوونیان هەیە، كەلەسەر رووكاری جیاكەرەوەی نێوان دوو چینی ئاو پەیدا دەبن كە لە رووی چڕی و پاڵەپەستۆ و پلەی گەرمیی و هەلكشان و داكشان و كاریگەری بایەكاندا جیاوازن..

جیاوازی لە چڕی زەریاكراوەكان كەمترە لەو ناوچـە كەناریانـەی كـەوا ئـاوی پـاكی لـە رووبـار و جۆگەكان و هی دیكەشی تێدەرژێن.. رووكاری جیاكراوە لە نێوان چرییە جیاوازەكان دا لە ناوچەی پلەی گەرمیی دابەزیوی سەرەكی دروست دەبێت، ئینجا ئاوی رووكاری گەرم لە ئاوی قولاییەسـاردەكان جیـا دەكاتەوە.

ئەستووری چینی ئاوی گەرم لە نێوان دەیان و سەدان مەتر دەبێت.

خودای گەورە دەفەرموێت: (فِي بحر لجيٍّ يغشاه مـوجٌ مـن فوقـه مـوجٌ مـن فَوقـهِ سـحاب) واتـە شەپۆلەكە، دەریا زۆر تاریكەكە دادەپۆشێت، ئەمەش ئەوەیە زانا دەریاناسەكان دووپاتیـان كردۆتـەوە، گوتویانە دەریای قووڵی زۆر تاریك جیاوازە لە دەریای رووكـاری، شـەپۆڵە ناوخۆییـەكانیش تـەنیا لـە ناوچەی جیاكاری نێوان دەریای رووكاری و دەریای قولڵدا دروست دەبن.

ئەم شەپۆڵە ناوەخۆییانەش هەمەجۆرن، گرنگترینیان ئەمانەن كە لە گـەروو كەناڵەكانـدا دروسـت دەبن، بۆ نموونە لەلای گەرووی چیای تاریق دا ئـەو تەوژمـە ناوەخۆییـەی شـەپۆڵی رووكـاری بـەهێز و تەوژمی دەرەكی شەپۆڵی ژێـردوە دەبنـە هـۆی چـوونە ژووردوەی شـەپۆڵە ناوەخۆییـەكان لـە زەریـای

ئەتلەنتیكیەوە بۆ ناو گەورەكە، كە وەكو ئەوەی شـەپۆڵگەلێكی تێـك شـكاو بـن، هـەروەكو شـەپۆڵە كەفینەكانی لێواری دەریاكان، كە دەبنە هۆی درووست كردنی رێژەیەكی زۆر لە پشێویەكانی ناوەخۆ.

كەواتە: لەوێدا هەور و شـەپۆلی ڕووكـاری و شـەپۆڵگەلی نـاوەخۆیی هـەن، جـا ئەگـەر تیـشكە ڕووناكیەكان لە خۆرەوە هاتن، ئەوا هەورەكان هەندێكیان دەمژن بەمەش تاریكاییـەك دروسـت دەبـێ، هەروەها ئەگەر ئەو تیشكانە كەوتنە سەر شەپۆلی ڕووكاری دەریا ئەوا بە هەمان شـێوە ئـەو شـەپۆڵە هەندێك لەو تیشكانە دەداتەوە، جا ئەگەر ئەو تیشكانە چوونە خوارەوە بۆ شەپۆلی ناوخۆیی، ئەوا ئـەو تیشكانە دەدرێنەوە و تاریكاییەكی دیكە دروست دەبێت، پاشان چڕی ناوی قولاییەكەش پاشماوەی ئـەو تیشكە بە قولایی (١٠٠٠م) هەڵدەمژێت، بەمەش تاریكایی لەو ناوچەیە واتـە لـە نـاو دەریـا قوولـە تاریكەكەدا دروست دەبێت (**ظلمات بعضها فوق بعض**).

*گرووپێك لە ماسـی یەكان لەوانەش پۆلی (osteichthyes) لە ئـەو پـەڕی قـولایی زەریاكانـدا وەكو لە قولایی (٦٠٠م) بەسـەرەوە هەتا دەگاتە (٢٧٠٠م) بوونیـان هەیـە و لـە(٢٠٠٠ هـەتا ٩٠٠٠ پێدا) ئەو گرووپانەی كە نوێنەرایەتی زیاتر لە خێزانەكانی ماسـی دەریایی دەكەن، بـە دەمـی گـەورە و هەبوونی ئەندامی ڕووناكی بەخش لەسەر هەندێك یـاخود چـەند بەشـێكی لەشـیان جیـا دەكرێنـەوە.. هەروەها ئەو ئەندامانەی كە ڕوونـاكی بەرهـەم دێـنن هەڵدەسـتن بـە ڕاكێـشانی سـەرنجی نێـچیر یـا هاوجووتی خۆیان.

ئەو جیاوازیانە و هی دیكەش لە سیما سەیر و سەمەرەكانە كە ماسی یەكانی دەریای قـوولی پـێ جیا دەكرێنەوە، پەرەسەندنی خۆگونجاندنەكانیان لەگەڵ پاڵەپەستۆی توند و ساردی بەدیار دەكەوێت، بە تایبەتیش لەگەڵ ژینگەكەیان.

* كوڕی شیرینم ئەوەش بزانە شـەپۆلەكان لـە ڕووكارەكـانی نـاوەوەی زەریاكانیـشدا هەنـە، ئـەو ڕووكارانەش بریتین لە چینگەلێك لەو گۆڕانكاریە خێرایەی چڕی ناو لەگەڵ زیاد بـوونی قـولایی و ئـەو شەپۆلانەی كە هاوڕێیەتی دەكەن و بە شەپۆڵە ناوەخۆییەكان ناو دەبرێن.

هۆی هەبوونی ئەم شەپۆڵە ناوەخۆییانەش وان لەژێر كاریگەری هێزەكانی هەڵكشان و داكـشاندا، یاخود لەژێر كاریگەری بایەكان، یا هەندێ جار لە ژێر كاریگەری بەرز بوونەوە و دابەزینی پاڵەپەستۆدا دەبن، دەكرێ كەشتیەك ببێتە هۆی درووست كردنـی شـەپۆڵە ناوەخۆییـەكان ئەگـەر بێـت و چـینێكی قولایی كەم و خوێیاوی لەوێدا هەبێت.

* زانا (نیکمان) لە بیردۆزەکەی و بەهرە ئەزموونکاریەکانی لە توێژینەوەکەیدا ئەوەی دیتەوە کە ئاو دەبرێ بەو ئاوە وەستاوەی کە دەبێتە هۆی جوولانەوەی لەسەرخۆی بەلەمەکان بۆ ئەوەی لەشوێنی خۆیاندا بێن و بچن، بەهۆی بڵاوبوونەوەی چینێکی ئاوی شیرین لەسەر ئەو دەریایە، بەهۆی توانەوەی بەفرەکان هاتووە.

## ڕووە ئیعجازیەکەی

ڕووی ئیعجاز لەو ئایەتە قورئانیە پیرۆزەدا ڕاگەیاندنی ڕاشکاوانەیە بە هەبوونی تاریکایی گەلێکی کەڵەکەبوی چین لەسەر چینە لەناو قوڵایی دەریاکاندا، هەروەها هەبوونی شەپۆلگەلێکی ناوەخۆیی لەناو دەریا و زەریا قووڵەکاندا ئەوانەی زۆربەی جاران هەوری کەڵەکەبوو دایان دەپۆشێت کە ڕێگە لە بڕێکی زۆری تیشکەکانی خۆر دەگرێت، ئەمەش توێژینەوەکانی زانایانی دەریاناسی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا دۆزیوەتیانەوە لە سەدەی بیستەمدا، زانستی نوێ دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەری دۆزیەوە، کە تەنیا لەناو دەریا قووڵە تاریکەکاندا ڕوودەدات، ئەویش ئەوەبوو ئەگەر شەبەنگی ڕووناکی گەیشتە قوڵایی (٥) مەتر ئەوا ڕەنگی سوور دیار نامێنێت، کە گەیشتە قوڵایی (٣٠) مەتریش تاریکاییەکی دیکە دەست پێدەکات و ڕەنگی پرتەقاڵی دیار نامێنێت، کە گەیشتە قوڵایی (٥٠) مەتریش تاریکایی ڕەنگی زەرد دەست پێدەکات، ئینجا لەماوەی دووری (١٠٠) مەتریشدا ڕەنگی سەوز بزر دەبێت، پاشان لەماوەی (٢٠٠) مەتریشدا ڕەنگی شین بزر دەبێت (**ظلمات بعضها فوق بعض**) کە گەیشتە قوڵایی (٥٠٠) مەتریش لەوێدا جولەی ڕەنگی ڕەش دەست پێدەکات، بە شێوەیەك کە ژێرئاوگەر لەو قوڵاییەدا تەنیا شتێك لە شێوەی سێبەردا دەبینێت.

(إذا اخرج یدهُ لم یکد یراها). کوڕی شیرینم وەسفی قورئان زۆر وردە چونکە نەیفەرمووە (لم یَرَها) ، بەڵکو فەرموویەتی: (لم یکَد یراها) چونکە لێرەدا هێشتا دیتنێك هەیە بەڵام ڕەنگی ڕەشە..

ئەو ئایەتە هەر بە ئەوەندە ڕاناوەستێت، بەڵکو خودای گەورە دەفەرمووێت: (یغشاه موجٌ من فوقهِ موجٌ من فوقه سحاب) جا ئایا لێرەدا زیاتر لە شەپۆلێك هەیە؟

بەڵێ کوڕی شیرینم: زانستی نوێ ئاوا دەڵێ.. ئەوەتا لە ساڵی (١٩٠٠ز)دا هەبوونی دوو شەپۆڵ لەناو دەریادا دۆزرایەوە، شەپۆڵێکی ڕووکاری ئەمەش ئەوەیە کە ئێمە دەیبینین، شەپۆڵێکی

ئاوەخۆییش کە هەمیشە پێچەوانەی شەپۆلی ڕووکاریە.

ئالێرەدا وێنەکەمان بۆ تەواو بوو، ئەوەتا لێرەدا شەپۆلێکی (ئاوەخۆیی) لە سەرووی ئەویشەوە شەپۆلێکی (ڕووکاری) لەسەرووی ئەویشەوە هەورەو ئاسمان هەیە.

ئەو هەقیقەتە لەدوای دانانی سەدان وێستگەی دەریایی و.. وێنەگرتن بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە پێی گەیشتن.. ئەوەی ئەو قسەیەشی گوت پرۆفیسۆر (شرایدر) بوو، کە یەکێکە لە گەورەترین زانای دەریاکان لە ئەڵمانیای خۆرئاوادا.. ئەو دەیگوت، ئەگەر زانست پێشکەوت ئەوا دەبێ ئایین پاش بکەوێت.. بەڵام کاتێك گوێ بیستی مانای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بوو تاساو وتی: ئەوە نابێ قسەی بەشەربێ.

# بەربەستەکانی ئاو

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ * بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ * فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ * يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾ (الرحمن: ١٩-٢٢)

**واتە: (ئاوی دوو دەریای بەیەك گەیاندووە تێکەڵیش نابن * چونکە لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە نایەڵێت تێکەڵ بن * جا ئیتر بەکام لە ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕواناکەن، کامەی پەسەند ناکەن * لەو دوو جۆرە دەریایە مرواری و مەرجان دەردەچن).**

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً﴾ (النمل: ٦١)

**واتە: لەنێوان دوو دەریاکەشدا بەربەستی بەرپا کردووە).**

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخاً وَحِجْراً مَّحْجُوراً﴾ (الفرقان: ٥٣)

**واتە: (هەر ئەو زاتەیە کە ئاوی دوو دەریا یان دوو ڕووبار لەپاڵ یەکدا، ئەمەیان شیرین و خۆش و سازگار، ئەوەی تریان تفت و تاڵە، لەنێوانیاندا بەربەست و کۆسپی فەراهەم هێناوە ناهێڵێت تێکەڵ بن).**

## ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دەڵێن:

(مَـرَجَ): دوو مانای هەیە، یەکەم: تێکەڵ و، دووەمیش: هاتن و چوون و پشێوی. هەروەها(زجـاج) دەڵێ: (مَرَجَ): تێکەڵ بوو، واتە دەریای سوێر و دەریای سازگار و شیرین. مانای (لایبغیان): واتە ئاوە سوێرەکە دەست درێژی ناکاتە سەر ئاوە سازگار و شیرینەکە تا تێکەڵاو بن.

(أُجاج): واتە ئاوی سوێر. دەشڵێن: واتە ئاوی تفت و تاڵ. دەشڵێن: واتە ئاوی زۆر تـاڵ. هـەروەها دەڵێن (الأجاج): واتە زۆر گەرم.

خودای گەورە فەرموویەتی: (وهذا مِلحٌ أجاج) کە ئاوی زۆر سوێر و تفت و تاڵە وەکو ئاوی دەریـا، (الأجاج): ئاوی خوێیاوی و زۆر سوێر. وە (أجیج الماء) واتە: دەنگی ڕژانی ئاو.

(الحِجر): (الحِجر و الحَجر)، واتە: قەدەغەکردن و تـەنگ کردنـەوە، (ئیبنـو منظـور) دەڵـێ: (لقـد تحَجَرت واسعاً) واتە ئەوەی خودای گەورە فراوانی کردووە تۆ تەنگت کردۆتەوە و تەنیا بۆخۆت داتناوە و هی دیکەت لێ بێ بەش کردووە. بۆیە کوڕی شیرینم بە عەقڵ دەڵێن (حجـر) چـونکە قەدەغـە کردنـی کارێك دەکات کە پێویـست نیە بکرێت.

أ- بەربەستی نێوان دوو دەریا:

زۆرینەی ڕاڤەکاران بۆ ئـەوە چـوونە، کـە ئـەو بەربەسـتەی هـەردوو دەریـای نـاوبراو لـە یـەکتر جیادەکاتەوە بریتی یە لە بەربەستێکی توانای خودای گەورە و بەچاو نابینرێت، ئیمامی (ئیبنولجەوزی) لە بارەی (بەرزەخ)ەوە دەڵێ: (مانعٌ من قُدرَةِ اللهِ لا یَراهُ أحدٌ) (زاد المسیر ٦/٩٠) واتـە: بەربەسـتێکی توانای خودایە کەس نایبینێت. هەروەها زمەخشەری و قـورطبـي و بیقـاعی و هـی دیکـەش هـەروا دەڵێن.

ب- بەربەستێك لە نێوان ڕوباری سازگار و دەریای سوێر: (تەبەری) دەڵێت: مەبەست لـە (العـذبُ الفرات): واتە ئاوی رووبارەکان و بارانەکان و ،مەبەست لە (الملح الأُجاج)یش: واتە ئـاوی دەریاکـان، وە مانای ئەودش ئەوەیە کە لە نیعمەتەکانی خوای مـەزن بەسـەر دروسـت کراوەکانیـدا، ئـاوی رووبـاری سازگار و شیرین تێکەڵ بە ئاوی دەریای سوێری تفت و تاڵ دەکات، پاشان بـە قـەزا و قـەدەری خـۆی، سوێراوەکە قەدەغە دەکات کە ئاوە سازگار و شیرینەکە بگۆڕێت و تامی تێك بدات!.

هەروەها گوتەی خوای گەورە: (وجعل بینهما برزخـا) واتە بەربەسـتێکی دانـاوە کـە هەریەکـەیان قەدەغەدەکات کەوا ئەوی دیکەیان تێك بدات.

هەروەها (وحجراً محجوراً) واتە حەرامی کردووە بۆ هەریەکەیان کە ئەویتر خۆی بگۆڕێت.

لە (موجاهید)ەوە هاتووە کە دەڵێ: واتە بەربەستێکی ئەو تۆ کە هیچ کەس بەچاو نایبینێت.

(وجعل بینهما برزخا) موجاهید دەڵێ: (البرزخ) واتە ئەمانە هەردووکیان پێك دەگەن بەڵام تێکەڵ بە یەکتر نابن، (حجراً محجوراً) واتە سوێراتی ئەو تێکەڵ بە سازگاری و شیرینێتی ئەو نابێت، هیچ کامیان دەست درێژی ناکەنە سەر ئەوی دیکەیان.

کوڕە شیرینەکەم لە کاتێکدا ئێمە ئاماژە بەو قسانە دەدەین، بەڵام بۆ ڕاڤەکاران ئاسان نەبووە کە پەی بە سەرجەم ئەو نهێنیە زانستیانە ببەن کە ئایەتەکان باسیان کردووە، چونکە بە چاوی خۆیان نەیان دیوە، تا لێرەشدا لە هۆی فرەیی گوتەکانیاندا لە ڕاڤەکردنی واژەی (مرج) و (البرزخ) و (حجراً محجوراً) دەگەین کە لەبەر کەم و کوڕی زانست و زانیاری بەشەری بووە بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو.

# پێشەکییەکی مێژوویی

بێگومان وەسفی مێژوویی پێشکەوتنە زانستە دەریاییەکان ئەوە دەدات بە دەستەوە، کە هیچ زانیاریەکی زانستیانە دەربارەی ئەو بابەتە لە ئارا دانیە، بەڵکو زانستە دەریاییەکان بەرەو پێشەوە نەچوبوون، تەنیا لەم دوو سەدەی دوایی نەبێ، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دا، چونکە قوڵایی دەریاکان بۆ مرۆڤەکان نادیار بوون قسەی پڕوپووچ و ئەفسانەگەلێکی زۆریان لە بارەیەوە دەگوت.

پاشان زانستی زەریاکان دەستی کرد بەوەی لەناو زانستە تازەکان شوێنی خۆی بگرێت، ئەمەش کاتێك کەشتی بەریتانی (تشالنگر) گەشتی خۆی بە دەوری جیهان (لە ساڵانی (١٨٧٢-١٨٧٦ز) ئەنجام دا، بەوەی کە یەك لەدوای یەك گەشتە زانستیەکان بۆ دۆزینەوەی دەریاکان ئەنجام درا.

کوڕە شیرینەکەم لە ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەم دا، توێژینەوەکانی دەریایی کە لە وێستگەکانی دەریایی دا ئەنجام دران ئاشکرایان کرد دەریا سوێراوەکان دەریای جیاوازن لەوێدا بەربەستێك هەیە کە دوو دەریای سوێراو لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

پاشان توێژینەوەی زانستی زەریاکان بەرەو پێشەوە چوو، مانگە دەستکردەکانیش کاریگەری گەورەیان لەسەر ئەو بەرەو پێشەوە چوونە هەبوو، زاناکان توانیان چەند وێنەیەکی بەربەستەکان و هەروەها ڕێژگەی ڕووبارەکان و جیاوازی پلەی گەرمیی و پیس بوونی ژینگە بەدەست بهێنن.

# چەند ڕاستی یەکی زانستی

* لە نێوان دەریا سوێراوەکاندا، بەربەست گەلێکی ئاوی بەدی دەکرێن پارێزگاری لە تایبەتمەندیە جیاکەرەوەکانی هەر دەریایەك دەکەن.

* تێکەڵاو بوون لە نێوان دوو دەریا بەدی دەکرێن سەرەڕای هەبوونی بەربەستیش، بەڵام تێکەڵاو بوونێکی هێواش‌و لە سەر خۆ بە شێوەیەك کە ئەو بڕە ئاوەی کە لەو دەریاوە دەچێتە دەریاکەی دیکەوە دەگۆڕێت بۆ تایبەتمەندیەکانی ئەو دەریایەی کە بۆی گواستراوەتەوە بەبێ ئەوەی کاریگەری بکاتە سەر تایبەتمەندیەکانی ئەو دەریایە.

* توێژینەوە دەریاییەکان ڕوونیان کردۆتەوە، کە مەرجان تەنیالە ناوچە دەریاییەکانەوە بەدی دەکرێت‌و لە ناوچە ئاوە سازگارو شیرینەکاندا بەدی ناکرێت.

* ئاوەکان دەکرێن بە سێ جۆرەوە (ئاوی ڕووبارەکان، ئاوی دەریاکان، ئاوی ناوچەی ڕێژگە)

* بەیەك گەیشتنی ڕاستەو خۆ لە نێوان ئاوی ڕووبارو ئاوی دەریادا لە ناوچەی ڕێژگەدا بەدی ناکرێت، ئەویش لە بەر هەبوونی بەربەستی ئاوی، کە ئەو ناوچەیە دەورە دەدات‌و هەردوو ئاوەکە لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

* ناوچەی ڕێژگە بە بەربەستێك بۆ ئەو گیانەورانە دادەنرێت کە لە ناویدا دەژین‌و هەروەها بەربەستێکی قەدەغەکراویش دادەنرێت بۆ ئەو گیانەورانەی کە لە دەرەوەیدا دەژین!.

## ڕاڤەکردنی زانستیانە:

ڕوڵەی شیرینم زاناکان لە ساڵانی چلی سەدەی بیستەمدا، ئاشکرایان کرد، کە دەریا سوێرەکان دەریای جیاوازن لە ڕووی ڕێزبەندی‌و تایبەت مەندیەکاندا، ئەوش بەدی نەهات تەنیا لە دوای ئەو نەبێت کە توێژەرەوەکان وێستگە دەریاییان دامەزراند بۆ شیکردنەوی نموونە لە ئاوی دەریاکان..

ئەوە بوو جیاوازیەکانیان لە پلەی گەرمی‌و ڕێژەی سوێری‌و ئەندازەی چڕی‌و توانەوەی ئۆکسجین لە ئاوی دەریاکانی ناو هەموو زەریایەك پێوانەکرد، ئینجا دەرکیان بەوەکرد کە دەریاکان جیاوازن، پاشان زاناکان گەیشتنە ئەوەی کە بەربەستە ئاوییەکان بدوزنەوە کە دوو جۆرن:

* جۆری یەکەمیان: بەربەستی نێوان دوو دەریای سوێراو:

((کوری شیرینم توێژینەوە تازەکان ئاشکرایان کردووە دەریاکان سەرەرای ئەوەی وابەدیاردەکەون

هاوشێوەی یەكن، بەڵام جیاوازی گەورە لەنێوانیاندا هەیە، وە لەو ناوچانەی دوو دەریای جیاواز بە یەكتر دەگەن بەربەستێك لە نێوانیاندا بەدی دەكرێ..

ئەو بەر بەستە هەردوو دەریاكە لە یەكتر جیا دەكاتەوە بەشێوەیەك كە هەردەریایەك پلەی گەرمیو سوێریو چڕی تایبەت بەخۆیان هەیە)).

لە نێوان ئاوی دەریای سپی ناوەڕاستی گەرمو سوێراودا لەكاتی چوونە ژوورەوەی بۆ ناو زەریای ئەتلەنتیكی كە ئاوەكەی ساردەو چڕیەكەشی كەمترە چەند بەربەستێك هەیە. هەروەك چۆن بەربەستی لەم شێوەیە لە نێوان ئاوی دەریای سوورو ئاوی كەنداوی عەدەندا هەیە، ئەوەی زانستی نوێ لەو سەدەیەدا پێی گەیشتووە بریتیە لە مانای ئاشكرای بەیانی قورئانی لە سورەتی (الرحمن)دا كە دەفەرمووێ: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾الرحمن:١٩﴾. قورئان لە بارەی دوو دەریای سوێراوی جیاواز دەدوێت، بەڵگەش لە سەر ئەمە ئەوەیە زانایانی ڕاڤەكردن باسیان كردووە ئەگەر واژەی (البحر) لە قورئاندا بەڕەهایی بەبێ وابەستە هات، ئەوە مەبەستی ئاوی دەریای سوێراوە، پاشان كوڕەشیرینەكەم ئەگەر دوو دەریاكە وەكو یەك بوونایە ئەوا دەبوونە یەك دەریا، ئەو جیاكردنەوە لە نێوانیاندا كە لە واژەی قورئانیدا هەیە، بەڵگەیەكی زانستی وردە لە سەر هەبوونی جیاوازی لەنێوانیاندا لەگەڵ ئەوەش كە هەردووكیان سوێراون.

هەروەها بەڵگەیەكی دیكەش كە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە، ئەوەیە كە وەسفی هەردوو دەریای كردووە بەوەی مرواریو مەرجانیان لێ دەردەهێنریت، زاناكان ئاشكرایان كردووە كە مرواریو مەرجان تەنیا لە نێو دەریا سوێرەكاندا بەدی دەكرێنو لەناو ئاوی سازگارو شیریندا یا لەو ناوچانەی ئاوە سازگارو شیرینەكان لەگەڵ دەریاكاندا تێكەڵ دەبن بەدی ناكرێت.

لە ساڵی (١٩٤٢ز) توێژینەوە زانستییەكان بۆ تایبەتمەندیەكانی دەریاكان هەبوونی چەند بەربەست گەلێكی ئاوی بەدیارخست كە دەریا بەیەك گەیشتووەكان لە یەكتر جیادەكاتەوە، ئەمەش ئەوەیە كە خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێداوە كە دەفەرمووێت: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ﴾الرحمن:٢٠. (البرزخ) واتە: بەربەست. هەروەها لە ئایەتێكی دیكەش خودای گەورە ئەمە دووپات دەكاتەوەو دەفەرمووێت : ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً﴾النمل:٦١.وە (لایبغیان) واتە: هیچ یەك لەو دوو دەریایە ستەمو دەست درێژی! ناكاتە سەر ئەویتریان كە ببێتە هۆی گۆڕینی تایبەتمەندیەكانی.

كوری شیرینم هەروەكو چۆن هەبوونی تێكەڵاو بوون لە نێوان دەریا سوێراوەكاندا بۆ زاناكان ئاشكرا بووە سەرەڕای بوونی ئەو بەربەستانەش، قورئانی پیرۆز باسی كردووە: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ

يَلْتَقِيَانِ﴾الرحمن:١٩. (المرج) واتة: تێكةلاَو بوون، يا هاتنء ضوونء ناجيَطير بوون.

بەڵام ئەو تێکەڵاوبوونە لەسەرخۆ دەبێ بەشێوەیەك کە والەو برە ئاوەی کە لە دەریایەکەوە دەچێتە نێو دەریایەکەی دیکەوە دەکات، بگۆڕێت بۆ تایبەتمەندیەکانی ئەو دەریایەی بۆی گواستراوەتەوە، بەبێ ئەوەی کاریگەری بکاتە سەر ئەو تایبەتمەندیانە.. ئەمەش لە بەر ئەوەی ئەو بەربەستانە پارێزگاری لە تایبەتمەندیە جیاوازەکانی هەر دەریایەك دەکەن لە ڕووی چڕیو سوێریو گیانـدارە ئاویـەکانیانو پلـەی گەرمیو توانای توانەوەی ئۆکسجین لە ناو ئاوەکەیاندا.

دووەمیان: بەربەستی نێوان ڕووباری سازگارو دەریای سوێراو:

* چۆنیەتی بە یەك گەیشتنی نێوان ئاوی ڕووبارو ئاوی دەریـا (ئـاوی تـێڕژاو)، هـەر لەکۆنـەوە خەڵك دیویانە کە ئاوی ڕووبارەکان دەڕژێنە ناو ئاوی دەریاکانەوە، هـەروەکو چـۆن سـەرنجی ئەوەشـیان داوە هەرچەندی بە ناو دەریاکەدا قووڵ ببنەوە بەرە بەرە ڕەنگە جیاوازەکەیانو تامـە تایبەتەکـەیان لـە دەست دەدەن.

بەڵام لە گەڵ پێشکەوتنی دۆزینەوە زانستییەکان، زاناکان توێژنەوەیان لە سەر چـەند نمونەیـەك لـە ئاوی ئەو شوێنەی کە ڕووبارو دەریای تێدا بە یەك دەگەن، ئینجا بە ئامێری ورد کاریان لە سەر پێوانی پلەکانی سوێریو شیرینی، هەروەها لە سـەر پێـوانی پلـەی گـەرمیو چـڕی کـرد، چـەند نموونەیـەکی زیندەوەرانیشیان کۆکردەوە، پاشان پۆلێنیان کـردن، شـوێنەکانی هـەبوو نیـشیان دیـاری کـردن، دوای توێژینەوەکە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئاوەکان بۆ سێ جۆران دابەش دەبن:

أ- ئاوی ڕووبارەکان زۆر سازگارو شیرینن.

ب- ئاوی دەریاکان زۆر تفتو سوێرن.

ج- ئاوەکانی ناوچەی ڕێژگـە: لـە ئـاوی سـوێرو شـیرین تێکـەڵاونو ڕووبـارو دەریـا لـە یـەکتر جیادەکاتەوە، هەر چەندیش لە دەریاکە نزیك بکەوێتەوە سوێریەکەی زیاتر دەبێت، هـەر چـەندیش لـە ڕووبارەکە نزیك بکەوێتەوە شیرینیەکەی زیاتر دەبێت.

ئەمەش ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە کاتێك وەسفی دوو دەریا(شیرینو سوێر)ی کـردووە ئەوانیش ڕووبارو دەریان، بە وەسفی ئەو تۆ وەسفی کردوون زاناکان پەییان پێ نەبرد بـوو، تـەنیا لـەو سەدانەی دوایی نەبێت.

هەرچی ئاوی تێ ڕژاویشە: تێکەڵەیەکە لە نێوان ئاوی ڕووباری شـیرینو سـازگارو ئـاوی دەریـای تفتو سوێر. وەکو فەرموویەتی: (**مرج البحرين**) واتە:(ڕووبارو دەریا).

# چەند زانستێکی گەردوونی

## گــــــەردوون



بزانە گەردوون، تەواوی بوونەوەر هەر لە بچووکترین تەنۆلکەوە بگرە هەتا دەگاتە ئاپۆرەی کەشکەشانە بێ ئەندازەکان دەگرێتەوە.. ئەوەش بزانە کورە شیرینەکەم هیچ کەس ئەندازەی مەزنی ئەو گەردوونە نازانێت..

بێگومان بڵاوترین بیردۆزە لە بارەی دروست بوونی گەردوون بریتییە لە بیردۆزەی تەقینەوە مەزنەکە، کە دەڵێ گەردوون لە ئەنجامی رووداني تەقینەوەیەکی یەکجار مەزن ـ کە بریتییە لە تەقینەوە مەزنەکە ـ پێش (١٠ـ٢٠) بلیۆن ساڵ دروست بووە.

لە سەرەتادا گەردوون لە سەر شێوەی گۆێکی ئاگرینی خاوەن چڕیو گەرمییەکی لە ئەندازە بەدەر بووە، لە گازێك پێکهاتبوو کە لە دوای تێپەرینی نزیکەی ملیۆن ساڵێك دەستی بە کشانو سارد بوونەوە کرد، گازەکە بەگوێرەی رای پەسندکراو بەپێی بارستە گەلێکی خۆ جێیی دەستی بە خەست بوونەوە کرد کە ئەویش دەرکەوتنی کەشکەشانەکان (المجرات) بوو..

لە دوای تێپەر بوونی چەندین ملیۆن ساڵ، تاکو ئێستاش گەردوون لە باری کشان دایە، ئەمە سەرەڕای هەبوونی زۆر شوێنی ئەوتۆ کە تەنی توند بەیەکەوە بەستراو بەهۆی قورسایی کێشکردنەوە دەگرنە خۆیانەوە، وەکو نموونەی ئاپۆرەی ژمارەیەك لە کەشکەشانەکان. هەروەها زانایانی گەردووناسی نازانن کە ئایا گەردوون(داخراوە)واتە لە کۆتایی لە کشان دەوەستێتو دەست بە وێك هاتنەوە دەکات.. یا (کراوەیە) واتە بۆ هەتا هەتایە لە کشانیدا بەردەوام دەبێت.. خودا خۆی زاناترە.

# كەشكەشانەكان {المجرات}



(كەشكەشــان) بارســتەیەكی فــرە مەزنی ئەستێرەو سەدیمەكانە... لە گەڵ مــاددە پــەخش بووەكــانی نێــوان ئەســتێرەكان..كەشكاشــان ســێ جــۆری هەن كە بەگوێرەی شێوەیان پۆلێن كراون:

* كەشكەشانە هێلكەییەكان.
* كەشكەشانە لوول پێچەكان كــە چەند باسـكێكیان هەیــە بــەرەو دەرەوە پــێچ دەخۆنــەوە كــە لــە هەڵاوســانی ناوەندیەوە دەردەچن.
* كەشكەشــانە نارێكــەكان كــە شــێوەیەكی دیــاركراوو روونیــان نییــە.

بەڵام هەندێ جار شێوەی كەشكەشان لە ئەنجامی بەیەكتركەوتنی بە كەشكەشانێكی دیكەدا دەشــێویٚو تێك دەچێت.

بەڵام هەرچی كوازەردكانــە(هاوشــێوەی ئەســتێرەكان) تــەنی ریــز كــراون، رووناكیــان زۆربــەهێزە، باوەڕوایە كە ئەوانە ناوكی كەشكەشانی بن، بەڵام ئەوانــە ئەونــدە دوورن بــە شــێوەیەك كــە ئەســتەمە بتواندرێت بەتەواوی چۆنیەتیان دیــاری بكرێت،ئەمــەش لــە بــەر ئــەوەی دەكەونــە دەردوەی كەمــەرەی گەردوونی ناسراو.

دوورترین كوازەرە ناسراوەكانیش لە دووری (١٥)بلیۆن ساڵی رووناكیدا بــەدی دەكــرێن، هــەروەها باوەڕیش وایە ئەوتیشكانەی كە لــە كەشكەشــانە چاڵاكەكانو كوازەرەكانــەوە دەردەچــن دەبنــە هــۆی دروست بوونی كونە ڕەشەكان (**الثقوب السوداء**).

## ڕێگای کاکێشان ( درب التبانة )



((ڕێگای کاکێشان)) ئەو ناوەیە کە دەبرێتە سەر ئەو شریتە ڕووناکییە کاڵەی کە لە شەو بە ئاسماندا لە لایەك بۆ لایەکی دیکەوە ڕادەکشێ و هەروەها ئەو ڕووناکییە لە ئەستێرەو سەدیمەکانی کەشکەشانی خۆمان دەردەچێت، کە بەناوی کەشکەشانی ڕێگای کاکێشان دەناسرێت. کەشکەشانی ڕێگای کاکێشان شێوەیەکی پێچاو پێچی هەیە، کە لە هەڵاوسانێکی ناوەندی چڕ پێکدێت، بە چوار باسك دەوردراوە کە بەرەو دەرەوە لولیان خواردووەو خەرمانەیەکی کەم چڕیش بە دەوریدا خول دەخواتەوە.. کورەشیرینەکەم ئێمە ناتوانین شێوەی پێچاوپێچەکە ببینین، چونکە سیستەمی خۆری دەکەوێتە یەکێك لەو باسکە پێچاوپێچانە کە ئەویش (باسکی جەبار)ە(یاخود هەندێك جاران باسکی خۆجێتی پێ دەڵێن) هەوری تەماوی ناوەڕاستی کەشکەشانەکە بەتەواوی دادەپۆشێت، بەشێوەیەك چاو دەتوانێت تەنیا دیمەنێکی سنووردرای کەشکەشانەکە ببینێت.

*کەشکەشانە پانتایی یەکجار فراوانەکە، دەوری کەشکەشانەکە لە بۆشایی ئاسماندا دەدات ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەستێرەکانی ناوەوەی بەخێرایەکی سەرووی خێرایی ئەستێرەکانی دەرەوە دەردەچن.

بەڵام خۆر کە لە سەر سێیەکی دووری ناوەندکەیەتی بەرەو دەرەوە، نزیکەی هەر (٢٢٠) ملیۆن ساڵێك خولێك بە دەوری کەشکەشانەکە تەواو دەکات.

## سەدیمەکان و ئاپۆرەی ئەستێرەیی

((سەدیم)) پەڵە هەورێکی تەمومژو گازاویە دەکەوێتە ناوەوەی کەشکەشانێك، سەدیمەکان ئەوکاتە دەبینرێن کە ئەو گازەی لێی پێکهاتووە دەست بە هەڵچوون بکات...یان ئەگەر هەورەکەی ڕووناکی ئەستێرەکانی شکاندەوە یاخود بووە بەربەست لە بەرامبەر ڕووناکی هاتوو لەلایەن ئەو تەنانەی



كــە دوورتـــرن، ئەوكاتـــە ســـەدیمە هەڵچووەكان دەدرەوشێنەوە چـونكە گازەكەی رووناكی یـەك دەردەكـات كاتێـــك تووشـــی چـــەند تیـــشكێك دەبێتـــەوە كـــە لەلایـــەن ئەســـتێرە گەلێكی گەرم و گوڕو تازەوە دێن.

هەرچـــی ســـەدیمە تیـــشك دەرەوەكانە ئـەوانیش دەدرەوشێنەوە چونكە تـەپ و تۆزەكانیـان رووناكی هاتوو لـە ئەستێرەكان دەشكێننەوە كە دەكەونە ناویەوە، یا دەكەونە دەوروبەری، یا هەر لایەكی دیكەیەوە...

سەدیمە تاریكەكانیش لەسەر شێوەی وێنەیەكی تاریك دەبینـرێن چـونكە رووناكی یەكـە رێگـای لێ دەگیرێت كە لە لایەن سەدیم درەوشاوە یان ئەستێرەی كە دەكەونە دواوەیان هاتووە.

هەندێك لـە تـەرزە سـەدیم هاورێیـەتی ئەسـتێرە مردووەكـان دەكـەن، سـەدیمە هەسـارەییەكان و پاشماوەكانی ئەستێرە تەقیوەكان هەردووكیان لە پاشماوەكانی بەرگ گازاوی كشاو كۆ دەبنەوە،

سەدیمە هەسارەییەكان: چـەند بـەرگی گازینـە لـە نـاواخنی ئەستێرەیەكی مـردوودوە بـۆ دوور راماڵداراون..

بەڵام هەرچی پاشكەوتووی گرداری گەوردیە: بریتییە لە بەرگە گازێك كە لە ناواخنی ئەستێرەیەك بەخێرایەكی زۆر لە دوای تەقینە مەزنەكەوە بۆ دوور دەرچووە، كـە بریتییـە لـە تەقینـەوەی گـرداری مەزن..

زۆربەی جاران ئەستێرەكان لە نێو چەند كۆمەڵەیەكدا گرد دەبنەوە، كـە بـە ئـاپۆرەی ئەسـتێرەیی دەناسرێن، دەكـرێ جیـاوازی لـە نێـوان ئـاپۆرەی ئەسـتێرە پـەرش و بڵاوبووەكـان بكـەین، كـە چـەند كۆمەڵەیەكی بڵاو پێكدەهێنن، كە چەند هەزار ئەستێرەیەكی تازە درووسـت بـوو یـان تێدایـە كـە لـە هەمان هەور درووست بووینە، پاشان لـە یـەكتر دووركەوتوونەتـەوە، لەگـەڵ ئـاپۆرە ئەسـتێرەی چـڕی بەیەكەوە نووساو، كە لە سـەر شـێوەی چـەند كۆمەڵەیـەكی نیمـچە گـۆیین كـە سـەدان هـەزار كۆنـە ئەستێرەیان تێدایە.

## ئەستێرە



* ((ئەستێرە)) چەند تەنێكی گازی گەرمو پرشنگدارن كە لە ناوەوەی تەمە ئەستێرەكان دروست بووینە.

* ئەستێرە جیاوازیەكی زۆر گەورە لە رووی قەبارەو بارستایی و پلەی گەرمییەوە لە نێوانیاندا هەیە.

تینی پلەی گەرمی ئەستێرە، رەنگی ئەستێرەكە دیاری دەكات.

* جا ئەو ئەستێرانەی كە پلەی گەرمیان بەرزترە رەنگی شین دەنوێننو ئەوانەی كە پلەی گەرمیان نزمترە رەنگیان سوور دەبێت.

* خۆریش بە پلەی گەرمی رووكارەكەیەوە كە پێنج هەزارو پێنج سەد پلەیە، دەكەوێتە نێوان ئەم دوو پلەیەی سەرەوە كە بەرەنگی زەردەوە دەبینرێت.

* وزەی دەرچوو لە ئەستێرەیەكی درەوشاوە كە بەهۆی تێكەڵاو بوونی ناوكییەوە دروست دەبێ ناواخنی ئەستێرەكەوە.

* گرنگترین كۆمەڵەیان خۆی لە ئەستێرە لەدواییەكی سەرەكی(ئەوەی كە هیدرۆجین تێكەڵاودەكەن بۆ ئەوەی گازی هیلیۆم دروست بێت) هەروەها ئەستێرە زەبەلاحەكانو سەرووی زەبەلاحەكانو قەزەمە سپیەكان دەنوێنێ.

## ئەستێرە نیوترۆنیەكانو كونە رەشەكان

* ئەستێرە نیوترۆنیەكانو كونەرەشەكان لە پاشماوەی كرۆكە ئەستێرەكانی دوای تەقینەوەیەك پێك دێن لە سەر شێوەی مۆڵگە مەزن.

* ئەگەر پاشماوەی بارستە كرۆكە كە بكەوێتە نێوان بارستەیەكو نیو، نزیكەی سێ بارستەگەلێكی



خـــۆری...ئـــەوا دەچـــێتەوە یـــەك و دەبێتەئەســـتێرەیەکی نیـوترۆرنی، بـەلاَم ئەگەر بارستەکەی لە سێ بارستە خۆریی زۆر گەورە تـر بـوو ئـەوا دەچـێتەوەیەك دەبێتە کونێکی ڕەش.. تـیرەی ئەسـتێرە نیوترۆنیـەکان دەگاتـە تـەنیا نزیکـەی (١٠)کم.

نزیکـەی سـەرتاپای ئـەو ئەسـتێرەیە لـە تەنۆلەکەی لە ناوك بچووکتر پێك دێت، پێی دەڵێن نیوترۆنەکان.

* ئەو ئەسـتێرانە بـریتین لـە چـڕیەك کـە کێشی کەوچکێکی چای پڕلەماددەکەیان، نزیکەی بلیۆنێك تەن دەبێت!.

* چاودێری کردنی ئەستێرە نیوترۆنیەکان لە سەر شێوەی سەرچاوەی رادیـۆیی بـزواوەوە دەبێ‌کـە نـاو دەبرێت بە(بەلسارەکان) بۆیەش وای پێدەڵێن چونکە دوو گورزە نێردراو بەخێرایەکی ڕەها بـە دەوری تەوەرەکەیدا دەسوڕێنەوە لە ئاسماندا پاڵ بە یەکتروە دەنێن، ئاشکرا کردنیـشیان لـە شـێوەی چـەند بزووتنەوەیەکی کورت دەبێت.

* کونە ڕەشەکان بەهێزی کێشکردنیان لە یەکتر جیا دەکرێنـەوە، کـە دەگەنـە ڕادەیـەکی ئـاوا هـەتا تیشکە رووناکیەکان لە دەستیان دەرباز نابن، هەر لەبەر ئەوەش کونە ڕەشەکان وەکو تەنی نـەبینراو دەمێننەوە لە گەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت بدۆزرێنەوە ئەگەر هاتوو ئەستێرەیەکی هاوڕێیان لێیان نزیك بێت، چونکە کونە ڕەشەکان بە تونـدی گـاز لـە ئەسـتێرەیەکی دیکـە بـۆ خۆیـان کـێش دەکـەن‌و پەپکەیەك دروســت دەکـەن بەخێراییـەکی گـەلێ زۆر، بـە دەوری کونـە ڕەشـەکەدا دەسـوڕێتەوەو بەهۆیەوە پلە ی گەرمیی بەرز دەبێتەوەو تیشکە وزەیەك دەردەکات.

* ماددە گازیەکە بەرەو ناوەوە دەسوڕێتەوەو سنووری کونە ڕەشەکە دەبڕێت‌و بەمەش بۆ هەتا هەتایی لە گەردوونی بینراو بزردەبێت.

## كەلووەكان

پێكهاتەی ئەستێرەیی جوانو قەشەنگن، كە هەموو ڕۆژێ لە شوێنو بارە جیاجیاكانی ئاسماندا دەیانبینین، پێویست نییە هیچ پەیوەندییەكی فیزیایی بیان بەستێتەوە، واتە زۆربەی ئەو ئەستێرانە بە شێوەیەكیناسایی لەیەكتر نزیك نین، بەڵكوناكەونە یەك كۆمەڵە ئەستێرەش، جاوادەبێ هەندێك ئەستێرەی یەك تاوەر بەشێوەیەكی ڕێژەیی لەزەوی نزیك دەبنەوە، بەڵام هەندێكی دیكەیان بەشێوەیەكی ڕێژەیی لێی دوور دەكەونەوە.

هەموو ئەو شتانەی كەلەبارەی ئەستێرەكانی یەك كەلوو دەزانین ئەوەیە كە لەگەڵ زەوی لەهەمان ئاراستەدا بەدیاردەكەون.

## هێرشی نەیزەكەكان( الشهب )




((نەیزەكەكان)): (خاڵێكی تیشكدارن، لە ئاسماندا دەبریسكێنەوەو بە خێرایی دەڕۆن، لە دوای خۆشیاندا كلكێكی درەوشاوە جێ دێڵن پاشان زۆر نامیننەوە هەر زوو دەكوژێنەوە)

لە (لسان العرب)دا هاتووە: (الشهب) تاكەكەی (الشهاب)ە، ئەوەیە كە لە شەودا بۆ زەوی دێت، كە لە بنەڕەتدا بڵێسەیەكە لە ئاگر.

ئەو نێزەكانە قورئانی پیرۆز بە ڕاشكاویو بەهەمان ناوی زانستی ئاماژەی پێداوە كە زانستی نوێ بەكاری هێناوەو ناوی ناوە (الشهب) واتە (نەیزەكەكان).

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ{٦} وَحِفْظاً مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ{٧} لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ{٨} دُحُوراً وَلَهُمْ عَذَابٌ

واصِبٌ{٩} إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ{١٠}﴾الصافات: ٦-١٠ .

**واتە:(بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان رازاندۆتەوە بە جوانیو رۆشنی ئەستێرەو هەسارەكان* ئاسمانمان پاراستوە لە پیلانو شەڕی هەموو شەیتانێكی سەركەش* شەیتانەكان ناتوانن هەواڵی ئەو نەخشەو بەرنامانەی كە بەفریشتە پایە بڵندەكان دەسپێردرێت بیزانن و ببیستن، چونكە لە هەموو لایەكەوە پارچە ئەستێرەیان بۆ دەهاوێژرێت* بۆ ئەوی تێكبشكێندرێنو ڕاو بنرێن، سزای سەختو بەردەوام لە قیامەتدا بۆیان ئامادەیە* مەگەر ئەوەیان كە هەواڵێك بفرێنێتو بیەوێت بۆی دەربچێت، ئەوە ئەستێرەیەكی ڕووناك شوێنی دەكەوێتو لە ناوی دەبات).**

ناردنی نێزەكەكان وەكو قورئان دركاندویەتی- بۆ سەر شەیتانەكانە بۆ ئەوی ببێتە بەربەستێك لە گوێگرتنیان لە هەواڵی ئاسمانو قەدەغەیان بكات لە وەی سنووری دیاریكراو بەرەو ئاسمان ببەزێنن. وەكو دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَاباً رَّصَداً﴾ **الجن: ٩.**

**واتە: ئێمە جاران لە هەندێك شوێنی ئاسماندا خۆمان حەشاردەدا بۆ گوێگرتنو دەنگو باس بیستن، بەڵام ئێستا ئەوی بیەوێت گوێ بگرێت یەكسەر نەیزەكێكی بۆ ئامادەیەو بۆی دەهاوێژرێتو لەناوی دەبات).**

## دوو ڕۆژهەڵاتو دوو ڕۆژئاوا

كاتێك ئێمە گوێ بیستی ئەو ئایەتە دەبین كە دەفەرموویت: ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ﴾ **الصافات: ٥.**

**واتە:(پەروەردگاری ئاسمانەكانو زەویو نێوانیانە، پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەكانیشە).**

وا گومان دەبەین كە ئەوە باس لە زەویو سوڕانەوەكانی دەكات، بەڵام ئەو ئایەتە تەنیا باسی زەوی نەكردووە، بەڵكو باسی ئاسمانیشی كردووە..بەم زووانە هەسارەیەكیان دۆزیەوە كە بەدەوری دوو خۆری (الفا سەنجرا (أ))و(الفا سەنجرا(ب))دا دەسورێتەوەو هەموو ڕۆژێكیشی دوو ڕۆژهەڵاتنو دوو ڕۆژئاوا بوونی هەیە.

# ژیان لەسەر هەسارەكان



خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَالْمَلآئِكَةُ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ﴾النحل: ٤٩.

**واتە: (هەرچی لە ئاسمانەكانو هەرچی لەزەویدا هەیە، سوژدە دەبەن بۆ خوای بەدیهێنەریان، هەروەها هەموو زیندەوەران، فریشتەكانیش بەتایبەت سوژدە دەبەن بۆ خواو خۆ بەگەورە نازانن لە هیچ فەرمانێكی خوا لانادەن).**

پێویستە هەرگیز گومانمان بۆ ئەوە نەچێ كە فریشتەكان دەچنە نێو مانای وشەی (دابە)وە، چونكە ئەوان نە لەسەر زەوی دەخشێنو نە لە سەر پێیەكانیش دەڕۆن.. مانای وشەی (دابە) تەنیا ئەو زیندەوەرانە دەگرێتەوە كە ئاو توخمی سەرەكی پێكهاتنیانە، جا هەر (دابە)یەك بێ، وەكو خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾النور:٤٥.

**واتە: (هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێكی لە ئاوێكی تایبەتی دروست كردووە، جا هەیانە لەسەر سكی دەڕوات، هەیشە لە سەر دوو قاچ دەڕوات، هەیشە لە سەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بیەوێت دورستی دەكات، بە ڕاستی خوا دەستەڵاتی بە سەر هەموو شتێكدا هەیە).**

كوڕە شیرینەكەم ئەمە ئەوەیە، قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە..

ئەدی دەبێ زانست لە بارەی ئەمەوە چی گوتبێت؟

* بێگومان هەندێ لە فەلەكناسان دەڵێن: ((سەیر نییە هەندێك ئەستێرەی ئاسمانی لە ئاسماندا گیانلەبەری تێدانیشتەجێ بن، بەڵكو ئەمە سەیرە كە نەبن)).

هەروەها دەزگای (ناسا) بۆ توێژینەوەكانی بۆ شایی ئاسمان لە (كالیفۆرنیا)لە ساڵی(١٩٧٠ز) ڕایگەیاند كە : (ئەو نەیزەكەی كە لە ساڵی رابوردوو لە ئوستالیادا كەوت، ترشی ئەمینی تێدایە.. ئەوەش بە بەردی بناغەی دروست كردنی زیندە ئەندام دادەنرێت.. بەمەش مەزەندە دەكرێت كە ژیان لە دەرەوەی ئەو گۆی زەویەدا هەبێت).

لە ساڵی(١٩٧٤) یەكەم نامە بۆ ژیارە گەردوونیەكان نێردرا، كە پەخش كردنەكەی سێ خولەكی خایاند. ئەو نامەیە ئاوا دیزاین كرابوو كە گەلێ زانیاری بنەڕەتی لە بارەی شارستانیەتی زەوی‌و دانیشتوانەكەی پێشكەش بكات ..

ئەنجام دانی ئەم كارە رووبەرووی ڕەخنەگەلێكی جیهانی بوویەوە، چونكە ئەو كارە پەیوەندی بە تەواوی مرۆڤەكان هەیە، نەك تەنیا ئەو گرووپەی كە نامەكەیان ناردووە..

## مانگ‌و خۆر

كوڕی شیرینم زاناكان دەڵێن: مانگ بەخێرایی(١٨)كیلۆمەتر لە چركەیەكدا دەڕوات.

زەویش (١٥) كیلۆمەتر لە چركەیەكدا.

هەروەها خۆریش (١٢)كیلۆمەتر لە چركەیەكدا.

خۆر دەبزوێ‌و زەویش دەبزوێ‌و هەیڤیش دەبزوێ.. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ{٣٨} وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ



الْقَدِيمِ{٣٩} لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ{٤٠} ﴾یس:٣٨-٤٠.

واتە: (خۆریش لە گەردش‌و سورانەوەی خۆیدا بەردەوامەو بەرەو سرەوت دەچێت، یاخود بە دەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە. بێگومان ئەوی توانای زاتێکی بالادەست‌و زانا دەردەخات* هەروەها کات‌و شوێنی هەڵاتنی مانگیشمان دیاری کردووە، هەتا سەر ئەنجام لە ڕواڵەتدا وەك چیلکەیەکی وشکی باریك دەنوێنێت نەخۆر بۆی هەیە، مانگ بگات، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت، بەڵکو هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەن‌و بەئاسانی دەسوڕێنەوە).

عەلی دەڕواو عومەریش بە قۆناغ دەڕوا.. عەلی بە عومەر ناگات، ئەی کوڕی شیرینم دەبێ مانای ئەوە چی بێ؟

ماناکەی ئەوەیە عەلی دەڕوات‌و عومەریش دەڕوات، بەڵام عەلی ناگات بە عومەر کە ئەویش دەڕوات..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾یس:٣٨. پاشان فەرموویەتی:﴿ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ﴾الرحمن:٤٠. دەبێ مانگ لەپیش خۆر بێ یان نا؟..

مانگ لە پێش خۆرەو دڕوات‌و پێی ناگات‌و دڕوات‌و پێی ناگات، ئەمەش لە بەر ئەوەی خێرایی مانگ (١٨) کیلۆمەترەو زەوی (١٥)کیلۆمەترەو خۆریش (١٢)کیلۆمەترە، جا خۆر هەرچەندی بڕوات بەمانگ ناگات، بەڵام دەبێ چ وا لە مانگ بکات پارێزگاری لە شوێنەکانی هەڵهاتنی بکات؟ هەروەها دەکرا کە برۆیشتباو شوێنی خۆی جێ هێشتبا؟

کوڕە شیرینەکەم ئەوان بینیان کە مانگ بە خوارو خێچی دەڕوات، دەخولێتەوەو بەهێڵێکی ڕاستدا ناڕوات.. هەتا پارێزگاری لە شوێن‌و خۆلگەی خۆی بکات!.

تەنیا سەرنج بدەنە ئەو بزووتنەوەیە: مانگ، خۆر، زەوی، ئەستێرەکان دەڕۆن.. ئەگەر ئەندازەی خێرایی خۆر گۆڕا.. بۆ ڕۆژی دووەم کە دێ دەڵێن: کوانێ خۆر؟

بێگومان بیست قۆناغ لێمان بە دوا کەوتووە!

یەکێ لە دوایساڵێك دێ‌و دەڵێ: کوانێ خۆر؟ بێگومان بزر بووە..!

جا کوڕە بچکۆلانەکەم کێ ئەو هەموو هەسارە دەخولێنێتەوەو دەیان بزوێنێ؟

﴿وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾يس:٤٠.

**واتە: (هەریەکەیان لە خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلە دەکەنو بە ئاسانی دەسوڕێنەوە).**

هەر یەکەیان لە خولگەی خۆیان دەسوڕێنەوەو پارێزگاری لە خولگەو خێرایی‌و شوێنی خۆیان دەکەن، جادەبێ ئەمە کاری کێبێ؟

﴿ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾يس:٣٨.

**واتە: ئەمە خودای بە دەسەڵاتو زانا نەخشەی بۆ داناوە).**

ئایا ئەمە نەخشەیە یان نا؟ ئایا نەخشە دارشتن بەرێکەوت دەبێ؟..

نەخێر، بێگومان نەخشە دارشتن بە ویستی کەسێك دەبێ کە دەیەوێ.. ئەو نەخشە دارشتنە لە خودایەکی بەهێزو تواناداڕەوەیەو هەموو شتێکی لە شوێنی خۆی داناوەو لە شوێنی خۆشیدا بەگەڕی خستووە.

﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾المؤمنون:١٤.

# جوڵانەوەی خۆرو سوڕانەوی




ئایا خۆر لە شوێنی خۆیدا جێگیرە؟ وەڵامەکەی: نەخێر، چاودێری کردنی بۆشایی ئاسمان ئەوەی سەلماندووە، خۆر لە بۆشایی ئاسماندا مەلە دەکاتو دەڕواتو شوێنی خۆی لە نێوان ئەستێرەکانو خۆرەکان دەگوازێتەوە.. خێرایەکەشی بە (٣٠کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا) مەزەندە کراوە، بەرەویەکێ لە ئەستێرەکان هاوڕێ لەگەڵ ئەستێرەگەرۆکەکانی دەڕوات کە بە ناوی (بەچۆکداکەوتوو)ناسراوە.. بەمەش سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر پێچاو پێچی دەبێت نەك هێلکەیی.

هەروەها خۆر لە جولانەوەی ساڵانەیدا بەناو کەلووەکاندا دەڕوات، کە ناوچە گەلێکن بەهەردوو لای خۆردا درێژ بوونەتەوە. فەلەك ناسەکان دابەشیان کردۆتە سەر دوازدە بەش، هەر بەشێکیان بە کەلووێك ناو دەبرێ‌و خۆریش هەموو مانگێك بەناو تاوەرێکدا تێپەر دەبێت..

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾یس:٣٨.

**واتە: (خۆریش لە گەردش‌و سوڕانەوەی خۆیدا بەردەوامەو بەرەو سەرەوت دەچێت، یاخود بە دەوری چەقی خۆیدا دەسوڕێتەوە، بێگومان ئەوە توانای زاتێکی بالادەست‌و زانا دەردەخات).**



**ئەمە چەندین کێڵگە لەو ئەستێرانەی کەوتوونەتە ناو ڕێگای کاکێشان، کە چاودێریی دەریایی لە فلاگستافی باریزۆنیا گرتوویەتی، هەروەها ڕێڕەوی بالۆنی دەستکردی نیکۆ(١) بەدیاردەکەوێت کە بواری تەماشاکردن لە میانەی وێنە گرتندا دەبڕێت.**

**أ-ئەمە کەشکەشانێکە لە ئەسپی گەورەدا، لە کەشکەشانی لە مەڕ خۆمان دەچێت کە (١٠٠٠٠٠)هەزارملیۆن ئەستێرەی تێدایە.**

**ب- ناوێنەیەکی زنجیردارە، لە دوای کەشکەشانەکەی ئێمە دایە، (٢،٢)ملیۆن ساڵی ڕووناکی لە ئێمەوە دوورە.**

**ج- سەدیی سەری ئەسپ، کە لە زیتەی جەوزاوە نزیکە.**

**ئەستێرەیەکی مەزنە پەرەی سەندووە، بارستاییەکەی سێ هەندی بارستەی خۆر دەبێت،ئەستێرەکە لەماددەیەکی پەخشکراو لەنێوان ئەستێرەکانی (أ)دا گرژدەبێتەوە، پاشان خۆی دەگەێنێتە زنجیرەی سەرەکی (ب) لەدوای ماوەیەکی زۆر کورتتر لە ماوەی ئەستێرەیەکی لە جۆری خۆر. دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەی زەبەلاحەکانی(ت)، یەکەم جار گازی هیلیۆم دەسووتێنێ، پاشان ئەو توخمانەی لە خۆیشدا**

قورسترین ، لە كۆتایشدا وەكو نوێ بوونەوەكی هەرە مەزن تووشی تەقینەوە دەبێت (ث) بەشێكی گەورە لە ماددەكەی لە دەست دەداتو پاریزگاری لە ئەستێرەیەكی نیوترۆنی، یاخود بەلسار دەكات.

أ= سەدیمێكی ئەمریكای باكوور، دەكەوێتە نێو كەلووی مریشك، ئەوناوەی بە شێوەیەكی نافەرمیی وەرگرتووە، (١٠٠٠)ساڵی رووناكی لە زەویەوە دوورە، ئەو وێنەیە فۆتۆگرافیە بە یارمەتی روانگەی (شمیت)لە(بالۆمار)گیراوە

ب= ئەمە سەدیمی سەرەتانە، وردوخاشی تازە بووەوەی هەرە گەورەیە، لە ساڵی (١٠٥٤) تێبینی كرا كە بەلسار دەگرێتە خۆیو(٦٠٠٠)ساڵی رووناكی لە ئێمەوە دوورە.

أ= ئەمە سەدیمی سەرەتانە، وردوخاشی تازە بووەوەی هەرە گەورەیە، لە ساڵی (١٠٥٤) تێبینی كرا كە بەلسار دەگرێتە خۆیو(٦٠٠٠)ساڵی رووناكی لە ئێمەوە دوورە، لەبارەیەوە دەڵێن وێستگەی بەرهەم هێنانی وزەیە لە كەلووی سەرەتان

ب= ئەمە سەدیمێكی تاریكە، رووناكی ئەستێرەكانی دوای خۆی دادەپۆشێتو چاكترین نموونەش لەسەر ئەمە(كیسی خەڵووز)ە

أ= لێرەدا سەدیمێكی گوڵ رەنگی دەبینرێت كە روانگەی شمیت لە چاودێرگای بالومار وێنەی گرتووە، هەروەها ئەو سەدیە دەكەوێتە ناو هەسارەی یەك شاخەوە.

ب= ئەمە سەدیمێكی سێ لاییە بە ئاشكرای دیارە لەوێنەیەكی كە چاودێرگەی بالومار گرتوویەتی.

لەلای راستەوە كەشكەشانێكی پێچاوپێچی خاو دەبینرێت، ناوكەكانی بەروونی دیارن، بەڵام بەگوێرەی باسكە پێچاو پێچەكانەوە گەورە نییە، لە لای چەپیشەوە كەشكەشانی (دەوامە) دەبینرێ، كە (٣٧)ملیۆن ساڵی رووناكی لێمانەوە دوورە، بەرەو رووی ئێمە هەڵكەوتووە، هەر بۆیە بەروونی بە دیار دەكەوێت.

أ= ئەمە وێنەی خۆرە: ئاگرو بڵێسەی خۆر(٤٠٠٠٠)كیلۆمەتر یا(٢٥٠٠٠)میل لە بۆ شایی ئاسماندادرێژ دەبێتەوە.

ب= ئەمە كلكداری هیوماسۆنە لە كلكدارە یەكەمەكانە وێنەی رەنگاورەنگی لە چاودیرگەی بالومار بۆ گیراوە، ئەو ئەستێرانەی كە دەوری كلكدارەكەیان داوە، لە سەر شێوەی هێڵ هێڵ دەبینرێن، هۆیەكەشی بۆ سورانەوەی زدوی دەگەرێتەوە.

# خۆر ئەستێرەیەكی ئاگرینە



بێگومان قورئانی پیرۆزكاتێك باسی خۆر دەكات، هەمیشە وەكو چرایەكی پرشنگدار (سراج منیر)وەسفی دەكات، كەواتە چراو پرشنگداری دووسفەتی هەمیشەیی خۆرن..

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُّنِيراً﴾الفرقان: ٦١.

**واتە: (زۆرگەورەو مەزنە ئەو زاتەی لە ئاسماندا چەندەها خۆلگەی گەورەی بە دیهێناوە، هەروەها چرایەكی پرشنگدار، كە خۆرەو مانگێكی روناكیشی بۆ زەوی دابین كردووە).**

كورە شیرینەكەم سەرنج بدە كاتێك كە قورئان باسی مانگ دەكات هەمیشە بە (روونـاك)وەسفی دەكات.. كەواتە رووناكی سیفەتێكی هەمیشەیی مانگە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی تاكو مانای وردی وشەكانی (سِرَاج و مضئ)و(مُنِير)مان بۆ روون بیتەوەو بۆ ئەوەی لە سەر دیاردە جیاوازەكانی نێوانیان بوەستین، دەبینین هیچ شتێك پێی ناگوترێت(سراج)یاخود(مضئ) تەنیا ئەگەر رووناكییەكی بێ گەرمی بدات.. هەروەكوو چۆن تۆ بە شتێك نالێی(سِرَاج یاخود مضئ)تەنیا ئەگەر لە نەژادی خۆی تیشك پەخش بكات... هەروەها پێشی نالێی(مُنِير) تەنیا ئەگەر رووناكی لە ئەستێرەیەكی دیكە وەربگرێت..

بەپشت بەستن بەو روونكردنەوە زمانەوانییەوە، ئەو ئایەتە ڕایدەگەیەنێت خۆر ئەستێرەیەكی گڕ گرتووی ئاگرینەو..مانگیش تەنێكی ساردوسڕو هیچ پلەیەكی گەرمی تێدانییە، بەلكو رووناكی خۆی لە خۆرەوە وەردەگرێت.. ئەمەش ئەوەیە كە زانستی نوێ دانی پێداناوە!

## فرە خۆری

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾فصلت:٣٧.

**واتە: (لە نیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەوو ڕۆژو خۆرو مانگە، هەرگیز نەکەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵکو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستی کردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو ئەزانن‌و هەر ئەو دەپەرستن).**

بێگومان پیتی (نون) وشەیەی ئایەتی خودای گەورە(**خَلَقَهُنَّ**) کە بۆ کۆ بەکاردێت، ئاماژەیەکی تێدایە بە هەبوونی فرە خۆری‌و فرە مانگی.. ئەمەش زانست سەلماندوویەتی.

لە بۆشایی ئاسماندا چەند کۆمەڵە خۆرێك لە گەڵ هەسارەکانیاندا کە وەکو خۆرەکەی لەمەڕ ئێمەو گەورەتریشن دەڕۆن بەرێوەو هەر هەسارەیەکیش مانگێکی دووکەوتە یاخود زیاتری هەیە.. پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەو ئەستێرانەی بە وردەکاری‌و ڕێك‌و پێکییەوە دەبات بە ڕێوە.

فەلەکناسان ئاشکرایان کردووە ژمارەی خۆرەکان لە دووسەد ملیۆن خۆر زیاترە، ئەمەش ئەوەندە یە تا ئێستا دۆزراوەتەوە، ئەی کوری شیرینم چی لە بارەی ئەوە دەڵێی کە هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

## مانگ پێشتر بڵێسە داربووە پاشان کوژاوەتەوە



زانست بەو دواییە ئاشکرای کردووە ئەو مانگە لە کۆندا بڵێسەدار بووەو پاشان ڕووناکی یەکەی نەماوەو کوژاوەتەوە، ئەم نهێنییەش نەزاندراوە مەگەر لەم نزیکانە نەبێ، لە دوای ئەوەی کە ئامێرەکان بۆ توێژەرەکان فەراهەم بوون..

ئەمە لەم ئایەتەی خوای گەورەدا هاتووەکە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ

النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً﴾الاسراء:١٢.

واتە: (ئێمە دیاردەی شەوو ڕۆژمان كردووە بە دوو بەڵگەو نیشانە، ئینجا ئێمە تاریكیمان بە سەر دیاردەی شەودا هێناوەو ڕۆژیشمان بە ئاشكراو دیارو بینراو سازاندووە، تا لە نازو نیعمەتی پەروەردگارتان بەهرەوەربن، تا ژمارەی ساڵەكان بزانن‌و حساب راگرن، ئێمە هەموو شتێكی پێویستی ئێوەمان بە فراوانی‌و بەربڵاوی روون كردۆتەوە).

جابەڵگەو نیشانەی شەو مانگە، بەڵگەو نیشانەی ڕۆژیش خۆرە، (فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ)واتە: كپمان كردووەو ڕووناكیمان نەهێشت، نەهێشتن‌و كپ كردنەوەش تەنیا لە دوای ڕووناكی دەبێت، جالێرەدا زانیمان كەوا مانگ لە پێشدا بڵێسەدار بووەو پاشان ڕووناكییەكەی كپ بۆتەوەو نەماوە!.

ئەو دۆزینەوە زانستیە لە سەرزمانی زانای ئەم ئوممەتە(عبدالله ی كوری عەبباس)دا هاتووە(خوا لێی رازی بێت) كە دەفەرموێت: (كان القمر يضئ كما تضئ الشمس، والقمر اية الليل والشمس اية النهار (فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ) السواد الذي في القمر) واتە: (لە پێشدا مانگ پرشنگدار بوو وەكو چۆن خۆر پرشنگدارە، مانگیش بەڵگەو نیشانەی شەوە، خۆریش بەڵگەو نیشانەی ڕۆژە.

شێخ (الزندانی)دەڵێ: كۆمپانیایەكی ئەمەریكی فیلمێكی سینەمایی لە بارەی هەوڵ‌و كۆششەكانی ئەمەریكیەكان بۆ غەزو كردنی مانگ ئامادە كرد، ناونیشانی ئەو فیلمەش ((هەنگاوێكی مەزن بۆ ئاشكرا كردنی جیۆلۆجیای مانگ)) بوو، لە سەرەتای فیلمەكەوە تاكۆتایی ئەوە پیشان دەدات، كەوا چۆن زانا ئەمەریكیەكان توانیویانە ئەوە بدۆزنەوە كە مانگ پێشتر بڵێسەدار بووە، لە پێشدا بارستەیەكی بڵێسەدار بووە، پاشان سارد بۆتەوە، چۆنیش ئەمەیان دۆزیوەتەوە؟ بەوە بووە كە چەند ئامێرێكیان ناردە سەر ڕووی مانگ بۆ پێوانە كردنی شەپۆلەكان‌و چەند دەنگە شەپۆلێكیان ناردو شەپۆلەكان لەناو جەرگەی مانگیش جووڵانەوە، ئەوە بوو كە ناوجەرگەی مانگ هێشتاش هەر بڵێسەدارەو چەند نموونەیەكیان لە تاوێرەكانی ناو جەرگەی مانگ‌و بەرزاییەكان‌و لە چیاكان‌و دۆڵەكانی مانگ لە گەڵ خۆیاندا هێنا، هەروەها ئەو نمونە تاوێرانەیان شی كردەوەو توێژینەوەیان لەسەر كردن ئەوە بوو گەیشتنە ئەو ئەنجامە كە: بێگومان مانگ ڕۆژێك لە ڕۆژان بڵێسەدار بووەو كوژاوەتەوە.

منیش لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن موحەممەدەوە(ﷺ)بوایە.. ئەوا دەیگوت: وجعل فيها سراجين، سراج في النهار وسراج في الليل. سراج حار وسراج بارد، كێ هەبوو بە درۆی بخاتەوە؟!

بەڵام ئەمە لەلایەن خودای زاناو داناوەیە کە فەرموویەتی (**وجعل فیها سراجا**) کە مەبەستی خۆرەو (**وقمرا منیرا**)، باسکردنی رووناکی مانگ لەدوای باسکردنی (سراج) بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە مانگ بەرووناکی (سراج-خۆر)ەوە رووناك دەبێتەوە. **فسبحان الله العظیم.**

## سەرنج بدەن خوای گەورە چی بەدی هێناوە

### سورەییا

((سورەییا)): کۆمەلە ئەستێرەیەکە شوێنەکەی لەناو کەلووی گایە، لە کۆنەوە بە حەوت خوشکەکە ناسراون، ناوی (سورەییا)ش لە(**الثروة**) و(**الثراء**)ەوە هاتووە، لە بەر نزیك بونی لە بارانو خێرێکی زۆرەوە

ئەمرۆ بە چاو بەتەنیا دەتوانین (٦)لەو ئەستێرانە بە ئاسانی جیا بکەینەوە، بەڵام بابو باپیرانمان بەهێزی نیگایانەوە هەر حەوت ئەستێرەیان بە روونی دەدیت، کە ئەستێرەی حەوتەم دەکەوێتە ناوەراستی ئەو کۆمەڵەوە.. سووردییا نزیکەی (٥٤١)ساڵی رووناکی لە ئێمەوە دوورە، رەونەق دارترین ئەستێرەیەیان بە ملوانکەی سورەییا دەناسرێت.

هێزی رەونەقە رووکەشیەکەی (٢,٨٦)و قەبارەکەشی (٩)هێندەی قەبارەی خۆردو پلەی گەرمی رووکاریشی (٥)هێندەی پلەی گەرمی خۆرە.



هەروەها سوردییا لە وەرزی زستاندا لە هەموو وەرزەکانی دیکە ئاشکرا ترو روونتر دەبینرێت.

### سەدیمی چاوە پشیلە
### ( ئەستێرە مردووەکە )

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ﴾**الواقعة:٧٥**.واتە: (سوێندم بە شوێنی ئەستێرەکان)

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ{٦}

فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ{٧} وَخَسَفَ الْقَمَرُ{٨} وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ{٩} يَقُولُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ{١٠}﴾ القيامة : ٦-١٠.

واتە: (بێباكانە دەپرسێت: كوا، كەی ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت؟!* كاتێك دێت، چاو ئەبڵەق دەبێت* مانگیش دەگیرێتو تاریك دەبێت* خۆرو مانگ كۆدەكرێنەوەو دەدرێن بەیەكدا* ئەو ڕۆژە ئینسان دەڵێت: بۆ كوێ رابكەم، لە كوێوە خۆم رزگار بكەم) هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا انشَقَّتِ السَّمَاء فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ﴾الرحمن:٣٧.

واتە: (كاتێك دێت ئاسمان شەق دەبێتو وەكو گوڵێكی سوور دێتە بەر چاو، یاخود وەك ڕۆنی قرچاوی لێدیت).



ئەم وێنەیە بناغەی سەدیمی هەسارەیی بەدیار دەخات: كە هەور گەلێكی گازی مەزنە ئەستێرەیەكی مردوو لە چەند تەقینەوەیەكی یەك لە دوای یەك دەری كردووە.

دەركردنی ماوەدرێژی گازە داگیرساوە تازە پێگەیشتووەكە لە تەقینەوە یەكی نوێدا لە دوو هەوری گازاوی داوە، لە تەقینەوەیەكی پێشتردا دەرهاوێژراون.

پاش ماوەكەش ناوكە هایدیرۆجینیەكانی بەكار دەبرێو لە دواییدا مەزن دەبێ هەتا دەگاتە زەوی، ئەو دەرهاویشتە گازیانەی كە دەری دەكات لە فراوان بووندا بەردەوام دەبێت هەتا خۆرەكە دەگۆرێت بۆ سەدیمیكی هەسارەیی.

## کەشکەشانی ئەندرۆمیدا یاخود( ئاوێنەی زنجیرە دار )



ئەو کەشکەشانە دەوروبەری دوو ملیۆن ساڵێکی رووناکی لە ئێمەوە دوورە، رووناکیەکەشی لە ماوەی دوو ملیۆن ساڵی رابردووەوە لێی دەرچووە، واتە ئەو کاتەی کە مرۆڤ لەسەر رووی زەوی.

هێشتا بەدی نەکرابوو، ئەو رووناکیەی کە ئێستا لێیەوە دەگاتە ئێمە وامان لێدەکات هەر وەکو لەماوەی دوو ملیۆن ساڵی رابردوو چۆن بوو ئاوا ببینین، هەروەها ئێمە هیچ شتێکی لە بارەیەوە نازانین، دەبێ لە جێگەی خۆی جوڵابێت، نموونەی ئەمە وەکو نموونەی باقی کەشکەشانەکانی دیکەیە کە لەم گەردوونەدا هەن. والله تعالی اعلم

خودای گەورەش راستی فەرمووە: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ق:٦.واتە:(ئایا وردنە بوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە بە سەریانەوەیە: چۆن درووستمان کردووەو رازاندوومانەتەوە بە جۆرێك هیچ کەمو کوڕیو کەلێنێکی تێدانییە!؟).

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ﴾الحجر:١٦.واتە: (سوێند بە خوا، بەڕاستی ئێمە لە ئاسماندا چەند خولگەیەکی گەورەمان بەدی هێناوە بۆ ئەستێرەکانو رازاندوومانەتەوە بۆ ئەوانە کە بە وردی تەماشای دەکەن).

## هێزی کێش کردن

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾الرعد:٢واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە بەچاوی خۆتان دەبینن* چۆن ئاسمانەکان بەبێ

كۆڵەگەو ستوون بەرز كردۆتەوەو ڕایگرتووە..)

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾لقمان:١٠.

واتە: (ئاسمانەكانی دروستكردووە بەبێ كۆڵەگە بەچاوی خۆتان دەیابینن) هەندێك بەم شێوەیە ڕاڤەیان كردووە كە خوای گەورە بەبێ هیچ كۆڵەگەیەك بەرز ڕایگرتووە، بەلاّم خودای گەورە نەیفەرمووە: ((تَرَوْنَهَا بِغَيْرِ عَمَدٍ)) بەلْكو فەرموویەتی: ((بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا)) كەوابوو ئەو بینینەی كە خودای گەورە باسی لێوە كردووە بۆ كۆڵەگەكانە، كەواتە كۆڵەگە هەن بەلاّم ئێمە نایان بینین، ئەویش كۆڵەگەكانی كێشكردنە كە گەردوون لە دارمان دەپارێزێت.

ئیبن كەسیر لە ڕاڤەكەیدا دەڵێت: (( لە ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو حەسەنەوە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) ریوایەت كراوە كە دەڵێن: ئاسمان كۆڵەگەی هەیە بەلاّم ئێمە نای بینین)): كەوابوو ڕستەی (ترونها) وەسفە بۆ (عمد) واتا بەبێ كۆڵەگەی دیتراو، والله تعالی اعلم.

## شــــەو و ڕۆژ



خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾الزمر:٥.

واتە، بەشێوەی كەوانەیی شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت، بەهەمان شێوەی كەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت...)

وشەی (التكَوّير) لەڕووی زمانەوانیەوە: واتە پێچی جامانە، هاتنی شەو بەشێوەی كەوانەیی بەسەر ڕۆژدا، ڕۆژیش بەسەر شەودا بەلْگەیە لەسەر بزوتنەوەیەكی بازنەیی بەردەوام،

وەلەكاتی چەسپاندنی سوڕاندنەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا وایلێكردین، زیاتر لەو ئایەتە بگەین، كە ئەو سوڕانەوەیە هۆیەكە بۆ بەدوای یەك داهاتنی شەوو ڕۆژ.

بێگومان ئاسمانی گەردوون بەسروشتی خۆی سەرە ڕای هەبوونی خۆرو ئەستێرەكانیش تیایدا هەر تاریكو لێڵە، توێژەرەكانی پێشوو ڕۆیشتون بۆ موناقەشەكردنی ئەو باسەو هەوڵدان بۆ بەیانكردنی ئیعجاز لەو ئایەتە پیرۆزانەی كە تاریكایی ئاسمانی گەردوونیی ڕوون دەكەنەوە، هەروەها جیاوازی نێوان (ضیاء و نور)و، (انسلاخ الليل من النهار)چیە، لەگەڵ ئەوەی لەكاتی بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان چاو چی دەبینێت.

ئەو كەسەی كە سەرنج دەداتە ئایەتە پیرۆزەكانی قورئانو تێیان ڕادەمێنێت، ژمارەیەك لەهەقیقەتەكان هەڵوەستەی پێدەكەن:

(یەكەمیان) باسكردنی (شەو)ە كە لەقورئانی پیرۆزدا لەپێش (ڕۆژ)دێت: ﴿**إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ**﴾البقرة:١٦٤.و ﴿**الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرّاً وَعَلاَنِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ**﴾ البقرة: ٢٧٤.و ﴿**تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الَمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ**﴾ال عمران:٢٧. و ﴿**إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ**﴾ال عمران:١٩٠. و ﴿**وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ**﴾الانعام:١٣. و ﴿**وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾الانعام:٦٠.و﴿**إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ حَتَّىَ إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَاراً فَجَعَلْنَاهَا حَصِيداً كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**﴾يونس:٢٤. و﴿**هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ**﴾يونس:٦٧. و﴿**وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**﴾الرعد:٣. و﴿**سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ**

بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾الرعد:١٠. و﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً﴾الاسراء:١٢. و﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾الانبياء:٢٠. و﴿قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَنِ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ﴾الانبياء: ٤٢. و﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾الحج:٦١. و﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾المؤمنون:٨٠. و﴿يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الْأَبْصَارِ﴾النور:٤٤. و﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاساً وَالنَّوْمَ سُبَاتاً وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُوراً﴾الفرقان:٤٧. و﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾النمل:٨٦. و﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾القصص:٧١. و﴿وَمِن رَّحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾القصص:٧٣. و﴿وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾الروم:٢٣. و﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّاماً آمِنِينَ﴾السبأ:١٨. و﴿وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَندَاداً وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الْأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سبأ:٣٣. و﴿يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾غافر:٦١. و﴿وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾الجاثية:٥. و﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾الحديد:٦. و﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُوماً فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾الحاقة:٧. و﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً﴾نوح:٥. و﴿قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً﴾المزمل:٢﴾ و﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْءاً وَأَقْوَمُ قِيلاً{٦} إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحاً طَوِيلاً﴾المزمل:٦-٧. و﴿إِنَّ هَذِهِ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً{١٩} إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ

اللَّه فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْراً وَأَعْظَمَ أَجْراً وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾المزمل:٢٠. و﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاساً{١٠} وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشاً{١١}﴾النبأ:١٠-١١.و﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾النازعات:٢٩﴾ و﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى{١} وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى{٢}﴾الليل:١-٢.

(دووەمیان) باسكردنی (خۆر)ە پێش (مانگ) لەقورئانی پیرۆزدا: ﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾يوسف: ٤. و﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾الحج:١٨. و﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾العنكبوت:٦١. و﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾الرحمن:٥. و﴿وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ﴾القيامة:٩.

(سێیەمیان)لە هەركوێیەكدا باسی (شەو)و (ڕۆژ)و (خۆر) و(مانگ) بەیەكجار باسكرابن ئەوا هەردەبێ (شەو) لە پێش (ڕۆژ)و، (خۆر) لە پێش (مانگ) باسكرابێت.

ئەمەش لە (١٢) شوێنان لەقورئانی پیرۆزدا خۆی دەنوێنێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾الاعراف:٥٤. و﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللّهُ ذَلِكَ إِلاَّ بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ{٥} إِنَّ فِي اخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ{٦}﴾يونس:٥-٦. و﴿المر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ وَالَّذِيَ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يُؤْمِنُونَ{١} اللّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ{٢} وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾الرعد:٢-٣. و﴿وَسَخَّر لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَينَ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ابراهيم:٣٣. و﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالْنُّجُومُ مُسَخَّرَاتٌ بِأَمْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾النحل:١٢. و﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ

اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾الانبياء:٣٣. و﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاء بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُّنِيراً {٦١} وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً {٦٢}﴾الفرقان:٦١-٦٢. و﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾لقمان:٢٩. و﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾فاطر:١٣. و﴿وَآيَةٌ لَّهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ {٣٧} وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ {٣٨} وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ {٣٩} لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ {٤٠}﴾يس:٣٧-٤٠. و﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾الزمر:٥. و﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ {٣٧} فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْأَمُونَ {٣٨}﴾فصلت:٣٧-٣٨ .

توێژەر بۆ ئەوە دەچێ كە بێگومان ئەو هەقیقەتە قورئانیانە، لە گەڵ هەقیقەتە زانستییەكان دەگونجێت، گەردوون(شەوێك)ی بەردەوامە، كەواتە بناغەكە تاریكاییە.(خۆرێك) واتە ئەستێرەیەكی ئاگرینی تێدایە ئەو رووناكییەی لێوەی دەردەچێت نابینرێت، تەنیا لەوكاتە نەبێ كە رووناكییەكەی لە هەسارە تاریكەكانی ئاسمانییدا دەشكێتەوە بۆ ئەوەی رووناكیان بكاتەوە، لە گەڵ تێبینی لەوەی كە هەقیقەتی سێیەمین بە پێچەوانەی ئەوەی بەهەستی مرۆڤەكان دادێ ـ بەبێ هیچ ـ مەعریفەیەكی زانستی ـ ئەویش رەچاو كردنی ئەم هەمەئاهەنگییەیە لە نێوان (شەو) كە بەرامبەرەكەی (مانگ)ەو(رۆژ)یش بەرامبەرەكەی(خۆر)ە.

ئەمەش لە بەر ئەوەی ئایەتە پیرۆزەكان گوتەی هەقی خودای پەروەردگارن، كە بە دیهێنەری هەموو شتێكە..

بێگومان بایەخی زانینو ناسینی ئەو هەقیقەتانە بریتییە لە تێرامان لە حیكمەتی پێچەوانەكانیان لە شەش ئایەتی پیرۆزدا كە ئەمانەن:﴿ وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّـيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾هود:١١٤. و﴿أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ

وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾الاسراء:٧٨. و﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ آنَاء اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾طه:١٣٠. و﴿وَالضُّحَى{١} وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى{٢}﴾الضحى:١-٢. و﴿وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُوراً وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾نوح:١٦. و﴿فَالِقُ الإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَناً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَاناً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾الانعام:٩٦. و﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا{١} وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا{٢} وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا{٣} وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾الشمس:١-٤ .

بەڵكو كەسێك بتوانێت هەڵوەستە لەسەر مانا نوێیەكانیان بكات، لەكاتی ڕامانو بیركردنەوە لەو ئایەتە پیرۆزانە، لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی لەپێش ئەمانەدا باسكرا.(والله تعالى اعلم).

## خۆرو مانگ بەحیسابێكی ورد دروست كراون

خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾الرحمن:٥.واتە:(خۆرو مانگیشی بە حیسابێكی ورد دروست كردوونو دایناون لە خولگەكانیاندا لە سوڕانەوە دان).

زاناكان دەڵێن: ئەو ئایەتە بەڵگە نییە لە سەر سیستەمی خۆریو مانگی وەكو هەندێ كەس خەیاڵیان بۆی دەچێت، بەڵكو ئەمە ئیعجازێكی گەورە ڕاڤە دەكات كە زانستی نوێ دۆزیویەتەیەوە، ئەویش ئەوەیە كە خۆرو مانگ سیستەمێكی وردو حیسابكراویان لە ڕووی گەرمییو قەبارەو دووریەوە هەیە...

چونكە كوڕی شیرینم ئەگەر خۆر كەمێك گەورەتر بووایە.. یاخود لە زەوی نزیكتر بووایە، ئەوا ئێمە دەسووتاینو دەبووینە خەڵوز..

ئەگەر كەمێك بچوكتر بووایە یاخود لە زەوی دوورتر بووایە ئەوا دەبووینە سەهۆڵ..

بەهەمان شێوەش مانگ، ئەگەر كەمێك گەورەتر بووایە یاخود نزیكتر بووایە، ئەوا لەناو هەڵكشانی ئاوی دەریادا دەخنكاین، هەروەها ئەگەر كەمێك بچووكتر یاخود لە زەوی دوورتر بووایە ئەوا دەریاكان نەدەمان..

ئەدی ئەوە بەڵگە نییە لە سەر حیسابێكی ورد؟؟

# چوونە بۆشایی ئاسمان

خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَاباً مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ{١٤} لَقَالُواْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ{١٥} ﴾الحجر:١٤-١٥.

**واتە: (ئەگەر دەروازەیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بکردانایەتەوە تا پیادا سەربکەونو تێپەربن* ئەوە دەیانگوت: بێگومان چاو بەستمان لێکراوە، یاخود ئێمە کەسانێکی جادوو لێکراوین).**

ئەو ئایەتە لە سێ خاڵی موعجیزەی سەرەکی دەدوێت کە دەبێ ڕەچاوبکرێن بەر لە هەوڵدان بۆ چوونە بۆشایی ئاسمان.

١- چەند دەروازەیەکی دیاری کراو لە بەرگەهەوادا هەنە لە حاڵەتی دەرچوون بۆ هی دیکە، ئەوا کەشتی ئاسمانی دەتەقێتەوە! وەکو قورئان لە وشەی (بابا)واتە(دەروازەیەك) ئاماژەی پێداوە.

٢- وشەی (يَعْرُجُونَ) دوو مانا دەگەێنێت، (العروج) واتە سەرکەوتنو بەرز بوونەوە، (العروج) بەمانای لاربوونەوەش دێت، کە مەرجە بۆ دەرچوونی کەشتی ئاسمانی لە بەرگە هەوادا.



٣- لە دوای دەرچوون لە بەرگە هەوادا تاریکاییەکی ڕەش دەوری کەشتیەوانی ئاسمان لە هەموو لایەکەوە دەدات، وەکو ئەوەی کەشتییەوانەکە چاوەکانی نوقاندبێت:﴿ سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا ﴾.

# لەت بوونی مانگ



خـــــودای گـــــــەورە دەفەرموویێت:﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾القمر:١.

واتە:(رۆژی قیامەت نزیك بۆتەوەو، مانگیش لەت بوو)

یـەكێك لـە قورەیـشیەكان پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) كرد پێنج ساڵ بەر لە كۆچ كردنی لـە مەككەوە بۆ مەدینە یەكێك لـە قورەیـــشیەكان پرســـیاری لـــە پێغەمبەر(ﷺ) كرد و، پێی گوت: هۆ محمد ئەگەر تۆ بەڕاستی پێغەمبەرو نێردراوی خودایت، فـەرموو موعجزەیەك بهێنە، كە شاهێدی لە سەر پێغەمبەریەتیو پەیامەكەت بدات؟

پێغەمبەریش(ﷺ) دەستی بە نزاو پارانەوە لە خودا كرد، بۆئەوەی لەو هەڵوێستەدا سەری بخات، خودای گەورەش خستیە دڵیەوە كە بە ئەنگوستی پیرۆزی ئاماژە بۆ مانگ بكات، دەست بە جێ مانگ بووە دوو لەت.. بۆ چەند كاتێك لە یەكتر دووركەوتنەوە پاشـان بـە یـەكتر نووسـانەوە. جـا كافردكـان گوتیان: محمد(ﷺ) جادووی لێكردین!

بەڵام هەندێك لە ئاقڵ مەندەكانیان گوتیان: بێگومان جادوو تەنیا كاریگەری دەكاتە سەر ئامادە بووان، بەڵام ناتوانێت كاریگەری بكاتە سەر هەموو خەڵكی، ئەوە بوو چاوەڕێیان كرد هەتا كاروانـەكان لە سەفەر گەڕانەوە، كافرەكانیش خێرا بۆ دەروازەكانی مككە ڕایان كرد چاوەڕێی گەیشتنی كاروانەكان بوون كە لەسـەفەر دەگەڕانەوە، جا لە گەڵ گەیـشتنی یەكـەمین كـاروان كافرەكـان لێیـان پرسـی: ئایـا شتێكی نامۆیان دیت كە بە سەر ئەو مانگەدا هاتبێت؟

گوتیان: بەڵێ، لە فلانە شەودا مانگمان دیـت بـووە دوولـەتو لـە یـەكتر دووركەوتنـەوە پاشـان بەیەكترەوە نووسانەوە.

جا لەوان ئەوەی ئیمانی هێنا ئیمانی هێناو ئەوەشی باوەڕی نەهێنا باوەڕی نەهێنا. بۆیـە خـودای

گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت:﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ{١} وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ{٢} وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ{٣} ﴾القمر:١-٣.

**واتە: (رۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە * مانگیش لەت بوو * خۆ ئەگەر ئەوانەی هەر موعجیزەیەك ببینن، پشت هەڵدەكەنو دەڵێن: ئەمە جادوویەكی بەردەوامە* هەقیقەتو ڕاستی بەدرۆ دەزانن و شوێنی ئارەزووەكانیان كەوتوون، لە كاتێكدا هەموو شت تەواو دەبێتو هەموو كارێك كۆتایی دێتو دنیا تەواو دەبێتو بە بەرپا بوونی قیامەت لەنگەر دەگرێت). هەتا كۆتایی ئەو ئایەتانەی كە لەم بارەیەوە دابەزیون).**

گەنجێكی موسڵمانی بەریتانیایی دەڵێ: من ناوم ((داود موسا بیتكوك))ە، سەرۆكی پارتی ئیسلامی بەریتانیم، (بەر لەوەی مسڵمان ببم) بەدوای ئاینەكاندا وێڵ بووم، جایەكێ لە قوتابییە موسڵمانەكان كتێبێكی وەرگێڕاوی ماناكانی قورئانی پیرۆزی بە دیاری پێدام، منیش سوپاسیم كردو لێم وەرگرتو بردمە ماڵەوە، كاتێك ئەو كتێبە وەرگێڕاوەم كردەوە، یەكەم سورەت كە بە سەرم كردەوە(القمر)بوو، ئەو ئایەتەم خوێندەوە:﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾القمر:١ ئینجا گوتم: ئایا ئەو قسەیە دەچێتە ئاقڵەوە؟ دەكرێ مانگ لەت ببێو پاشان یەكدی بگرێتەوە، چ هێزێك دەتوانێت كاری لەم جۆرە بكات؟ گەنجەكە دەڵێت: ئەو ئایەتە كۆسپی بۆ دروست كردم، لەوەی بەردەوام بم لە خوێندنەوەی، بەكاروباری ژیانەوە سەرقاڵ بووم، بەڵام خودای گەورە دەیزانی كە من چەند بە دڵسۆزیەوە بەدوای هەقیقەتدا دەگەڕێم، ئەوە بوو خودای گەورە منی لە بەردەم كەناڵێكی تەلەفزیۆنی بەریتانیایی دانا كە گفتوگۆیەك بوو لەنێوان بێژەرێكی بەریتانیاییو سێ لە زاناكانی گەردوون ناسی ئەمریكایی..

ئەو بێژەرە گلەیی لەو زانایانە دەكرد لە سەر ئەو پارە زۆرەی كە لە گەشتە ئاسمانیەكاندا بەكاریان هێنابوو، لەو كاتەی كە زەوی پڕەلە گێروگرفتەكانی برسێتیو هەژاریو نەخۆشیو دواكەوتوویی..

جا ئەم سێ زانایانە كە خۆیان كەشتیەوانی ئاسمانی بوون، بەرگریان لە دیدی خۆیان دەكردو دەیانگوت: بێگومان ئەو تەكنیكە لە زۆر لایەنەكانی ژیاندا، وەكو لە پزیشكیو پیشە سازیو كشتوكاڵیدا جێبەجێ دەبێ، كەواتە ئەو پارەیە بە خۆڕایی خەرج نەكراوەو بەفیڕۆ نەدراوە.. بەڵام یارمەتی ئێمەی داوە لە پەرەپێدانی تەكنەلۆژیایەكی یەكجارپێشكەوتوو.. لە میانەی ئەو گفتوگۆیەدا باسی گەشتێكی دابەزینی پیاوێك لە سەر رووی مانگ هاتە پێشەوە بەو حیسابەی كە لە هەموو گەشتەكانی دیكە خەرجی زیاتر بووە، زیاتر لە سەد هەزار ملیۆن دۆلاری تێچوو بوو.. لەوكاتەدا

بێژەرە بریتانیایەکە بەسەریدا هاوار کردو گوتی: ئەمە چ گەمژەییەکە؟ سەد هەزار ملیۆن دۆلار! بەس بۆ ئەوەی ئالاّی ئەمریکی لەسەر رووی مانگ بچەقێنن؟

گوتیان: نەخێر، ئامانج ئەوە نەبوو کە ئالاّی ئەمەریکی لە سەر رووی مانگ بچەقێنین، بەڵکو ئێمە توێژینەوەمان لەسەر پێکهاتەی ناوەوەی مانگ دەکرد، بەمە هەقیقەتێکمان بەدی کرد کە ئەگەر دوو هەندەی ئەو ماڵەمان خەرج کردبا بۆ ئەوەی قەناعەت بە خەڵکەکە بهێنین تاکە کەسێکیش پێی باوەڕ نەدەکردین.

بێژەرەکە پێی گوتن: ئەو راستییە چییە؟

گوتیان: ئەو مانگە رۆژێك لە ڕوژان لەت بووەو پاشان یەکتری گرتۆتەوە. بێژەرەکە پێی گوتن: ئیوە چۆن ئەوەتان زانی؟

گوتیان: کە مەردیەکمان لە تاوێرە گۆڕاوەکان بەدی کردکە مانگی لە رووەکەیەوە بۆ ناوەوەی و بۆ رووەکەی دی دەبڕی. ئەوە بوو ڕاویژمان بە زەوی ناسانو زانایانی جیۆلۆجیاوە کرد، ئەوانیش گوتیان: ناکرێ شتێکی وا ڕوویدابێت تەنیا ئەگەر ئەو مانگە دوولەت بووبێ‌و پاشان یەکتری گرتبێتەوە..!

گەنجە موسڵمانەکە(سەرۆکی پارتی ئیسلامی بەریتانیایی)دەڵێ: منیش دەست بەجێ لەسەر ئەو کورسیەی کە لە سەری دانیشتبووم هەڵسامەوەو گوتم: مەعجزەیەك پێش هەزارو چوار سەد ساڵ بۆ محمد(ﷺ) روودەدات، خودای گەورەش ئەمریکاییەکان رام دەکات بۆ ئەوەی زیاتر لە سەد هەزار ملیۆن دۆلار خەرج بکەن بۆ ئەوەی بۆ مسڵمانەکانی بسەلمێنێت؟ ئەو ئایینە هەق‌و ڕاستە.

گەنجە مسڵمانەکە دەڵێ: منیش گەڕامەوە سەر قورئانەکە، سورەتی (القمر)م خوێندەوە. ئەوە بووە دەروازەو رێگە بۆ مسڵمان بوونم..

## موسڵمان بوونی بەڕێوەبەری روانگەی گەردوونی تۆکیۆ لە یابان

یەکێکە لەزانا بەناوبانگەکانی پسپۆڕ لە زانستی گەردوونناسی، ئەویش (برۆسۆ یوشادی کروزای) بەرێوەبەری چاودێرگەی گەردوونی تۆکیۆیە لە یابان، لە بەر تازەگەری‌و ئامێرو کەل‌و پەلەکانی بەدووەم چاودێرگە لە جیهاندا دادەندرێت.. خودای گەورە ویستی لەسەر بوو کە ئەو پیاوە سەردانی سعودیە بکات، لەوێدا دیمانەیەکی زانستیانەی گەورە لە زانکۆی مەلیك عبدالعزیز لە گەڵیدا سازکرا، کە ئاپۆرە زانایەکی پسپۆر لە زانستە گەردوونیەکانو جیلۆجیەکان ئامادەی بوون.. لە پاڵ ئەمانیشدا

هەندێك لە زاناموسڵمانەكانیش لەوێدا ئامادە بوون لەوانە شێخ(عبدالمجید الزندانی)..

لەدوای ئەوەی چەمكە زانسیانەكانی قورئان لە گەردوون ناسیو هەقیقەتە گەردوونیەكان پێشكەش كرا..

دوای بە قووڵی تێگەیشتنو زانستێكی گەورە، خودای گەورە دڵی ئەو پیاوەی بۆ ئیمان كردەوەو دوو دڵی رووی تێنەكرد كە بەڵگە مێژوویەكەی خۆی رابگەیەنێ، وەكو دان پێنانێك بەو ئاینە مەزنە.. كە بەدەستی خۆی تۆماری كرد كە ئەمە وەرگێرانی پیت بە پیتی نووسینەكەیەتی: (لەدوای ئەوەی من هاتمە ئێرە، دیتم كە هەقیقەتگەلێكی زانستیانە لە قورئاندا هەیە.. هەروەها گەردوونو ئەو هەموو شتەی كە تێیدایە لە قورئاندا لە بەرزترین خاڵی ئەو بوونەوەرەدا شرۆڤەو راڤە كراوە.. هەتا هەموو شتێك تیایدا بە ئاسانی تێیان دەگەی.. منیش موسڵمان بوونی خۆم رادەگەێنم)).

# پەستانی هەوا

خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء﴾الانعام:١٢٥.

**واتە: (جا ئەو كەسەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی سافو پاك ئامادە دەكات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو كەسەش خوا بیەوێت گومرای بكات، ئەوا دڵی دەگوشێتو سنگی توند دەكاتو هەناسەی سوار دەبێت، هەورەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرزببێتەوە، ئابەو شێوەیە خوا گومراییو پیسی هاوەڵگەری لە سەر دڵی ئەوانە دادەنێت كە باوەڕ ناهێنن).**

راڤەكردن:

**الحَرَج** : تەسك ترین. ئیبن ئەلئەسیر دەڵێ: **الضیق، رجل حرج، وحرج** : واتە سینگ توندیو هەناسە سواری، وحرج صدرة: واتە سینگی توند بوو بۆ كاری خێر گوشاد نەبوو.

## چەند هەقیقەتێكی زانستی:

زاناكان دەڵێن: هەرچەندی مرۆڤ بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە، پەستانی هەوا نزم دەبێتەوە، بڕی گازی ئۆكسجین كەم دەبێتەوە، دەبێتە هۆی هەناسە سواری.

## ڕاڤە کردنی زانستیانە:

خودای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفـەرموویت:﴿ فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾الانعام:١٢٥.

ئەمە ئایەتێکی موحکەمە، بەو پەڕی ڕاشکاویو ڕوونو ئاشکراییەوە ئاماژە بە دوو هەقیقەت دەدات، زانست سەلماندوونیەتی:

یەکەم: بێگومان ئەو گۆڕانە مەزنەی کە لەکاتی خێرا بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان لە پەستانی هەوا ڕوودەدات، دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ تووشی سینگ تەنگیو هەناسە سواری ببێت.

دووەم: ئەوەیە کە هەرچەندی مرۆڤ بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە، پەستانی هەوا نزم دەبێتەوەو، بڕی ئۆکسجینیش کەم دەبێت، کە دەبێتە هۆی سینگ تەنگیو هەناسە سواری.

لە ساڵی (١٦٤٨ز)دا زانای بەناوبانگ((بلێز باسکاڵ)) سەلماندی، هەرچەندی لەئاستی ڕووی دەریاوە بەرزبینەوە پەستانی هەوا کەم دەبێتەوە.

شتێکی بەڵگە نەویستیشە مرۆڤ لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) هیچ شتێکی لە بارەی گۆڕانی پەستانی هەواو کەم بوونەوەی لە کاتی بەرزبوونەوەی بۆ ئاسمان نەدەزانی، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی هەناسە سواری، بەڵکو لە کاتی زۆر بەرزبوونەوەدا دەبێتە هۆی تەقینی خوێن بەرەکان، جا کێ ئەو هەموو شتەی بە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاگەیاند.. لە گەڵ ئەوەشدا زانست زۆر لە دوای ئەودا ئەم هەقیقەتەی دۆزییەوەو ئاشکرای کرد.

# ئایەتەكانی خودا لەبارەی رووەك

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت:﴿ وَهُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُّتَرَاكِباً وَمِنَ النَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انظُرُواْ إِلِى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾الانعام:٩٩.

**واتە: (ئەو خوایە زاتێكە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، بەهۆیەوە چرۆوچەكەرەی هەموو شتێكی پێ دەردەهێنین‌و شینی دەكەین، ئینجا لاسكی سەوزی لێ پەیدا دەكەین، زنجیرە دانەی سەفتەكراوی لێ دروست دەكەین، لە دارخورماش لە هەندێ لق‌و چلەپۆپی هێشووی خورما شۆڕ دەبێتەوە، هەروەها باقی هەموو جۆری ڕەزوترێ، زەیتون‌و هەناریش، هەیانە لەڕواڵەتدا لە یەك دەچێت، هەشیانە لەیەك ناچێت، تەماشای بەرەكەی بكەن كاتێك بەردەگرێت، پێدەگات، بەڕاستی ئاڵەو شتانەدا چەندەها بەڵگەو نیشانەی تەواون بۆ كەسانێك كە ئیمان‌و باوەڕ دەهێنن).**

* رووەكەكان بۆ خۆیان جیهانێكن‌و، زاناكان بەردەوام هەوڵ‌و كۆشش دەكەن لەپێناوی دیراسەكردنیان‌و گەڕان بەدوای بابەتەكانیان.. هەموو رۆژێكیش زاناكان لە دۆزینەوەی تایبەتمەندیەكانیان قۆناغ گەلێكی فراوان دەبڕن.. بێگومان زاناكان ڕووەكیان بۆ چەند بەشێكی جیاواز دابەش كردووە لە رووی سیفەتە توێكاریەكانی‌و پیتاندنی‌و ژینگەكەی.

* رووەك بەگشتی لە تۆوێكەوە دەڕوێت‌و شین دەبێت، ئەگەر بارودۆخی تایبەتی بۆ فەراهەم بێت، گرنگترینیان ئەوەیە ناوكی زیندووبێت، تۆەوكانیش بۆ ماوەیەكی پارێزگاری لە زیندەگی ئەو ناوكە، ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە كە لە سەر هەبوونی خودای پەروەردگار، ئەوەتا توانراوە چەند دەنكە گەنمێك لە ناو گۆڕەكانی فیرعەونەكاندا دۆزراونەتەوە بیچێنن‌و بیڕوێنن.

هەروەها پێویستە ئاوی پێویست بۆ شین بوونیان فەراهەم بێت، بەهەمان شێوە دەبێ پلەی گەرمیی گونجاویان هەبێ، چونكە هەر تۆوەك لە پلەی گەرمییەكی دیاركراودا شین دەبێت، هەروەها هەواش بەهەمان شێوە بۆ رووەك پێویستە..

كەواتە رووەكەكان بوونەوەرێكی زیندوون دەژین‌و هەناسەدەدەن، بەڵكو هەستیش دەكەن‌و.. خەمبارو كامەرانیش دەبن!.

کوڕی شیرینم چهند تاقیکردنهوه له سهر رووهك ئهنجام درا به ئامێری پێوانه کردنهوه له ناو کهشتی ئاسمانی دانران.. تۆمارهکان ئهوهیان روون کردهوه زهبری ههستیی تووشی رووهکهکان هاتو شڵهژانو پشێوی له سهریان بهدیار کهوت!.

کاتێکیش گهڕانهوه سهر زهوی، ئارامیو هێمنیان بۆ گهرایهوه وهکو پیش بهرزبوونهوهیان بۆ بۆشایی ئاسمان.

ئهگهر تۆوێك چێنرا، ناوکهکهی رهگێکی وردی درو کرد، دهست دهکات به خواردنی خۆراکی خهزن کراوی ناو تۆوهکه، ههتا لاسکی ڕهگهکهی درێژ دهبێت، ئینجا له خاکهکهی گیردهکات بۆ ئهوهی خۆراکی لێ بخوات، کاری لهمهدا وهکو کاری کۆرپهلهی مرۆڤو گیانلهبهرهکانه، ههتا له ناوسکی دایکیان خۆراك له دایکیانهوه وهردهگرن، پاشان له شیرهکهی، دواتر لێی جیا دهبێتهوهو له خۆراکیدا پشت به خۆی دهبهستێت، کاتێك که پهلهکانی بههێزدهبنو دهتوانێت له سهریان بڕواتو بهکاریان بهێنێت، ئایا جگه له خودا کهسێکی دیکه ههیه ژیان له نێو تۆوهکهدا بڕهخسێنێ؟

ئایا جگه له خودا کهسێکی دیکه ههیه هێزی ڕووچوونی بهناخی زهویو دهرکردنی لاسكو شین کردنی گهڵاکانو.. گوڵهکانو.. پاشان بهرووبوومهکانی بهخشیبێته ئهو تۆوه؟..

ژیانێکی ئاڵۆزو وهردو پتهوو ئاوهزدارو پێگهیشتووه که ئامانجهکهی پاراستنی جۆرو.. درێژهدان بهژیانه، جا پاكو بێگهردی بۆ ئهو خوایهی زیندووهو ژیانیش دهبهخشێنه بهدیهێنراوهکانی.

# کۆئهندامی خۆراکی رووهك

## ڕهگهکان

رهگهکان له یهکتر جیاوازن، یهکهمین بهشی خۆراکیهیه له رووهکدا بهگوێرهی پێویستی رووهکهکه شێوهیان به ئاشکرا له یهکتر جیاواز دهبێت، ئهوتا ڕهگه مێنمییهکانو، ڕهگه گرێ دارهکانو، ڕهگه ڕیشالهییهکانو، هی دیکهی ههواییو، ڕگهههناسهییهکان ههن..

ههموو ئهو شکڵه جیاوازانهش بۆ ئهوهیه تاکو رووهکهکه بهشی پێ‌یستی خۆی لهخۆراك بهدهست بهێنێت، بهڵام ئهو رووهکانهی که ڕهگی گونجاو بهدی ناکهن، ئهوا مژهریان ههیه بۆ خۆراك مژین، ههموو ئهوانهش که دروست کراون تهنیا بۆ ئهوهیه که یارمهتی رووهك بدات بۆ بهدهست هێنانی خۆراكو ههموارکردنی ژیانی ئهوهش بهویستو ئارهزووی خودای گهورهیه.




* (داروین) دەڵێ: ئەگەر رووەکەکان ئاوەزێکیان (عقل) هەبێت ئەوا دەبێ لە ڕەگەکانیان دابێ. لە بەر ئەوەی لە ناخی زەویدا هەوڵو کۆشش دەکەن بۆ برینی کۆسپو تاوێرەکان، ئەگەریش نەیتوانی بیبڕێت ئەوا لە سەر ڕێی خۆی لایدەبات، وەگەرنا ترشەڵۆکەکانی خۆی بە سەردا دەرێژێت تاکو بیتوێنێتەوە.

* هەروەها ڕەگەکان جگە لەمە سوودێکی دیکەی گرنگیان هەیە، ئەویش چەسپاندنو ڕاگیرکردنی رووەکەکەیە، چونکە ئەرکی وەستاندنو پارێزگاری کردنی رووەکەکەی دەکەوێتە ئەستۆ.. بۆ ئەوەی بەر نەبێتەوەو نەکەوێت..

کاتێك سەرنجی ئەو درەختە مەزنو زەبەلاحانە دەدەین بەو پەری ڕێكو پێكییەوە لە سەر زەوی وەستاون، پێویستە لە سەر ئێمەبیر لەو ڕەگە بکەینەوە کە ڕاگیری کردووە.

* ڕەگەکان کە گەشەدەکەن دەزوولە ڕەگییەکانیان لە سەرە گیراوەکانی زەوی لەژێرکاریگەری پەستانی ئەسمۆزی دەمژن، ئینجا ئاوگە کە بە کردارێکی ئاڵۆز بۆ سەرەوە دەگوازرێتەوە کە هەرکارگەیەکی کیمیاوی هەرچەندە ئامێرگەلو کەلو پەلی تێدابێ لە بەرامبەر پێکهاتەکەی دەستەوەستان دەبێت..!

رووەکەکە خۆراك دەخوات و گەشە دەکات.. بۆ گەشە کردنیشی دەبێ ((رووناکی، ئاو، کاربۆن، ئۆکسجین، هیدرۆجین، ئازۆت، فۆسفۆر، کبریت، پۆتاسیۆم، مەگنیسیۆم، ئاسن)) هەبن.

شتێکی سەیریشە کە تەواوی رووەکەکانی جیهان لەم توخمانە خۆراك وەردەگرن، لە گەڵ ئەوەشدا سێوی شیرین، گوژاڵگی تاڵ، لۆکەی نەرمو، رووەکی دڕکاوی، گەنمو جۆ، پرتەقاڵو لیمۆو زۆری دیکەش هەر لە زەوی دەروێنو شین دەبن.

بەیەك توخم گەل و، بەیەك تووە، لەو تووە بچووکانەدا هەزاران جۆرو، جۆرەها شێوەو، تامو بۆنو بەرامەگەلێکیان لێ دەردەچێت..!!

ئەمە بەڵگەو نیشانەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئاوەزیان (العقل) هەیە.

خودای گەورە دەفەرموویێت:﴿ وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾الرعد:٤.

**واتە: (لە سەر رووکاری زەوی پارچەی جۆراو جۆر هەیە لە پاڵ یەکدا، هەروەها باخی رەزی تریێ، کشتوکاڵی هەمە جۆر لە دانەوێڵەو بێستانەکاندا، دارخورمای یەك قەدو دووقەد، هەموو ئەوانە بەیەك ئاو ئاودێر دەکرێنو لە یەك جۆر ئاو دەخۆنەوەو هەندێکیانمان لە هەندێکی تر بۆ خۆراکی ئادەمیزاد ئازدار ترو پەسەند تر کردووە، بەڕاستی ئا لەو شتانەشدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانێك عاقڵو ژیری خۆیان بخەنەکار).**

## هەڵمینی ئاوی رووەك (النتح)




توانای بەدی هێنەری بەتوانا لە کرداری هەڵمیندا بەدیار دەکەوێت، مەبەست لە هەڵمینیش بە هەڵم بوونی ئاوە لە رووەکدا لە رێگەی گەڵاکانەوە، ئەو کارەی کە یارمەتی ئاوگەکە دەدات بە رەگەکانەوە بەرزبێتەوە بۆ سەرەوەو پێویستە ئەو کردارە بە شتێکی کەم بایەخ سەیر نەکرێ.. چونکە درەختێ وا هەیە لەرۆژێکی ئاساییدا پێنج سەد لیتر ئاو دەکاتە هەڵم، ئەگەر پلەی گەرمی بەرزبێتەوەو کەشو

هەوا وشك بێ، هێزی (با)ش زیادبكات ئەوا كرداری هەڵمینیش بەهۆیەوە زیاد دەكات..

هەروەها كەش‌و هەوای لەبارو خۆش لەناوچە مام ناوەندیەكان، باران بارین لەناوچە هێڵە یەكسانیەكان كەخاوەن دارستانی چڕو پڕن، وا لەكرداری هەڵمین دەكەن كەمتر ڕوودەن.

كرداری هەڵمین بەیارمەتی كونیلە گەڵێك كەبەسەر گەڵاكانەوە هەن بەئاكام دەگات و لەبەڵگەو نیشانە سەیروو سەمەرەكانی خودای بەدیهێنەر لەو كردارەدا، ئەوەیە دەبینین ژمارەی ئەو كونیلانە لەڕووەكێكەوە بۆ ڕووەكێكی دیكەوە كە بۆ ژینگەكەی دەگونجێ جیاوازن، ئەوەتا ژمارەی كونیلەكانی ڕووەكە بیابانیەكان كەمترن لە ڕووەكەكانی كێڵگەكان كە دەبێتە هۆی ئەوەی كرداری هەڵمین لەیەكەمدا كەمتر لەئەوەی دووەم ڕوو بدات.

هەرچی ئەندامی كونیلەیە ئەوا بەڵگەو نیشانەیەكە لەبەڵگەو نیشانەكانی خودای گەورە، چونكە لەدوو پاسەوانەخانە پێكدێت كەلەنێوانیاندا كونیلە هەیە، ئەو پاسەوانەخانە پاسەوانی لە كونیلەكە دەكەن كە بەهۆیەوە كرداری والا بوون‌و داخرانی بەگوێرەی پێویستی ڕووەكەكە ڕێكدەخرێت، ئەگەر خەستی شلەی ناو پاسەوانەخانەكان زیادیكرد، ئەوا ئاو لەخانەكانی دەورووبەری ڕادەكێشێت، پڕیدەكات هەتا شێوەیەكی گۆیی وەردەگرێت، بەمەش كونیلەكە والادەبێت‌و ئاوەكان دەبن بەهەڵم، هەروەها ڕەگەكان ئاو لەخاكەكەوە دەمژن، بەڵام ئەگەر ئاوگی پاسەوانەخانەكان خەست نەبوون، ئەوا كونیلەكە لایەكانی شۆڕدەبنەوە، دیوارەكانیشی خۆیان بەیەكەوە دەنووسێنن.. جاسەیری ئەو كردارە ناوخۆیە شاراوەیەبكە، كە چۆن بەوردەكاری‌و ڕێك‌و پێكییەوە بەئاكام دەگات، هەروەها سەیركە چۆن كۆئەندامەكانی بەشێوەیەكی ئەوتۆ كاردەكەن، كەبەزمانی حاڵ تواناداری‌و كەماڵی خودا دەردەبڕن!!.

## دروست بوونی خۆراك

لە بەڵگەو نیشانەكانی خودای گەورە دروست بوونی خۆراكە لەڕووەكدا، ئەو كردارە بە سازكردنی كاربۆنی دەناسرێت.

چونكە گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لە هەواوە لەڕێگەی كونیلەكانەوە دەچێتە ناو ڕووەكەكەوە، لەوێدا تووشی ماددەی كلۆرۆفیل‌و ئاو دەبێت، بەهۆی پلەی گەرمی‌و ڕووناكیەوە لە كاربۆنەكەدا كەرستەی خۆراك درست دەبێت.. هەرچی ڕێگەی دروست بوونی ئەو كەرستانەیە لەگازی دوودم ئۆكسیدی كاربۆندا، ئەوا كردارێكی كیمیاوی ئاڵۆزە، زانست قسەی لەبارەیەوە نەكردووە بەڵام هەبوونی

کلۆرۆفیل‌و ئاوو پلەی گەرمی، چەند گۆڕانکاریەکیان لێ بەرهەم دێت کە بەدروست بوونی کەرستەی خۆراکیەکان کۆتایی دێت، ئەمە لەناو رووناکی نەبێت بەئاکام ناگات، هەربۆیە ئەمەش بە((رۆشنە پێکهاتن)) (التمثيل الضوئي) ناودەبرێت

هەروەها زانست دان بەوەدا دەنێ ئەم کردارە دژوارترین‌و سەیرو سەمەرەترین کردارە کەژیان ئەنجامی دابێت‌و هیچ پێکهاتەیەك یاخود کۆئەندامێکی دیکە ناتوانن کارێکی وەکو ئەوەی گەڵایەکی سەوز لەهەر ڕووەکێك ئەنجامی دەدات ئەنجامی بدەن.

## هەناسەدانی ڕووەکەکان




لە ساڵی(١٧٧٩ز)دۆزرایەوە ڕووەکەکان هەناسە دەدەن‌و ئوکسجین وەردەگرن‌و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن فرێدەدەنە دەرەوە، نموونەیان لەم کارەدا وەکو نموونە، مرۆڤو گیانلەبەرانە، هاورێ لەگەڵ هەناسەدانی ڕووەکەکانیش پلەی گەرمیش بەرزدەبێتەوەو، هەروەها هەناسەدانەکە لەشەوو لەڕۆژدا بە ئاکام دەگات، بەڵام ئەوە هەیە لە ڕۆژدا ئەنجامی هەناسەدانەکە بە ئاشکرایی بەدیار ناکەوێت بە گوێرەی کرداری سازکردنی کاربۆنیی کە ڕووەك ئەنجامی دەدات، زۆر خێراترە لە کرداری هەناسەدان، بۆیە ئۆکسجین دەردەکات‌و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژێت.

هەر بۆیەشە وا باوە کە لە ڕۆژدا سەردانی باخچەکان بکرێت باشترە، نەك لە شەودا چونکە ڕووەکەکان لەو وەختەدا گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن فرێدەدەنە دەرەوەو.. گازی ئۆکسجین وەردەگرن.

توێژینەوەکان سەلماندوویانە کرداری سازکردنی کاربۆنیی بەتەنیا خۆی بەسە بۆ بەکار بردنی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کە وای کردووە زیندەوەرانی دیکەش دووەم ئوکسیدی کاربۆن دەربکەن.

هەوەکو چۆن تەنە مردووەکان لە شی بوونەوەیاندا دوودم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەکەن، بەهەمان

شێوە هەندێ كارلێكردنی دیكەش.

هەروەها كاری بەكاربردنی دووەم ئۆكسیدی كاربۆنو بەرهەمەكەی بەبێ چاودێریو نەخشە دارشتن لە لایەن خودای گەورەوە بەجێ نەهێڵدراوە، حیكمەتی خودای بەدیهێنەر وای خواستوە رێژەی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لە هەوادا بەبەردەوامی لە هەر دەهەزار بەشی هەوادا سێ هەتا چوار بەش بێ، ئەو رێژەیەش دەبێ بەبەردەوامیو هەمیشە بۆ ئاوەدان بوونەوەی جیهان جێگیربێت، هەرچەندی كرداری بەكار بردنو كرداری بەرهەم هێنان جیاوازی تێكەوت، ئەو رێژەیە جیاوازی تێناكەوێتو هەروەكو خۆی دەمێنێتەوە، جا ئایا هەموو ئەوانە دەبێ بەبێ نەخشە دارشتنێكو پلانێك یاخود چاودێری بەرێوەبردنێكو بەرێكەوت هەر لەخۆیەوە هاتبنە ئاراوە؟!!.




## خۆگونجاندنی رووەكان

مەبەست لەم ناونیشانەی سەرەوە خۆگونجاندنو پێكەوەژیانی رووەكە لە گەڵ ئەو ژینگەو دەوروبەرەی تێیدا دەژی..

بێگومان رووەك تاوا سازوئامادەكراوە لە گەڵ ژینگەكەی بسازێ، جگە لە خوداش كەس ئەو كارەی پێناكرێت، هەموو رووەكێك ژینگەكەی ناسراوە، لەگەڵ ئەوەی دیكە جیاوازیەكی جەوهەریان لە تەواوی كۆئەندامەكانیاندا هەیە بەشێوەیەك ئەوكەسە سەرسام دەكات كە لە موڵكو دەسەڵاتی خودای گەورە رادەمێنی.

## ڕووەکە بیابانیەکان



هەروەها بە ڕووەکە زیرو فیتیەکانیش ناو دەبرێن، سیفەتو شێوەو پێکهاتەی وان، ئەو توانایەیان پێدەبەخشن کەوا بەرگەی وشکانیو بایەکانو تیشکی ڕووناکی بەهێزو بەرزی پلەی گەرمیی بگرن، ئەمە سەبارەت بەرووەکەکانەوە.

بەلاّم هەرچی درەختەکانە یا درەختۆچکەکانی وەکو(سەنطو عەبلو نەبق)ە، ئەوانە ڕەقو زۆردرکاویو، لقەکانیان تێك ئالاّوە، ئەمەش بۆ ئەوەی هەندێکیان سێبەر لە هەندێکی دیکەیان بکەن، بەمەش شکلێکی گۆیی دروست دەکەن بۆ ئەوەی ببنە بەر بەست لە بەردەم ئەو برە تیشکە خۆرەی کە ڕێگەی چوونە ژوورە بەدی دەکەن، ئەو کاتە کونەکانیش لە توندیو هێزی بایەکان دەپارێزێنو ئارام دەبن.

هەروەها گەلاّی ئەو ڕووەکانە توێژی ئەستووری ئەو تۆیان هەیە کە، بەچینێکی پێکهاتوو لە ماددەیەکی هیشکی ئەستوور داپۆشراوە، هەندێ جاریش بەچینێکی مۆم ئاسا دادەپۆشرێو قەدو ڕەگەکانیشی بەهەمان شێوە، ئەوانیش بە فلین دادەپۆشرێن وەکو ڕووەکەکانی((ودنەو نەجیلات))..

لە هەندێکی دیکەیاندا قەدو گەلاّکان بە موچکەی چڕ دادەپۆشرێن کە لە سەرە تایانەوە پڕدەبن لە هەوا، ئەوکاتە ڕەنگێکی بریسکەدار دەبەخشنە ئەو ڕووەکانە کە تیشکی خۆر دەشکێتەوە بەمەش ڕێگە لە کرداری هەڵمین دەگرێت یاخود کەمی دەکاتەوە هەروەکو لە ڕووەکی(تەقتیق)دا بەدی دەکرێت.

هەروەها گەلاّکانیان بەشێوەیەکی ستوونی لوول دەخۆنەوە، بۆ ئەوەی تیشکی خۆریان نەکەوێتە سەر، هەر وەکو لەرووەکی (کافور)دا بەدی دەکرێت.

پەلکۆکەکانی ئەم ڕووەکە لەبەر کەمی ژمارەی کونیلەکانیو تەسكو تروسکیان بەیەکەوە

دەنووسێن، بە چینێکی مۆمی دادەپۆشرێن، بەمەش کرداری هەڵمین بەیەکجاری دەوەستێت، ڕووەکەکەش لەباری ئارامیدا دەمێنێتەوە هەتا وەرزی باران بارین دەگەڕێتەوە، وەکو لە ڕووەکی (ئەللەسف)دا بەدی دەکرێت..

هەروەها وادەبێ کە کونیلەکان لەرووی ژێرەوەی گەڵاکە قووڵ دەبن، تاك تاك بن یاخود کۆمەڵ کۆمەڵ لەبۆشاییەکدا وەکوو لە(فولله)دا بەدی دەکرێ.

یاخود پاسەوانەخانەکان خۆیان بە سەر کونیلەکان شۆڕدەکەنەوە کە لە کەش‌و هەوای گەرم دووریان دەخەنەوە.

ئەو ڕووەکانە بایبەتمەندگەلێکیان هەنە، وایان لێدەکەن بتوانن ئاو بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، ئەوەتا قەبارەی ڕەگەکانیان بوڕادەیەك گەورەیە بەناو خاکدا پەرت‌و بڵاو دەبن‌و پەل دەهاوێژن‌و بۆماوەی دوور تیایدا قووڵ دەبنەوە بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بەشێکی گەورە بکەن کە لێیەوە ئاو هەڵدەمژن.

هەروەها ئەو ڕووەکانە پێکهاتەگەلی تایبەت بە گڵدانەوەی ئاویان هەیە، بۆ ئەوەی لەکاتی نالەباریدا بەکاری بهێنن، ئەو گڵدانەوەیەش لە بەشەکانی زەمینی ئەو ڕووەکە دەبێت وەکو ڕووەکەپیازی‌و کورمان‌و دەرنەکان، یاخود لە ناو قەدەکانەوە دەبێت وەکوو لە هەنجیری درکداردا بەدی دەکرێت..یاخود لەناوگەڵاکانەوە دەبێت وەکوو لە ڕووەکی سەبباردا بەدی دەکرێت.. جا پاك‌و بێ گەردی بۆ خودای زاناو توانادار..!

لەبەڵگەو نیشانەکانی خودای گەورە ئەوەیە ئەم ڕووەکانە ئەگەرچی ژمارەیان کەمە، بەبەردەوامیش لە ژێر هەرەشەی گیانلەبەر دان، بەڵام چەند خۆ گونجاندنێکیان پێ بەخشراوە بۆ ئەوەی خۆیان لە زیان بپارێزن.

لەوانە:داپۆشرانی گەڵاو قەدی ئەو ڕووەکانەو بەروبومەکانیان بە درك‌و داڵ وەکو لە ڕووەکی(خەشیر)دا هەیە.

یاخود لایەکانی وەکوو درك تیژ دەبن وەکوو ڕووەکی (سیلا).. یاخود بەکورکی ڕەق دادەپۆشرێن ڕووەکی (حەداقە)..

یانیش زەیت گەلێکیان لێ دەپرژێت‌و بەهەوادا بڵاودەبێتەوە بۆ ئەوەی گیانلەبەران لێیان بە دوورکەونەوە.

## ڕووەکە ئاوییەکان:



هەندێك جۆری ڕووەکی ئاویی لەناو ئاودا دەژین، لەرووی پێکهاتنی ناوەوە، شێوەی دەرەوەیان لە ڕووەکەکانی دیکە جیاوازدەبنەوە، چونکە ئەم ڕووەکانە ڕەگەکانیان بۆ مژینی ئاو بەکارناهێنن، بەڵکو لە گشت بەشەکانی لە شیانەوە ئاو دەمژن، هەروەها قەدەکانیان دەگۆڕێن و شێوەیەکی گۆڕاو وەردەگرن.

## * ڕووەکە پیا هەڵگەڕەکان:



هەندێك جۆری ڕووەکی دیکە هەن قەدەکانیان لاوازو بێ هێزە، ناتوانن بۆ خۆیان لە سەر قەدەکانیان بوەستن، جا لە دانایی بەدیهێنەردا ئەوەیە ئامراز پیاهەڵگەرانی بۆ فەراهەم هێناوەن، یارمەتی خۆ ئاڵاندنیان بەو ستون و دیوارانە دەدەن کە پیاهەڵدەگەڕێن، وەکو ڕووەکە خۆ هەڵواسەکانی ترێ و بەزالیا، یا وەکو دڕکەکان لەهەندێك جۆری گوڵدا، یانیش وەکو ڕەگە ستوونیەکان کە پێیانەوە هەڵدەگەڕێن وەکو لە ڕووەکی (حبل المساكين)دا بەدی دەکرێت.

## * ڕووەکە زیندەوەر خۆرەکان:

لە بەڵگەو نیشانەکانی دروستکراوەکانی خودای گەورە کە تواناو دەسەڵاتی جوانکاری خودای گەورە نیشان دەدەن، ڕووەکە مێروو خۆرو زیندەوەرخۆرەکانن..

جا ئەو ڕووەكانە لە زەوییەكدا گەشەدەكەن كە ماددەی ئەندامیی كەم تێدایە، هەربۆیەشە دەبینین توانای ڕاوكردنی زیندەوەرەكانو مژینی لاشەكانیانیان پێ بەخشراوە..

سەیریشە كە هەر جۆرێكیان لەگەڵ خۆراكەكەی خۆی گونجاوە بە شێوەیەكی ئەوتۆ كە مرۆڤ سەرسام دەكات:

* لە ڕووەكی (دیونیا)دا دەبینین گەڵاكانی دوو دەروازەیان هەیە لەسەر بنكی ناوەراستدا دەجوڵێنەوە، هەروەها هەریەكەیان لەسەر رووكاری سەرەوەی زیادە دڕكێكیان پێ بەخشراوە..

ئینجا ئەگەر زیندەوەرێك كەوتە سەر ڕووەكەكە، هەردوو دەروازەكە هەستی پێ دەكەنو لەناكاودا دادەخێرێن بۆ ئەوەی زیندەوەرەكە لە نێوخۆیاندا بپارێزن، پاشان ڕووەكەكە ئەنزیم دەردەدات زیندەوەرەكان هەرس دەكەنو دەیانتوێننەوە، ئینجا ڕووەكەكە زیندەوەرە تواوەكە دەمژێت، لە دوای ئەوە گەڵاكە دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی خۆی، هەردوو دەروازەكەی خۆی واڵا دەكاتەوە، وەكو ئامادە باشییەك بۆ ڕاوكردنی نێچیرێكی دیكە.

* بەڵام لە ڕووەكی (ئەنیسز)دا، گەڵاكانی گۆڕاون بۆ شكڵی گۆزەیەك لە پەردەیەك پێكهاتووە لە حاڵی بچووكی گەڵایەكەدا داخراو دەبێ، پاشان لە دوای گەشەكردنی تەواوی گەڵاكەیدا لە ناكاودا پەردەكە دەبێتەوە، گۆز لینجی كەش بەشلەیەكی لینجی ترشەڵۆكی پڕدەبێت لەو ڕژێنانە دەردەدرێن كە لە سەر رووكاری ناوەوەی بەدی دەكرێن بۆ كێش كردنی زیندەوەرەكان، ئەگەر لە سەر ڕۆخی وەستان، ئەوكاتە لەسەر رووە لووسەكەی هەڵدەخلیسێن، مووچكە وردەكان بۆ بنی گۆزەكە ڕایان دەكێشنە خوارەوە، كاتێكیش دەكەونە نێو شلەی گۆزەكەوە، پەردەكە دادەخرێت بۆ ئەوەی ڕێ لە هەڵاتنو خۆ دەربازكردنیان بگرێت، ڕووەكەكە چەند ئەنزیمێك بۆ هەرس كردنی زیندەوەرەكە دەردەداتو پاشان دەیمژێت.

* هەروەها لە ڕووەكی (دروسیرا) گەڵاكانی ئەم ڕووەكە بە گەندەپێی زۆر داپۆشراوە لایەكیان بە چەند ڕژێنێك كۆتایی دێت كە ماددەیەكی لینجی ترش دەردەدەن، جا ئەگەر زیندەوەرەكان بە سەر ئەو گەندە پێیانەوە هەڵنیشتن ئەوا پێیانەوە دەئالێن، هەرچەندی هەوڵی ڕاكردن بدەن ئەوا زیاتر بەگەندە پێی دیكەوە دەئالێنو گیردەخۆن، هەتا ئەو گەندە پێیانە بە دەوریاندا كۆدەبنەوە..

پاشان ئەم ڕووەكە ماددەی هەرسێنەر دەردەدات لاشەی زیندەوەرەكە دەتوێنێتەوە، لە دوای مژینیشدا گەندە پێیەكان دەگەڕێنەوە دۆخی ئاسایی خۆیان، هەروەها گەڵایەكەش دەگەڕێتەوە شێوەی

ردەمنی خۆی..

باشە كێ ڕێنوێنی ئەو ڕووەكانەی كرد بۆ ڕێگەی ڕاوكردنی ئەو زیندەوەرانە، ئەی كوڕی شیرینم كێ فێری كردن چۆن نێچیر ڕاو بكەن؟

بێگومان ئەوكەسە خودای بەدیهێنەری هەمووشتەكانە..

**﴿هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾لقمان:١١.**

**واتە: (ئا ئەمەیە دروست كراوانی خوا، وەرن نیشانم بدەن بزانم ئەوانی تر جگە لەو زاتە، چیان دروست كردووە، نەخێر هیچیان دروست نەكردووە، بەڵكو ستەمكاران هەمیشە لە گومراییەكی ئاشكرادان).**

# ڕووەك چۆن پارێزگاری لەجۆری خۆی دەكات

یەكێك لە بەڵگەو نیشانەكانی خودای گەورە ئەوەیە ڕووەك دەتوانێت پارێزگاری لە جۆری خۆی بكات، بەرو بوومەكان كە دەفرگەلێكی خۆراكین بۆ پاراستنی تۆوەكان، شتێكیان پێ بەخشراوە یارمەتیان دەدەن بە چەندین فاكتەر لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە بڵاو ببنەوە.

تۆوی ڕووەكە بیابانیەكان با هەڵیان دەگرێت، قەبارەیان بچووكو لووسن، تاكو گواستنەوەیان بە هەوادا ئاسان بێت وەكو ڕووەكی (خەشخاش‌و، مەسوور) هەروەها مووچكەیان لەسەر دەڕۆیت، بۆ ئەوەی كێشیان سووك بێت وەكو ڕووەكی (كللدیبا)، یا وەكو باڵی باڵندە وەكو لەڕووەكی (جەكارندو ترشۆكە).

ئەوانە بەڵگەو نیشانە ڕوونو ئاشكراكان بوون، كە شتە سەیرەكانی ژیانی بە ڕووەك بەخشیوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لە نێو نزیكەی نیو ملۆن پۆڵو جۆری ڕووەكدا ژیانی خۆی بپارێزێت، پێكهاتەكانی، زۆربوونی، ژیانی‌و تەمەنو ژینگەی لەوانی دیكە جیاوازە.

ڕوودك هەیە تەمەنی چەند ڕۆژێكە، هەیانە چەند ساڵێكە، هەشیانە تەمەنیان چەند ئەوەندەی مرۆڤە..

ئەوەتا درەختی(سەروەی سونا) بەرزیەكەی (١٢٠) پێ دەبێ، ئەستووریەكەش(٢٤)پێ دەبێت، تەمەنی چل ساڵان پێش لە دایك بوونی مەسیحە(سەلامی خوای لێ بێ)، هەتا ئێستاش هەرماوە.

دارێك لەشاری (برابورن) لە ویلایەتی (کنت) هەیە تەمەنی مەزەندە دەکرێت بە(٣٠٠٠) ساڵ.

بێگومان تەمەنی درەخت ئەندازەی بۆ دانراوە، لەوانەشە درێژترین تەمەنی درەختیش ئەوانە بن کە لە جۆری (تەکسۆدیۆم)ن، کە شەش هەزار ساڵ دەژین.

بەڵام هەرچی مێژووی هەبوونی رووەکە لەسەر رووی زەوی، لە راپۆرتێکی زانستیدا لە سەرەتاکانی شوباتی ساڵی(١٩٦٥ز)دا هاتووە کە رووەکناس((رۆبەرتسۆن)) لە کارەکانی رووپێوکردنی بۆشایی ئاسمان کە کۆمپانیای ((هنتنج)) بۆ زەویەکانی ئوردنی ئەنجامدا، پارچەیەکی لە لقێکی بەردینی درەختێکی کۆنی لە زەویەکانی (لیوای باشور)دا دۆزیەوە، دوا بەدوای شیکردنەوەی لە کارگە زانستیەکانی پاریسدا، بۆی ئاشکرا بوو کە تەمەنی ئەو درەختە(١١٥) ملیۆن ساڵە.

هەروەها لەمەوە زاناکان دەستیان بە بایەخدان بەو دیاردەیەکرد رۆشنایی گەلێك دەخەنە سەر ئەندازەی تەمەنی جیاوازی نێوان هەریەکەیان.. لە رووەك‌و گیانلەبەرو..مرۆڤەکان.. پاك‌و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی کە بەر لە هەبوونی بوونەوەر بوونی هەبووە!!

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ{٧} إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ{٨}﴾الشعراء:٧-٨ .

**واتە:(ئایا سەرنجی زەویان نەداوەو لێی ورد نەبوونەوە، چەندەها جووت گژوگیاو رووەکی بەنرخی هەمەجۆری تێدا رواندووە* بەراستی ئالەوەدا بەڵگەو نیشانەی (بەهێز هەیە لە سەر دەستەڵاتی خوای پەروەردگار) کەچی زۆربەیان باوەڕدار نەبوون).**

## لە پێشدا میوە:

*** لەقورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (الواقعة)دا خودای گەورە میوەی پێش گۆشت خستووە،** هەروەکوو دەفەرموێت:﴿ وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ{٢٠} وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ{٢١} ﴾الشعراء: ٢٠-٢١. واتە:**(میوشیان بۆ دەگێرن، بە ئارەزووی خۆیان لێی هەڵدە بژێرن* گۆشتی هەر باڵندەیەکیش کە حەزی لێ بکەن بۆیان ئامادەیە).**

هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا لە سورەتی (الطور)دا دەفەرموێت:﴿ وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾الطور:٢٢.

**واتە:(بەردەوام حەزیان لە هەر میوەو گۆشتێك بێت پێشکەشیان دەکەین).**

هەروەها پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێت: ((اذا افطر احدکم فلیفطر علی تمر فانه برکة)) رواه



حمد والترمذي.واتە: (ئەگەر یەکێ لەنێوە ڕۆژووی خۆی شکاند، با بە خورما بیشکێنێ چونکە خورما پیتو فەڕە).

کوڕی شیرینم بزانە خواردنی میوە پێش ژەمی خواردن لە ڕووی تەندروستی یەوە سوودێکی باشی هەیە، ئەمەش لە بەر ئەوەی میوە شەکرە سادەکانی تێدایە هەرسکردنیان ئاسانەو مژینیان خێرایە، جا ڕیخۆڵەکان ئەو شەکرانە بە ماوەیەکی کورت، کە بەچەند خولەکێك مەزەندە دەکرێت، هەڵدەمژنو بەهۆیەوە لەشی مرۆڤ تێردەبێ، نیشانەکانی برسێتیو کەمیی شەکر لە لەشدا لادەچن، لە کاتێکدا ئەو کەسەی یەکسەر گەدەی خۆی لە خواردنی جۆراوجۆر پڕدەکات ئەوا پێویستی بە نزیکەی سێ کاتژمێر دەبێت هەتا ڕیخۆڵەکانی ئەو شەکرەی کە لە ناوخۆراکەکەیدا هەیە هەڵیمژن، نیشانەکانی برسێتی بۆ ماوەیەکی درێژتر لای دەمێنێتەوە.

هەروەها بزانەکە شەکرە سادەکان لە گەڵ ئەوەی هەرسکردنو مژینیان ئاسانە، سەرچاوەیەکی بنەڕەتی وزەشن بۆ خانە جیاوازەکانی لەش.

ئەو خانانەی بە خێرایی سوود لە شەکرە سادەکان وەردەگرن، بریتین لە دیواری ڕیخۆڵەکانو مەمیلە ڕیخۆڵەییەکان بەوەی کاتێك ئەو شەکرانەی لە ناو میوەکەدا هەیە پێیان دەگات خێرا چالاك دەبنو ئامادە دەبن بۆ ڕاپەراندنی ئەرکەکانیان لە هەڵمژینی خواردنە جیاوازو هەمەجۆرەکانو ئەوەی کەسەکە لە دوای میوەکە دەیخوات بەرێكو پێك ترین شێوە.

لەوانەیە حیکمەت لە پێشخستنی میوە بەسەر گۆشتدا لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دا هەر ئەمەبێ.

# خـەنـە



لە ئەبو هـورەیرەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) ریوایـــەت كـــراوە دەڵـــێ: پێغەمبـــەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((ان الیهـود والنـصاری لایـصبغون فخالفوهم))رواه البخاري.

واتە:(جوولەكەو نەصرانیەكان سـەرو قـژیان بۆیە ناكەن، جا ئێوە بە پێچەوانەی ئەوان بكـەن، واتە سەرو قژتان بۆیە بكەن)..

لە ئەبو ئومامەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) چـاوی بەچـەند بەسـالاً چووێكی ئەنسار كەوت كە ریشیان سـپی ببـوو ئینجـا فـەرمووی: (یامعـشر الانـصار حمـروا وصـفروا وخالفوا اهل الكتاب)رواه احمد بسند حسن.

واتە: (هۆ كۆمەڵی ئەنسـار، ریشتان سوورو زەرد كەنو پێچەوانەی خاوەن كتێبەكان بكەن).

هەروەها لە جابیرەوە (خوا لێی ڕازی بێـت) دەڵـێ: لـەرۆژی ئـازادكردنی شـاری مەككـەدا ئـەبو قوحافەی باوكی ئەبوبەكریان هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ) سـەروقژی وەكـو كلـووی بـەفر سـپی بـوو، پێغەمبەر خوا (ﷺ)فەرمووی (غیّروا هذابشيء واجتنبوا السواد) (رواه مـسلم) واتـە : (ئـەو رەنگـە بەرەنگێكی دیكە بگۆڕنو خۆتان لەرەنگی رەش بەدوور بگرن).

هەروەها لەئەنەسەوە (خوالێی رازی بێ) دەڵێ: (اختضب ابو بكر بالحناء والكتم، واختـضب عمـر بالحناء بحتا، اي صرفا) رواه مسلم.

واتە: (ئەبو بەكر قژو ریشی خۆی بە خەنەو كەتەم (كەتەم رووەكێكە لە (یەمەن)دا لە بۆیەكردنیدا ڕەنگێكی ڕەشی مەیلەو سۆر دەدا) بۆیە دەكردو، عومەریش تەنیا بەخەنە)

لە ئەبوزەڕەوە(خوا لێی رازی بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كە دەفەرموێت: (ان احسن مـا غیرتم به الشیب الحناء والكتم)رواه اصحاب السنن، وهو حدیث حسن.

واتە: (بێگومان باشترین شت كە ڕەنگی سپێتی قژوریشتانی پێ بگۆڕن خەنەو كەتەمە).

هەروەها لە سـەلمای داكی ڕافیعەوە (خوا لێی رازی بێت) دەڵـێ: پێگومـان هەركەسـێك شـەكوای

ئێش‌و ئازارێكى كە لەسەریدا هەبووبێ لە لاى پێغەمبەر (ﷺ)ى كردبێ ئەوا هەرپێى فەرمووە: (احتجم) واتە كە لە شاخ بگرە، هەركەسێكیش شەكواى ئێش‌و ئازارێكى لە قاچەكانى هەبووبێ لەلاى پێغەمبەرى كردبێ (ص) ئەوا هەرپێى فەرمووە (اختضب)واتە خەناوى بكە، رواه ابو داود و رواه ایضا البخاري في تاريخه وهو حديث حسن.

هەر لەو ئافرەتە ریوایەت كراوە كە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەر برینێكى تووش بووبێ‌و هەر دڕكێكى لە شوێنێكى لەشى ڕاچووبێ ئەوا هەر خەنەى لەسەر داناون) رواه الترمذي باسناد حسن، ورواه ابو داود وابن ماجه وقال الهيتمي: رجاله ثقات.

لەعوسمانى كوڕى وەهەبەوە(خوا لێى رازى بێت) دەڵێ: (چوومە لاى ئوموسەلەمەى دایكى ئیمانداران، ئەویش چەند تاڵەموویێكى لەقژى پێغەمبەر (ﷺ) پێ پیشان داین كە خەناوى بوون) رواه البخاري.

هەروەها ئیمامى ئەوەوى دەڵێ: لەمەزهەبى ئێمەدا بۆیە كردنى ڕەنگى سپێتى قژو ڕیشى پیاو بە ڕەنگى زەرد یاخود سوور خۆشویستراوە، ڕاست وایە كە ڕەنگ كردنیان بە بۆیەى ڕەش حەرامە، هەندێكیش دەڵێن مەكروهە، هەندێكیش لە زاناكان تەنیا بۆ جیهادكردن لەگەڵ كافران ڕێیان پێداوە.



## ڕووەكى خەنە:

درختێكى بچووكە لە گرووپى خەنەییەكانە، ڕووەكێكى ساڵانەیە یاخود تەمەندارە، نزیكەى سێ ساڵان دەمێنێتەوەو تەمەنى بۆ دە ساڵان درێژ دەبێتەوە، درەختێكى هەمیشە سەوزەو گەڵاكانى ناوەڕێت‌و لق‌و پۆپى فرە زۆرە، درێژییەكەى دەگاتە سێ مەتر..

گەڵاكانى سادەو هێلكەییینەو درێژیان(٣-٤)سەنتیمەترە، ڕەنگیان سوورێكى كاڵە یاخود سپییەكى زەردباوە.

دوو جۆرى هەیە كە لە ڕەنگى گوڵەكانیاندا

جیاوازن، جۆرێکیان ڕەنگی گوڵەکانی سپییەو جۆرەکەی دیکەیان ڕەنگی گوڵەکانی وەنەوشەییە.
هەروەها دوو جۆریان لیّ باس کردووە: سوورو ڕەش، زۆربەی جاریش هەردوو جۆرەکە تێکەڵاو دەکەن..

شوێنی سەرەکی بۆ چاندنی خەنە باشوری خۆرئاوای ئاسیایە، پێویستی بەژینگەیەکی گەرم هەیە، بۆیە بەشێوەیەکی چڕوپڕ لە ناوچەکانی هێڵی یەکسانی کێشوەری ئەفەریقیا دەڕوێن.
هەروەها چاندنی ئەم درەختە لە وڵاتانی حەوزی دەریای ناوەڕاستدا بڵاوبۆتەوەو گرنگترین وڵاتی بەرهەم هێنی ئەم درەختە میسرو سودانو هیندو چینە.
خەنە هەر لە کۆنەوە ناسراوە، فیرعەونەکان بۆ مەبەستو مەرامی جیاوزدا بەکاریان هێناوە، لەهاڕاوەی گەڵاکانی هەویریان دروست کردووە بۆ دەستەکانو بۆیەکردنی قژو چارەسەرکردنی برینو، هەروەها بۆنیان لە گوڵەکانی دەرهێناوە.
هەروەها خەنە جۆرە پیرۆزیەکی لە لای زۆرینەی موسڵمانەکاندا هەیە، کە لە بەر سیفەتە نایابەکانی بۆ جوانکاریو ئارایش کردن بەکاری دەهێنن.
هەروەها بە هەویرەکەی دەستو پێو قژیان بۆیە دەکەن، هەروکوو ناو گۆڕی مردووەکانیان پێ سواخ دەدەن.
لەپێستە خۆش کردنو خوری ڕەنگ کردن بەکاری دەهێنن، بەوەش جیادەکرێتەوە کە بۆیەکەی دەمێنێتەوە. هەروەها دانیشتوانی ئەوروپاو ئەمەریکا لە بۆیەکردنی قژدا بەکاری دەهێنن، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە زیانی پێ ناگەێنێت، پێستی سەریش بەهێز دەکات..
ئەمەش زۆر گرنگە چونکە بۆیە کیمیاویەکانی دیکە ىقژ زۆرجاران دەبنە هۆی نەخۆشی هەوکردنو چەندین جۆری نەخۆشی هەستیاری، هەندێ جاریش دەبێتە هۆی بە دیارکەوتنی نیشانەکانی تەنگەنەفەسی.

## بەکارهێنانەکانی لەرووی پزیشکیەوە:

خەنە لە لای پزیشکە موسلمانەکانمان شوێنێکی دیاری هەبوو، ئەوەتا ئیبنولقەیم(ڕەحمەتی خوای لیّ بی) باسی خەنەی کردووە دەڵێ بۆ سوتانی لەش سوودی هەیە.
ئەگەر لە دەم وەردرا سوودی بۆ برینەکانو پفکەکانی دەمو زمان دەبێت، هەروەها دەبێتەهۆی چاك بوونەوەیان..

هەروەها لە هەتوان كردندا سوودی بۆ وەرەمە هەو كردووەكان هەیە.. ئەگەر وەكو هەویریش لە نینۆكەكانی دەستو پێ بدرێت ئەوا سوودی بۆیان دەبێو رێك و پێكیان دەكات.

هەروەها مووی سەر دەروێنێتەوەو بەهێزی دەكات هەروەها سوودی بۆ ئەو بلۆقو زیپكانە هەیە كە لە هەر دوو باسكو سەرتاپای لەش بە دیاردەكەون. هەروەها سوودی بۆ وەرەمەكان هەیەو ئێشو ئازاریان دادەمركێنێتەوە..

بێگومان زۆربەی سەلەف خەنەیان بەكار دەهێنا. هەروەها هەندێكیان باسیان كردووە: خەنە سوودی هەیە بۆ میزكردنو وردكردنی بەردی گورچیلەو لە باربردنی كۆرپەلە.

سوودی بۆ چارە سەركردنی كەرووی نێوان پەنجەكان هەیە، ئەمەش لە بەر ئەوەی هەوێنە كەرووەكان دەبنە هۆی ئاسان لاچوونی چینی رووكاری پێستو خەنەكەش پێستەكە وشك دەكاتو توندو تۆڵی دەكاتو ناهێڵێ بۆگەن بێ كە ئەمە زاڵ بوونی هەوێنو كەرووەكان قەدەغە دەكاتو كار بۆ خێرا چاك بوونەوەی برینە رووكاریەكانو یەكدی گرتنەوەی برینەكان دەكات.

هەروەها دانانی هەویری خەنە لە سەر پێستی سەر بۆ ماوەیەكی درێژ، ئەوا دەبێتە هۆی خاوێن كردنەوەی پێستی سەر لە میكرۆبو مشەخۆرەكانو هەرەوەها پاك كردنەوەی لە دەردانی رۆنو چەوریە زیادەكان..

هەروەها سوودی بۆ چارە سەركردنی تۆشكەی سەر هەیەو هەروەها كار بۆ كەمكردنەوەی دەردانی ئارەقە دەكات لە لایەن ئەو كەسانەی زۆر ئارەقە دەكەن.

ئامۆژگاری دەكرێ بۆ ئەوكەسەی كە دەیەوێ هەویری خەنە لە سەر بنێ، خەلو لیمۆش لە گەڵ تێكەڵ بكات.

جێی داخیشە توێژینەوەكان لە بارەی سوودەكانی خەنە هێشتا هەژارن، خۆزگە دەخوازین كە توێژەرەكان لە لێكۆڵینەوەكانیندا هەقی خۆی پێ بدەن، هەتا یەكێ لە موعجیزەكانی پێغەمبەر(ﷺ) بێتە جێ لەوەی خەنە وەكو دەرمانو جوانكاریو ئارایش كردن سوود دەگەیەنێ..

## ئاشكرا كردنی فرو فێڵ كردن لە خەنەدا:

بۆ زیاد كردنی كێشی خەنە فروفێڵی تێدا دەكرێ، بەوەی گڵی نەرمو خاوێنی لە گەڵ تێكەڵ دەكرێت لە كاتی ئامادە كردنی، ئەمەش ئاشكرا كردنی ئاسانە چونكە خۆڵو گڵ قورساییەكی جۆریی گەورەیان هەیە، بەم شێوەیەش بڕێكی دیاری كراو لە خەنە كێشی كەم ترە لە هەمان بڕی ئەوخەنەیەی

كە فیێلی لە گەڵدا كراوە.

هەروەكو چۆن ئەگەر بە ئاستەم فوویێكی پێدا بكەی خەنەكە بە هەوادا بڵاودەبێتەوەو گڵەكەش دەمێنێتەوە، هەروەها ئەگەر بڕێكی كەمی لەناو ئاو دابنرێ دەبێتە هۆی نیشتنەوەی خۆڵەكەو خەنە پاك‌و بێگەردەكەش بە سەر ئاوەكە دەكەوێت.. هەروەها خەنە بەوەش فیێڵی لەگەڵ دەكرێ بۆیەی سەوزی لە گەڵ تێكەڵ دەكەن بۆ ئەوەی ڕەنگە زەردەكەی داپۆشن، خوداش زاناو دانا ترە.

## مـــۆز



مۆز بەكێكە لەو بەروبوومانەی كە خودای گەورە بۆ بەندە ئیماندارەكانی ئامادە كردووە.

پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ{٢٧} فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ{٢٨} وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ{٢٩} وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ{٣٠}﴾الواقعة:٢٧-٣٠.

ڕاڤەكەرانی قورئان دەڵێن (وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ) مۆزە، خەڵكی یەمەنیش بە مۆز دەڵێن (طَلْح)وە(الْمَنضُود) واتە هەندێكیان چوونەتە پاڵ هەندێكیان‌و بەیەكەوە كۆبوونەتەوە.

عەرەبەكان بەرهەمەكانی درەختی مۆزیان بە پەنجەكانی دەست (الاصابع البنان) دەچواند. جا كاتێك چاندنی ئەم درەختە گوازرایەوە ئیسپانیاو لە وێشەوە بۆ ئەوروپا ناویان نا (Banana)كە درەختێكی گیاییە درێژییەكەی(٣-٤)مەترە..

كورە شیرینەكەم دوو هەزار ساڵ زیاترە مرۆڤ ئەم میوە ناسیوە. باوەڕیش وایە كە نیشتمانەكەی نیمچە دوورگەی هیندی بێ، دەشڵێن مەلایۆیە، لەوێوە بۆ وڵاتانی فارس‌و ئەفەریقیا گوازرایەوە، هەر لەوێوە پرتوگالیەكان بۆ زۆر وڵاتانی جیهانی گواستیانەوە.

هەروەها باوەڕیش وایە كەوا چینییەكان هەر لە كۆنەوە پوختەی ڕەگەكانی مۆزیان وەكوو دەرمانێك بۆ چارەسەركردنی سووریژە سەر ئێشەو زەردوویی (هەوكردنی جگەر) بەكاریان هێناوە.

هەروەکو چۆن حەکیمە هیندیەکان پشتیان پێ دەبەست.

(بلینی) رووەکناس لە بارەی مۆزەوە دەڵێ خواردنی فەیلەسوفەکانە..

ئەگەر مۆز وەکو میوەیەکی نایاب لە زۆربەی وڵاتانی جیهان ناوی دەرکردووە، ئەوا سەربارەت بە هەندێك وڵات بە خۆراکی سەرەکی دادەنرێت، وەکو لە دوورگەکانی(ئینتیل‌و فلیپین‌و کەنارەکانی ئەمریکای ناوەڕاست‌و ناەڕاستی ئەفەریقیا) دا بە دی دەکرێت. پایەی مۆز لەلای ئەوان وەکوو پایەی گەنمە لە لای ئێمە. هەر چەندە مۆز وەکو میوەیەك بەخاوی دەخورێت، بەڵام بێگومان دەتوانرێت بکوڵێندرێت‌و جۆرەها مورەبای لێ درووست بکرێت.

هەروەها چۆن لە مۆزی وشکراوو ئارد دروست دەکرێت، ئاردەکەشی لە رووی کیمیاوییەوە نزیکە لە ئاردی برنج.

لە فەرەنسا لە ئاردی مۆز جۆرەنانێك دروست دەکرێت کە لە گەڵ شەکردا دەشێلرێت‌و بە بۆنی خۆشیش بۆندار دەکرێت‌و، خەڵکەکەش وەکوو توێشوو لە گەشتەکانیاندا کەڵکی لێوەردەگرن.

هەروەها مۆز دەوڵەمەندە بە ئاوەکانی کاربۆن کە ووزەو پلەی گەرمیی بە لەش دەبەخشن. مۆزی نەگەیشتوو لە نیشاستە پێك دێت، بۆیە ئەو جۆرە مۆزە هەرس کردنی گرانەو شیرینیشی کەمە.

مۆز هەر چەندی پێ‌بگات بەشێکی زیاتر لە نیشاستەکەی دەگۆڕێت بۆ شەکر بەمەش هەرس کردنی ئاسان دەبێت‌و تامیشی خۆش دەبێت.

هەروەها بەرزی رێژەی شەکرەکان لە هیچ میوەیەکی دیکەدا بەدی ناکرێ، بەڵام لەمۆزدا ٢٤٪ی کێشەکەی پێك دێنێت. بەڵام هەرچی پاشماوەی ئەو ماددانەی کە دەچنە ناو پێکهاتەی (٧٠٪-٧٨٪)ی ئاوەو (٣٤,٠٪-١,٢٪)ی پرۆتینەو(٤,٠٪-٩,٠٪)ی چەوریەکانەو (٥و٠ ٪-١٪)ی ریشاڵە سلیلۆزیەکانە. هەروەها نیشاستەو تفتیشی تێدایە.

رۆڵەی شیرینم بزانە کە هەر (١٠٠گم)ێك لە مۆزدا ئەوەندەی (١٠٠گم) لەگۆشت کالۆری دەدات، سەرەڕای ئەوەش رۆڵی لە پتەوکردنی شانەکان‌و نوێ کردنەوەیان هەیە، لە بەرئەوەی ڤیتامینەکان‌و خۆێیە کانزاییەکانی تێدایە.

هەروەها مۆز رێژەیەکی باشی لە ڤیتامین(C) لە خۆ دەگرێت، بۆیە دژی کلۆربوونی ددانەکانەو پارێزەرێکی باشیشە لە نە خۆشییە پەتاکان‌و هەروەها فاکتەرێکی بەهێزو دژی ماندوو بوون‌و شەکەتیە

کۆمەڵە ڤیتامینێکی(B) تێدایە، بەتایبەتیش (B1،B2، B6، B12 ).

لەبەر ئەمە سوود بەخشە بۆ هەوكردنی هەستەدەمارەكانو كەم خوێنیو گرژبوونی ماسولكەكان، باداری (رۆماتیزم).

هەروەها رێژەیەكی بەرزی لە ڤیتامین (A) تێدایە، لە (١٠٠گم)دا (٣٠٠) یەكەی نێو دەوڵەتی تێدایە كە یارمەتی گەشەكردن دەداتو بینایش بەهێز دەكات.

هەرچی (خوێیە كانزاییەكانە) بە برێكی پێویست لە نێو مۆزدا بەدی دەكرێن كە زۆرینەی پێویستیەكانی توخمە گرنگەكان بە لەش دەبەخشێت. هەروەها دەوڵەمەندیشە بە (پۆتاسیۆم)كە(٤٠ملغم/١٠٠گم)ی تێدایە.

هەروەها مۆز سۆدیۆمی كەم تێدایەو خاڵیە لە كولسترۆڵ بۆیە بۆ دابەزاندنی فشاری خوێنی بەرزو كەم كردنی ئەركی گورچیلە سوودی لێ وەردەگیرێت هەروەها بۆ پارێزگاری كردن لەرەق بوونی خوێن بەرەكان بەكاردێت .

رێژەیەكی باشی لە كالیسیۆمو ئاسنو مسو فۆسفۆری تێدایە كە بە خوێی زیرەك بوون ناو دەبرێت كە یارمەتی ئەوانە دەدات كە بەكاری زەینیو هزریەوە سەرقاڵن.

هەروەها ماددەی (فلۆر)ی تێدایە كە ددانەكان لە كلۆر بوون دەپارێزێت. بە لەخۆگرتنی ماددەی (بەكتین)یش یارمەتی قەڵاچۆكردنی دەدات.

دكتۆر(لابیە)ی سەرۆكی تاقیگەی پزیشكی لە پاریس دەڵێ: ((بێگومان بەهای خۆراكی لە مۆزدا بەرزە، سكچوون مۆزیكی پێگەیشتوو بە قەدەر هەمان بڕی گۆشت سوودی تێدایە..

بەڵام ئەو مۆزەی زۆر باش پێگەیشتوە دوو هێندەی ئەو سوودی تێدایە، هەروەها مۆز ئەگەرچی بە خۆراكێكی نایاب دادەنرێت بەڵام هەڵەیە ئەگەر بە خۆراكێكی تەواو دابنرێت، كەواتە دەبێ خۆراكی دیكە لە گەڵ مۆزدا بخورێن كە چەوریان تێدابێ، بۆ نموونە شیر بە تەواوكەری مۆز دەدەنرێت..))

ئەمەو هەروەها مۆز بە خۆراكێكو چارەسەرێك دادەنرێت بۆ ئەو كەسانەی لە بەر ماندوو بوونو لەش داهێزران دەناڵێننو هەروەها بۆ توش بووان بە نەخۆشیەكانی دڵ یاخود گورچیلەو جگەر، بەڵكو خۆراكێكی نموونەییە بۆ ئەوانە.

بەڵام بۆ ئەوكەسانەی تووشی نەخۆشی شەكرە هاتوونە ئەوا مۆز بۆیان گونجاو نییە لە بەرئەوەی دەوڵەمەندە بە ماددە شەكریەكان.

بێگومان مۆز بە تەواوی هەرس ناكرێو سوودی لێ وەرناگیرێ تەنیا بە دوو مەرج نەبێ ئەوانیش:

دەبێ بەتەواوەتی پێگەیشتبێ‌و، بە باشیش بجوورێت.

بەوەش ئاگاداری مەترسیەکانو خراپی هەرس کردنی ببین، ئەگەر مۆزەکە کرچو کاڵ بوو، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی گەدەیان لاوازە، یاخود کۆئەندامی هەرس کردنیان ساغ نییە.

هەروەها دەتوانین بەروبوومی مۆز بهارین یاخود وەکو هەویر بیشێلین بۆ ئەوەی پێشکەشی ئەو جۆرە کەسانەو منداڵی بچووکی بەباشی سوودی لێ وەربگرن.

هەروەها مۆزی پێگەیشتوو چارەسەرێکی باشە بۆ تووش بووان بە بەدهەرسی توند، بەتایبەتی لای منداڵان..

هەروەها چارەسەرێکی باشیشە بۆ توشبووان بە نەخۆشی هەوکردنی ریخۆڵە ئەستوورە (قۆڵۆن)، نەخۆشییە هەرسییە درێژخایەنەکانو، نەخۆشی(زەرب-spure) کەهەتا ئێستاش هۆیەکانی تووشبوون بەو نەخۆشییە شاراوەیە، دەبێتە هۆی لەش داهێزرانی تەواوو هەرەس هێنانی لەش.. جامۆز بەیارمەتی خوا باشترین چارەسەرە بۆ ئەم جۆرە نەخۆشیە. چونکە سەرجەم توخمە کاراو پێویستەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیە کوشندەیەی تێدایە.

هەروەها مۆز ماددە تفتی تێدایە ڕێ لە ڕوودانی ترشانەکانی ریخۆڵەکان دەگرێت، وە ئەو ماددە تفتانە بە چارەسەرکردنێکی تەواو دادەنرێن بۆ ترشانی ریشاڵەکانو گۆڕانی خۆراکی لە نەخۆشی تێچوونی هەرسی درێژ خایەن، چونکە ئەو ماددانە ترشیەکان هاوسەنگ دەکەنو هەروەها چلەی نفتێتی یەدەگ لەنێو خوێندا بەرز دەکەنەوە، هەروەها تفتێتی مۆز بۆ چارەسەرکردنی نیشو ئازارەکانی برینی گەدە سوودی لێ وەردەگیرێت.

هەروەها (ئۆلگا کریج)(Olga Craig) لەوتارێکی بەناونیشانی( Banana a day keeps ulcers at away) واتە: (خواردنی یەك مۆز ڕۆژانە، پزیشکت لێ دوور دەخاتەوە) لە ڕۆژنامەی (today)بەریتانیایی لە{٧ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٩١}دا لە گۆڤارێکی پزیشکی ئوسترالیەوە چەند توێژینەوەیەکی گواستۆتەوە، کە ڕایان گەیاندووە ڕۆژانە خواردنی تەنیا یەك مۆز بەتەواوی ڕێ لە دروست بوونی برینی گەدە دەگرێت، خواردنیشی لە پێش ژەمی خواردندا برینی گەدە چاك دەکاتەوە.

کوری شیرینم راپۆرتەکان باس لەوە دەکەن بە خواردنی مۆزێکی هاڕدراو لە گەڵ شیردا، دەبێتە هۆی چاك بوونەوە لە ئازاری برینی گەدەو سوتانەوەی گەدە.

هەروەها پرۆفیسۆر(Barin Hills) نووسەری توێژینەوەکە جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە مۆز توێژێکی پارێزەر بۆ گەدە بریندارەکان دەگەڕێنێتەوە، لای کەسێکی ساغدا بەدی دەکرێت. هەروەك چۆن

(شیللا كێسەنجەر)یش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، كە ئافرەتە دووگیانەكان لە چەند مانگێكی كۆتایی سك پڕیدا زۆر جاران بەدەست سوتانەوەی گەدە كە هەندێ هێڵنج هاتنیشی لە گەڵدایە دەناڵێنن، ئەزموونەكان سەلماندوویانە كەوا مۆز چارەسەرێكی تەواوە بۆ ئەو دیاردەیە لە لایەن ئافرەتە دووگیانەكان.

هەروەها مۆز لە بەر سووكی هەڵگرتنی‌و هەروەها لە بەر ئەوەی (شەكری میوە)و(زیادەتفتی)و (ڤیتامینەكان)ی تێدایەو بەهاوبەشی لەگەڵ شیردا بە خۆراكێكی نایاب دادەنرێت بۆ گەڕانەوە سەر دۆخی جاران لە ماوەی چاك بوونەوە لە نەخۆشییە توندو تایەكان، لە كەم خۆراكی‌و بۆ دووگیانەكان‌و شیرپێدەری منداڵەكان‌و هەروەها بۆ وەرزشوانی‌و كرێكاری پیشە گرانەكان‌و بەساڵاچووەكان، بەتایبەتیش بۆ ئەوكەسانەی كە لەبەر ئارەزوو نەكردنی خواردن دەناڵێنن.

توێژینەوە نوێیەكان سەلماندوویانە لەمۆزدا هۆرمۆنی وا بەدی دەكرێن، كە وزەبەخشی زۆرن ئەركیان رێكخستنی كۆ ئەندامی هەستە دەمارەكانە.

هەروەها خواردنی مۆز بەشێوەیەكی بەرنامەدار هاوسەنگی دەروونی دەبەخشێتە منداڵ‌و هەروەها گیانی حەز بەشت كردن‌و خۆشیان لە نێواندا بلاو دەكاتەوە. خوداش زاناو داناترە.

لە كۆتاییدا كورە شیرینەكەم بەكورتی سوودە پزیشكییەكانی مۆزت بۆ باس دەكەم:

١- دژی پیربوونە. ٢- وزە بە لەش دەبەخشێت .٣- ڤیتامینەكان (B،A) بە لەش دەبەخشێت. ٤- دەوڵەمەندە بەخوێیە كانزاكان ٥- یارمەتی دابەزینی فشاری خوێن دەدات. ٦- یاریدەی گەشە كردنی مێشك دەدات. ٧- یاریدەی چارەسەرە كردنی برینی گەدەو دەدات.



## كوولەكە

* لە ئەنەسەوە (خوا لێی رازی بێ) دەڵێ: بەرگ دروویێك پێغەمبەر (ﷺ)ی بۆ خوانێك بانگهێشت كرد، منیش لە گەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆ ئەو خوانە چووم، ئەوە بوو نانێك‌و قاپە شلەیەكی لە بەردەم پێغەمبەر(ﷺ) دانا كە پارچە كوولەكەو گۆشتی تێدا بوو، جا دیتم

پێغەمبەر(ﷺ) بە دوای پارچە كولەكەكان لە دەوروبەری قاپەكەدا دەگەڕا، ئەنەس دەڵێ: من هەر لەو ڕۆژەوە هەتا ئیستاش كولەكەم خۆش دەوێت{صحیح البخاری}.

ئەو فەرموودە پیرۆزە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كولەكەی پێ خۆش بووە، پێغەمبەریش(ﷺ) هەر شتێكی خۆش ویستبێ ئەوا نهێنییەكی مەزنی هەر تێدابووە هەروەكو چۆن یەكێ لە پسپۆڕەكان دەڵێ.. دەبێ كولەكە چی تێدا بێ؟!

لە كتێبی ناوداری{پێكهاتەی خواردەمەنیەكان}دا هاتووە:

ڕێژەی ئاو لەناو كولەكەدا(٩٤,٧٪)ەو بڕێكی كەمیشی شەكرو ریشاڵەكانی تێدایە، هەروەها (١٠٠گم) لەكولەكەتەنیا(٦٥) كالۆری دەدات، كەوا بێ خۆراكێكی باشە بۆ ئەوكەسانەی كە دەیانەوێت لە كێشی زیاد خۆیان ڕزگار بكەن، هەروەها لە مادەی سۆدیۆم زۆر هەژارە، كەواتە تووشبووان بە نەخۆشی بەرزی فشاری خوێن دەگونجێت، هەروەها دەوڵەمەندە بەو پۆتاسیۆمەی كە ئەوكەسانەی حەبی ئاسان میزكردن دەخۆن دەبێ هەیانبێ.

هەروەها كالیسیۆمو مەگنیسیۆمو فۆسفۆرۆ ئاسنو كبریتو كلۆر)یشی تێدایە.

دەوڵەمەندە بە ڤیتامینەكان لە سەرووی هەمووشیانەوە ڤیتامین (A).

كولەكە بەخۆراكێكی تەڕ بەڵكو دەوڵەمەند دادەنرێت، ئاوەكەی بۆ تاداران بەسوودە، ئەگەر بشخورێتەوە یاخود دەمو چاوی پێشۆردرا ئەوا تینوێتی ناهێڵێتو سەر ئێشەش لا دەدات، هەروەها هەرچۆنێك بەكار بهێنرێت سك نەرمو شل دەكاتەوە (بۆقەبزی باشە)، وە نەرمترین خۆراكو خێراترینیانە لە رووی كارلێكردنەوە.

بەڵگەی نوێ هەن ئاماژە دەكەنو كولەكە بۆ خۆپاراستن لە شێرپەنجە بەسوودە.. گۆڤاری توێژینەوەكانی بیۆكیمیاوی لە ساڵی (١٩٨٥ز)دا توێژینەوەیەكی بڵاو كردەوە لە پەیمانگای نیشتمانی بۆ شێرپەنجە لە ویلایەتەكانی ئەمەریكا ئەنجام درابوو، ئەو توێژینەوەیە ئاماژەی بەوە داوە كولەكە پارێزەرە لە شێرپەنجەی سییەكان لە لای دانیشتوانی(نیو جیرسی) لە ویلایەتەكانی ئەمەریكا. خوداش زاناو دانا ترە.

# بەڵگەو نیشانەكانى خوداى گەورە لە گیانلەبەراندا



خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾الانعام:٣٨ .

واتە: (هیچ زیندەوەرو گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕواتو هیچ باڵندەیەك بەباڵەكانى بفڕێتو ئەوانیش ئوممەتو گەلێك نەبن وەك ئێوە، هیچ شتێك نییە پشت گوێمان خستبێت لەو كتێبەدا لەوەو دوا هەموو ئەوانە كۆدەكرێنەوە بۆ لاى پەروەردگاریان)

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ هود:٦

واتە: (هیچ زیندەوەرێك نییە لەم زەویەدا رزقو رۆزیەكەى لە سەر خوا نەبێتو ئاگادارە بە شوێنى حەوانەوەو شوێنى دەرچوونیان، هەموو شتێك تۆمارە لە دۆسیەى روونكەرەوە (اللوح

المحفوظ)).

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾النور:٤٥ .

**واتە: (هەروەها خوا هەموو زیندەوەرێكی لە ئاوێكی تایبەت دورست كردووە، جا هەیانە لە سەر سكی دەڕوات، هەیە لە سەر دووقاچ دەڕوات، هەیە لەسەر چوار پێ دەڕوات، خوا هەرچی بوێت دروستی دەكات، بەڕاستی خوا دەسەلاتی بە سەر هەموو شتێكدا هەیە).**

گیانلەبەران بە پەرتووكێكی كراوە دادەنرین بۆ گشت ئەوانەی دەیانەوێت لە سەیروسەمەرەكانی ژیان لە گیانەوەرزانیدا بكۆڵنەوە. زاناكان ژمارەی گیانلەبەران بە زیاتر لە دووملیۆن پۆل مەزەندە دەكەن، سەرەڕای ئەوەش هەتا ئیستا تەنیا بەشێكی بچووكیان لێ دیراسە كراوە، ئەنجامی توێژینەوەی ئەو بەشە بچووكەش چۆك دادانو دان نان بووە بە هەبوونی ئەو خوایەی كەهەموو شتێكی بە دیهێناوە بە جوانیو رێكو پێكو تێرو تەواوی دروستی كردووە.

## كۆئەندامی هەرس لە گیانلە بەردا




ئەو شوێنانەی گیانلەبەرانی تێدا بەدی دەكرێن هەمە جۆرن، كۆئەندامەكانی لەشیشیان زۆر لەیەكتر جیاوازن بە شێوەیەك لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تیایدا دەژینو ئەو خۆراكەی بۆیان دەستەبەركراوە بسازین، دەم كە یەكەم قۆناغە لە قۆناغەكانی هەرسكردن، بە نەخشەیەكی ئەوەندە جوانو رێكوپێك رێكخراون كە بەزمانی حاڵ، مەزنێتی بەدیهێنەرەكەیان دەردەبڕن.

## گیانلەبەرە دڕندەکان



دەمی شێرو پڵنگ، گورگو کەمتیارە، هەروەها تەواوی ئەو گیانلەبەرە دڕندانەی لە دەشتو دەردا دەژین، خۆراکیان تەنیا کردنە نێچیرو ڕاوکردنی گیانەوەردکانە کە دەبێ پەلاماریان بدەنو بە سەریاندا زاڵ بن، کەڵبە بڕندەو ددان گەلی ڕەقو تیژیان پێ بەخشراوە.

لەبەر ئەوەی لە هێرش بردنو پەلاماردانەکەیاندا دەبێ ماسولکە بەهێزەکانیان بەکاربهێنن کە بە نینۆكو چرنووکی تیژ چەکدارکراون، هەروەها گەدەکانیان ترشیاتو ئەنزیم گەلی ئەو تۆ دەگرنە خۆیان کە گۆشتو ئێسقان هەرسدەکەن.

## گیانلەبەرە کاوێژکارەکان



هەندێ لەگیانلەبەر لە سەر لەوەڕەکان دەژینو، مرۆڤ چاودێریان دەکات، خۆراکێکیان بۆ دەستەبەر دەکات بنچینەکەیان ڕووەكو گیاوگۆڵە.

ئەو گیانلەبەرانەش بریتین لە مانگاو گامێشو مەڕو بزنو هی دیکەش. نەخشەی کۆئەندامەکانی هەرسکردنیان بە شێوەیەك کێشراوە لەگەڵ ژینگەکەیان دەسازێت، ئەوەتا دەمەکانیان تارادەیەك فراوانە، کەڵبە بەهێزو ددانی تیژو ڕەقیان تێدا بەدی ناکرێن، لە بری ئەمانەشدا ئەو ددانانە بەدی دەکرێن کە بەوە

جیادەکرێنەوە، کەوا کرۆژەرو برِندەن، چونکە ئەوگیانلەبەرانە بە خێرایی گیاوگۆڵو رووەکەکان دەخۆنو هەر بەهەمان شێوەش بەیەك جار قووتیان دەدەن، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەرکی خزمەتەکانیان لەپێناویدا بەدیهێنراون بۆ ئادەمیزادی جێبەجێ بکەن.

هەروەها چاودێری بە دیهێنەرانەی خودای پەروەردگار سەر سورِهێنەرترین کۆئەندامەکانی هەرسکردنی بۆ ئەو پۆلە گیانلەبەرەی بەدی هێناوە، ئەو خواردنەی کە دەیخۆن دادەبەزێتە ناوورگ کە کۆگایەکە بۆیان، ئینجا کاتێك کاری گیانلەبەرکە کۆتایی هاتو بۆ پشوودان دانیشت،خواردنەکە دەچێتە ناو هەناوێك کە پێی دگوترێت(قلنسوە) پاشان دەگەرِێتەوە ناو دەم، ئینجا دووبارە زۆرجوان کاوێژی دەکاتەوە، ئینجا دەچێتە ناو هەناوی سێیەم کە بە (ئوم لتەلافیف) ناودەبرێ، پاشان دەچێتە هەناوی چوارەمەوە کە بە (الانفحە) ناو دەبرێ، هەموو ئەو کردارە درێژخایانەش بۆ پارێزگاری کردنی گیانلەبەرەکە ئامادەکراوە، چونکە ئەو گیانلەبەرانە زۆرجاران لە لەوەرِگاکان دەبنە ئامانجی هێرشو پەلاماری گیانلەبەرە درِندەکان، جاپێوستە لە سەریان بەخێرایی خۆراکی خۆیان دەستە بەربکەنو خۆیان بشارنەوە..

زانستیش دەڵێ: بێگومان کرداری کاوێژکردنی گیانلەبەران کارێکی پێویستە بەڵکو زیندەگیشە، چونکە گژوگیا لەو رووەکانەن کە هەرسکردنیان گرانە، ئەمەش لە بەرئەوەی ماددەی سلیلۆزی تێدایە کە سەرجەم خانە رووەکییەکان دادەپۆشێت، بۆ هەرسکردنیان گیانلەبەرەکە پێویستی بە کاتێکی دوورو درێژ هەیە، جا ئەگەر ئەو گیانلەبەرە کاوێژ نەکاتو کۆگایەکی تایبەتیش لەناو گەدەیدا نەبێت ئەوا کاتێکی زۆری لە لەوەرگاکەدا کە دەیکردە رۆژێکی تەواو بەفیرۆ دەدا، بەبێ ئەوەی گیانلەبەرەکە خۆراکی پێویستی خۆی بە دەست بهێنێ، ماسولکەکانیشی لە کرداری خواردنو جویندا ماندوو دەبوون، بەڵام کارەکە بە پێچەوانەوی ئەمەیە چونکە لەوێدا بەخێرایی خواردنەکە دەخورێو، پاشان ئەمباردەکرێو لە دوای ترشانی دووبارە دەگەرِێنرێتەوە بۆ ئەوەی کاوێژ بکرێتو بهارِدرێتو قووت بدرێتەوە..

تەواوی مەرامەکانی ئەو ئاژەڵە لەکارو خۆراكو جوان هەرسکردندا جێبەجێ دەبێت. جاپاكو بێگەردی هەر بۆ خوای هەڵسورێنەری بوونەوەرە.

# باڵندەو پەلەوەرە ماڵییەكان



جیاوازییەكی گەورە لەنێوان كۆئەندامی هەرسی باڵندەكانو ئاژەڵەكاندا هەیە، وردەكاری دروست كراوی خودای بەدیهێنەر دەسەلمێنێ.

لەسەری هەر باڵندە یەكدا بەشێكی رەقی خاڵی لە ددان درێژ دەبێتەوە، كە لە ئێسقان پێكهاتووە ئەویش ئەو دەنووكەیە كە لە بری دەمو دوولێوو ددانەكانی لای گیانلەبەرەكانی دیكە بۆ خۆراكی بەكاری دەهێنێ.. چونكە باڵندە خۆراكی خۆی بەبێ جووین قووت دەدات. دەنووكی باڵندەكان بەپێی هەمە جۆری خۆراكیان لە یەكتر جاوازن..

باڵندە گۆشت خۆرەكانی وەكو كوندەبۆو هەڵۆ، خاوەنی دەنووكێكی بەهێزو تیژن لە سەر شێوەی قولاب بۆ ئەوەی گوشتی پێ بپچرێنن. قازو مراوی، پانە وەكو سەوڵ بۆ گەڕان بەناو قوڕاو هەروەها لە سەر تەنیشتی دەنووك زیادەی بچووك هەنە كە وەكوو ددان وان یارمەتیان دەدەن بۆ پچرینو كرتاندنی گژوگیا.

بەڵام هەرچی مریشكو كۆترو باڵندەكانی دیكەی كە دانە وێڵە لە زەویدا هەڵدەگرنەوە، ئەوا دەنووكەكانیان كورتو نووك تیژن كە لەگەڵ ئەو كارەیاندا دەسازێت، لەكاتێكدا دەنووكی باڵندەی (بجع) بە شێوەیەكی بەرچاودرێژە، لە ژێرەوەیدا توورەگەیەكی گەورەی پێدا درێژ بۆتەوە كە لە كوندە دەچێ بۆ ئەوەی وەكوو تۆڕی ڕاوچیانی لێ بێ، چونكە خۆراكی سەرەكی ماسییە..

هەرچی دەندووكی پەپۆسلێمانەیە درێژو نووك تیژە، بە شێوەیەكی وردەكارانە ئامادەكراوە بۆ گەڕان بەدوای مێروو كرمەكان زۆربەی جاران لە ژێر خاكدا بەدی دەكرێن.

زانستیش دەڵێ: ئادەمیزاد دەتوانێت بە تەماشاكردنێكی سەرپێیی بۆ دەندووكی هەر باڵندەیەك

خۆراكەكەی بناسێت.

بەڵام هەرچی كۆئەندامی هەرسی باڵندەیە مایەی سەر سوڕمانە، ئەگەرچی ددانی پێ نەبەخشراوە بەڵام چیكڵدانەیەكی بۆ دروستكراوە كە خواردن هەرس دەكاتو دەیهاڕێت.

هەروەها باڵندە ماددەی ڕەقو وردە بەرد قووت دەدا بۆ ئەوەی لە هەرسكردنی خواردنەكەدا یارمەتی چیكڵدانەكە بدات.

## ئێسكی گیانداران




بێگومان سەر سوڕهێنەرترین شت كە لە جیهانی گیانلەبەران دۆزرابێتەوە، ئەوەیە كە باڵندە قەبارەی لە هەرگیانلەبەرێكی دیكە بچووكترە، بەهۆی توێكاریشەوە روون بۆتەوە كە ئیسقانەكانی نەرمو نۆڵو ناوەوەیان كلۆرە، ئەمەش بۆ ئەوەی لەشیان سووك بێتو بەهۆیەوە بتوانێت بفرێت.

لەقووڵترینو وردترین توێژینەوەكاندا كە لەوێوە دەتوانین توانای خودای لە نەخشەسازیو بەدیهێناندا بەدی بكەین ئەوەیە كە لە قاچەكانی گیانلەبەرانەوە دەیبینین، كە تایبەتمەندن بە ڕۆیشتن، دەبینی قاچی ئەوگیانلەبەرانە بەهێزن بۆ ئەوەی لە ڕاكردنو خێرا ڕۆیشتن یارمەتیان بدەن، هەروەك چۆن هەر قاچێكیش بەچینێكی ڕەق كۆتایی دێت بۆ ئەوە پارێزگاری لە قاچەكە بكات لەوەی كە لە ئەنجامی زۆر ڕۆیشتندا تووشی دێت وەكو لە گوێدرێژو ھەسپ بەر چاو دەكەوێت.

بەڵام هەرچی چێڵو گامێشە، قاچەكانیان كورتو بەهێزنو، بە سمێكی ڕەقی كەلێندار كۆتاییان دێت، ئەمەش بۆ ئەوەی یارمەتیان بدەن لە زەویو زاری نەرمی كشتوكاڵی برۆن، لە كاتێكدا قاچەكانی وشتر بە سمێكی كەلێندارو لە ژێریشیەوە لبادەیەكی ئەستوور هەیە كە بە گۆڕەوی ناو دەبردرێ

کۆتاییان هاتووە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەهێڵێ قاچەکانی لە نێو قومی بیابانەکاندا نغرۆبن!.

هەروەها لەسەر قاچەکانو هەردوو ئەژنۆشیدا بەستەرێکی پێستی دڕ هەیە لەکاتی یخ بووندا لە وردە بەردو قومو چەوەکان دەیان پارێزێت.

قاچەکانی باڵندە گۆشت خۆرەکانیش. چەند چڕنووکێکی بەهێزی ڕەقیان هەیە کە چەماونەتەوە بۆ ئەوەی لە گرتنی نێچیردا یارمەتیان بدەن، هەروەکو لە بازو هەڵۆو کوندەبۆو باشووکەو هی دیکەدا بەدی دەکرێن.

بەڵام ئەو باڵندانەی کە دانەوێڵە خۆرن وەکو مریشكو کۆتر قاچەکانیان چەند نینۆکێکی تیژیان هەیە کە بۆ هەڵدڕینی زەوی بەکاردێنن.

هەروەها ئەو باڵندانەی کە خۆراکیان لەنێو ئاودایەو لەوێدا بەدوایدا دەگەڕێن، لە نێوان پەنجەکانیاندا پێستە پەردەیەك هەیە کە لە مەلەکردنیان ودکوو سەوڵ بەکاریان دەهێنن.

دیارترین بەڵگەش لە سەر خۆسازاندنی گیانلەبەران لە گەڵ ئەو ژینگەیەی کە تیایدا دەژین ئەوەیە، ئەو باڵندەیەی بارودۆخی خۆراکی ناچاری دەکات بۆ ماوەیەکی درێژ لە نێو ئاودا بمێنێتەوە دەبینین پەڕەکانی لە گەڵ ئەو بارەدا دەسازێت، بە شێوەیەك کە ناهێڵێت ئاو پێوەی بنوسێت، لەبەر ئەمە ئەو باڵندەیە نە هەست بە سەرمای ناو ئاو دەکاتو نە تەڕاتیش دەگاتە لەشی.

هەروەها یەکێکی دیکە لە دیارترین بەڵگەی خۆسازاندنی گیانلەبەر لەگەڵ ئەو ژینگەیەی کەتیایدا دەژی ئەوەیە کە لە (مار) زانراوە کە هەردوو شەویلگەکانی لە دواوە بەرەڵاًنو بە یەکەوە نەنوساون، ئەمەش بۆ ئەوەی دەمی بتوانێت بەگوێرەی قەبارەی نێچیرەکە فراوان بێت، با چەند هێندەی دەرچەی دەمیشی بێ، ئەمەش بۆ ئەوەی بەبێ ڕەچاوکردنی گەورەیی قەبارەکەی بێچیرەکە هەڵ لووشێ.

## قەلە ڕەشی نیوزیلاندە



بێگومان سەیروسەمەرەترین دەنووك کە مێژوو ناسانی سروشت دیتویانە، لە زۆرتر لە بابەتێك لە بابەتەکانی توێژینەوەکانیان باسیان کردووە، دەندووکی قەلە ڕەشی نیوزیلاندەیە، چونکە دەندووکی مێیەکانیان جیاوازیەکی گەورەی لەگەڵ دەندووکی نێرینەکانیاندا هەیە، دەندووکی نێرەکە ڕەقو بەهێزو

نەستوورە، بەڵام دەندووکی مێیەکە درێژو نووك تیژو چەماوەیە.

نێرەکە بە دەندووکە بەهێزەکەی لەودرختە دەدا کەتووشی کلۆریو کرمداری بووە هەتا دەگاتە ئەو شوێنەی کە کرمەکەی تێدایە، ئالەو کاتەدا مێیەکە دەندووکە درێژە چەماوەکەی دەباتە ناو درەختەکەوە، کرمەکەی پێ دەردەهێنێو بەیەکەوە دابەشی دەکەن!.

## ( یەعسوب )



یەعسوب زیندەوەرێکە شێوەی لە کوللە دەچێ، خۆراکی بریتییە لە مێشوولە. یەعسوبو مێشوولە مێروویکن بەوە ناسراون کە فڕینیان خێرایە، بێگومان یەعسوب دەمێکی نەوتۆی هەیە کە بە سەر سورهێنەر ترین دەم دادەنرێت لە سەر رووی زەمین، چونکە لە جومگەیەك پێکهاتووە دەتوانێت بۆ هەموو لایەك بیجولێنێت، بەو گونجانە سەرسوڕهێنەرە یەعسوب لەسەر کەناری زۆنگاوێك لە ناوەراستی گیاو گۆلەکان رادەوەستێ، لەنێوان ساتێكو ساتێکی دیکەو لەناکاوێدا بە خێرایی دەمی بەکراوەیی بۆ دواوەوەر دەسورێنێ ئەو کاتە هەموو ئەو مێشولانەی کە لەسەر گژوگیایەکەی دواوەیە دەیان قەپێنێتو دەیان خوات..!

## بــۆق



بێگومــان درێــژترین زمــانی گیانــەوەرێك بەشێوەیەکی رێــژەیی بریتییــە لــە زمــانی بــۆق، درێژییەکــەی دەگاتــە نیــوەی درێــژی لەشــی. بــەوە ئامادەو ساز کراوە کە مادەگەلێکی لینج بۆ راوکردنی مێشەکان لە سەر زمــانی دانــدراون، بــە پێــچەوانەی زمانی ئادەمیزاد زمانی بۆق لە پێشەوەی جێگیرەو لە

دواوە بەرەلاّیە، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانێت بیهاوێژێتو بیگەڕێنێتەوە.

جا بۆق ڕادەوەستێ هەتا مێشەكان لێی نزیك دەبنەوە، لە ئاكاودا زمانی درێژ دەكاتەوە بۆ ئەوەی ژمارەیەك لەو مێشانەی پێوە بنوسێت كە بۆی دەبنە خۆراكی بنەڕەتی.

لەهەمووش سەیرو سەمەرەتر ئەوەی لە بۆقدا تێبینی دەكرێت ئەوەیە، ملی نییە بەهۆیەوە دەتوانێت سەری بجولێنێت تاكو شتەكانی دەورو بەری خۆی ببینێت، بەلاّم لە بری ئەوەدا دوو چاوی دەرپۆقیوی پێبەخشراوە دەتوانێت بۆ هەموو لایەكی بجولێنێت.

## هەشت پێ



گیانەوەرێكە ماسولكەی نییە، بێ كەلبەو چرنووكیشە دەنووك یاخود ددانیشی نییە، سەرەرای ئەوەش هەركات لەنێچیرەكەی نزیك بێتەوە دەیباتە شوێنی شەكەت بوونو برستی لێ دەبرێت، ددكرێ خودی مرۆڤیش ببێتە نێچیری.

شێوەی هەشت پێ بەسە بۆ ئەوەی بەلگەو نیشانەی ئیعجازی بەدیهێنراوی خودای گەورە دا بنرێت، بریتییە لە بارستەگۆشتێكی لینج كە بڕوا ناكرێت ئەوە بوونەوەرێكی زیندووبێت، ئەگەر نێچیرێك لێی نزیك بێتەوە بە چاوتروكانێك بەهەشت زمانەوە ئەو بارستە گۆشتە دەبێتەوە كە هەر زمانەیەك دوو پۆلە دەم لە خۆیان دەگرن، لەناو هەر پۆلێكیشدا بیستو پێنج بۆریچكەی مژینی خوێنی تێدایە، كەواتە هەشت پێ دەبێتە خاوەنی چوارسەد بۆریچكە، پێنج لەپێیەكانی لە نێچیرەكە دەئالێنێو پێوەیان لول دەدات، بەوانەی دیكەش لەتاشە بەردەكانیان گیر دەكا، ئەمەش بۆ ئەوەی نێچیرەكەی بەتاشە بەردەكانەوە كۆتو بەند بكات، هەروەها بۆریچكە مژۆكەكانی ناو زمانەكانی لەنێو لەشی نێچیرەكەیدا نقوم دەكات)) تەنیا لەماوەی چەند چركەیەكی كەمدا ئەو هەشت پێیە خوێنی نێچیرەكەی هەلدەمژێتو پاشماوەكەش فرێدەدات. سەیریش لەوە دایە كە ئەو زمانانە لەبەر لینجیان ناتوانرێت ببردرێن، تاكو لەبەرامبەر هەرچەكێكدا سەلامەت بن.

# ماسی ڕاوكەر

لەنێو دەریای ولاَتانی خۆرهەلاَتی دووردا جۆرە ماسیەك بەدی دەكرێت، كەبەماسی ڕاوكەر ناودەبرێن، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو مێروانە دەژین كە بەئامێرێكی زۆر وردەكار ڕاویان دەكەن، لەمەلاَشوویاندا كەنالێكی قووڵ هەیە، ئەگەر دەمیان دابخەن ئاودەكە لەسەر شێوەی قڕتێكی بەرزەوە لێوەی دێتە دەردوە.. جا ئەگەر مێروو گەلێكی لەسەر ڕووەكێكی تەنیشت ڕووبارەكەوە بینی، ئەوا خێرا لەژێرەوەی تەوژمێكی ئاوەكەی بەسەریاندا دەبارێنێ، ئەودەمەش مێرووەكان بەردەبنەوە خوارەوە.

هەروەها لەڕووبارەكانی خۆرهەلاَتی دووردا جۆرە ماسیەكی دیكە دەژین، كە بە(ماسی پێداهەلگەڕاو) ناودەبرێن، چونكە لەنێو ئەو كەش و هەوایەی هێلی یەكسانیدا بەبێ ئاو دەژین، جاكاتێك ئاوی ئەو ڕووبارو كەنالاَنەی كە ئەو ماسیانەی تێدادەژین وشكیانكرد.. شوێنەكانی خۆیان بەرەو ئەو جێگایەی كە ئاوی لێ بەدی دەكرێ جێدەهێلن.. لەو كاتەدا پشت بەڕژێن گەلێك دەبەستن كە تەنیا لەو جۆرە ماسییانەدا بەدی دەكرێن كەشلەیەكی تەڕ دەردەدەنە دەرەوە بۆ ئەوەی كەوانە ڕیشوو دارەكانی بەتەڕی بمێننەوە هەتا ئەوكاتەی دەگەنە ئاو ئەو دەمەش كاری ئەو ڕژێنانە بەتاڵ دەبێتەوە.

ئەگەر ئاویان بەدی نەكرد ئەوا بەسەر درەختەكانەوە هەلدەگەڕێن تاكو لەسەر لوتكە تەڕوو شێدارەكانیان بژین.. تا لەو ساتە وەختەشدا ئەو ڕژێنانەی كە كەوانە ڕیشوودارەكانیان تەڕوو شێدار دەكرد، دەگۆڕێت بۆ كۆئەندامی هەناسەدانی وەكو ئەوەی لای مرۆڤ یا گیانلەبەرانی دیكە بەدی دەكرێن.

ئەو جۆرە ماسییانە تاكو ئێستاش بابەتی توێژینەوەی گیانلەبەرناسانە.. بەلگەو نیشانەن لەسەرهەبوونی بەدی هێنەری پاك و بێگەرد، ئەو خوایەی كە ئەو ماسیە بچوكانەی لەژێر چاودێری ڕەحمەتی خۆی داناو و ژیانیان لەنێو دەریا.. یا لەسەر وشكایدا دەپارێزێت.

# كۆئەندامی هەناسەدان لە گیانلەبەراندا




كۆئەندامی هەناسەدان لەگیانلەبەراندا بەهەمان شێوە ئەوەندەی كۆئەندامی هەرس لە یەكتر جیاوازن، ئەمەش بۆ ئەوەی لەگەڵ ژینگەی بژێویاندا بگونجێت.

ئەو گیانلەبەرانەی كە لە سەر زەوی دەژین، خاوەنی سییێكن كە لە كاركردنیاندا لە سییەكانی ئادەمیزاد دەچن، هەروەها لە هەموو ئەوانەش كە پێویستن بۆ كرداری ئاڵوگۆڕی گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن كە بە هەناسە دانەوە دەردەچێ، گازی ئۆكسیجین كە بە هەناسە وەرگرتن لە دەرچەكانی لووتو قورگو بۆری هەوایی بەرێوە دەچن.

بەڵام هەرچی گیانەوەری (برمائي)، ئەوانەی كە لە سەر ووشكایی‌و لە نێو ئاودا دەژین، ئەوكاتەی كە لە سەر وشكایی دەژین بە سییەكانیان هەناسە دەدەن، ئەوكاتەشی كە لە نێو ئاودا دەژین وەكو ماسییەكان كەوانە ریشۆكان بۆ هەناسەدان بەكار دەهێنن، ئەو كۆئەندامەی كە بەشێوەیەكی زۆر توانادار دروست كراوە ئۆكسجین لە ئاودا دەپاڵێوێ.

لە كۆئەندامە سەر سورهێنەرەكان ئەوەیە كە لە هەندێ كرمدا بەدی دەكرێن، كە ناگونجێ سییەكان یاخود كەوانە ریشۆیان هەبێ، بۆیە دەبینی چەند بۆڕیەكی كراوە لە سەر لەشی ئەوكرمانەدا هەن بۆ هەناسە دانیان.

شتێكی جوانیشە ئەوەی كەزانست دوویاتی دەكاتەوەكە زۆربەی

گیاندارە مەمكدارەكان بەوەجیادكرێنەوە هەستی بۆنكردنیان بەهێزو تیژە، هەستی بینینیان لاوازە، بەپێچەوانەی باڵندە كە بینینیان بەهێزەو بۆن كردنیان لاوازە، ئەمەش لە بەر ئەوەیە كە ئەوەی یەكەم لە رێگەی هەستی بۆن كردنیانەوە رێگەی خۆراكیان دەدۆزنەوە، كە هەمیشە لە سەر زەوی

دەبێ، بەڵام باڵندەكان كە لە ئاسماندا دەفڕن پێویستیان بە بینینێكی بەهێزو تیژ هەیە بۆ ئەوەی لە شوێنی زۆر بەرزەوە خۆراكی خۆیان بەدی بكەن. خوداش زاناترە.

# سەرسورهێنەرەكانی گیانلەبەران

## كوڕی شیرینم بزانە:

* باڵندەكان غەریزەی گەڕانەوە بەرەو نیشتمانی خۆیان تێدا هەیە، ئەگەر وشەی غەریزە ڕاست بێ- بەڵكو ئەمە نەخشەیەكی خواییە- كوڕە شیرینەكەم ئەو چۆلەكەیەی كە لە وەرزی بەهاردا هێلانەی لە سەر دەرگەی ماڵەكەت كردووە لە وەرزی پایزدا بەرەو باشوور كۆچ دەكات، بەڵام لە بەهاری داهاتوودا دەگەڕێتەوە هەمان هێلانەی پێشووی!

* لەمانگی سێپتێمبەر (ئەیلول)دا زۆربەی ڕەوە باڵندەكانی ئێمە بەرەو باشوور كۆچ دەكەن، لە گەشتەكەیاندا نزیكەی هەزار میلێك بە سەر پانتایی دەریاكاندا دەبڕن، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ڕێگەیان ون ناكەنو تەنانەت میلێكیش چیە لێی لانادەن!.

* كۆتری نامەبەر ئەگەر ماوەیەكی دوورو درێژ لە نێوان قەفەسەكەیدا كۆچی پێكراو بۆ شوێنێكی دووربردرا، پاشان بەرەڵا بكرێ ئەوا بە بێ ئەوەی ڕێگەی لێ ون بێ دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی.

* هەنگ هەرچەند ڕەشەبا گژوگیاو درەختی هێنابێتە سەر شانەكەی، شانەكەی خۆی دەدۆزێتەوە.

* ڕۆڵەی شیرینم ئەگەر ئەسپە بەساڵا چووەكەت لە شوێنێكدا بە تەنیا جێبهێڵی شەویش بێ دەگەڕێتەوە ماڵەوە، هەرچەندی شەویش تاریكو ڕەش بێ ڕێگەی خۆی دەگرێتەبەرو لێی لانادات. هەر چۆنێك بێ دەتوانی ببینێ ئەگەر بە ناڕوونیش بێ، بەڵام بە هەردوو چاوەكانی سەرنجی جیاوازی پلەی گەرمی دەداتو لە ڕێگەدا تیشكی ژێر سوور تۆزێك كار لە چاوەكانی دەكات.

*كوندە پەپۆ دەتوانێ لە سەر گژوگیایەكی سارد مشكی گەرمو نەرم هەرچەندی شەویش تاریك بێ ببینێ.

* گوێچكە ماسی ئاسایی، چەند چاوێكی هەیە كەزۆر لە چاوەكانی ئێمە دەكەن، دەبریسكێنەوە، چونكە هەرچاوێكی هاوێنەگەلێكی بچووك بچووكی تێدایە ناهێنەژماردن، دەڵێن ئەو هاوێنانە یارمەتی دەدەن كە شتەكان لەلای ڕاستەوە بۆ سەرەوە ببینێو ئەو جۆرە هاوێنانە لە چاوی

ئادەمیزاددا بەدی ناکرێ. ئایا دەبێ ئەو هاوێنانە بۆ ئەو گوێچکە ماسییە دانراون، لە بەر ئەوەبێ کە هێزی زەینی وەکو ئادەمیزادی لادەست ناکەوێت؟

* بێگومان هەنگ وەکو ئێمە دەبینین گوڵە گەشاوەکان بۆ لای خۆیان ڕای ناکێشن، بەڵکو ئەو بەتیشکی سەرووی وەنەوشەییەوە دەیانبینێ، کە لە بەر چاوی جوانتریان دەکات.

* هەنگەکارەکەرەکان شانەی قەبارە جیاواز لەناو ئەودارە دروست دەکەن کە لە بە خێو کردندا بەکاری دەهێنن.

چەند ژوورێکی بچووکیش بۆ کارەکەرە نێرەکان ئامادە دەکرێن، گەورەترین ژوور بۆ نێرەکانی هەنگ دادەنرێت، ژوورێکی تایبەتیش بۆ شاژنە ئاوسەکان دادەنرێت..

* سەگ چونکە لوتێکی هەستیاری پێدراوە، دەتوانێت هەست بەو گیانلەبەرە بکات کە بەلایەوە تێپەر دەبێت..

* سەرجەم گیانلەبەرەکان ئەو دەنگانە دەبیستن کەوا زۆربەیان دەکەونە دەرەوەی بازنەی ئەو شەپۆڵەلەراوانەی کە تایبەتن بە ئێمەوە، ئەمەش بەوردەکاریەکی ئەو تۆ کە زۆر لە سەرەوەی هەستی بیستنی سنورداری ئێمەودیە..

زانراویشە گیانلەبەران لەو شوێنە ڕادەکەن کە خەریکە ماوەیەکی دیکە بورکان یاخود بوومە لەرزەی لێ ڕوویدات، چونکە ئەو گیانلەبەرانە دەنگ دەبیستن کە ئادەمیزاد نایانبیستێ، ئەو دەنگانە تایبەتن بە سەرەتای دەست پێکردنی بورکان واتە بەر لە وەی ڕوویدا.

*جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکی ناوی هەیە لە داوەکانی تۆڕی هێلانەیەك بۆ خۆی لە سەر شێوەی باڵۆنێك دروست دەکاتو بەشتێك لە ژێرەوەی ئاو هەڵی دەواسێت، پاشان بە شێوەیەکی شارەزایانە بلقێکی هەوا بە موویێکی ژێرەوەی لەشییە دەکات، هەڵی دەگرێت بۆ ناو ئاوەکە، پاشان لە ژێر هێلانەکەیدا بەرەڵای دەکات، پاشان ئەم کارە چەند جارێك دوو بارە دەکاتەوە هەتا هێلانەکەی هەڵدەئاوسێ، لەو کاتەشدا بێچووەکانی لە دایك دەبنو بەبێ مەترسی لە هەڵکردنی با لەسەری بەخێویان دەکات. ئەوەتا ئێمە ئەو ڕێگە چنینکاریە دەبینین لەگەڵ ئەو ئەندازەکاریو پێکهێنانو مەلەکردنی هەوایی کە تیایدا بەکار دێت، جا ئایا ئەوە هەمووی ڕێکەوتەو لەخۆیەوە دروست؟! بووە؟!

* جۆرێك لە ماسی هەیە بە سەلەمۆن ناودەبرێت، ساڵانێك لە ژیانیدا لەنێو دەریاکاندا بەسەر دەبات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ڕووبارە تایبەتیەکەی خۆی کە لێوەی لە دایك بووە، ئەو لە شوێنێك لە دایك

دەبێتو لە شوێنێكی دیكە دا دەژیو، لە هەمان شوێنی لە دایك بوونیشی دوای ئەوەی كە گەراكانی دادەنیٚ دەمرێت، بەم شێوەیەش نەوەیەكی دیكە لە دایك دەبن كە دەربارەی باوانیانەوە هیچ شتێك نازانن‌و هیچ شتێكیشیان لیٚ فێرنەبووینە، پاشان لەڕووبارەكە بەرەو دەریاكە كۆچ دەكەن‌و لەوێدا ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن، پاشان دەگەرێنەوە ئەو شوێنەو گەراكانیان دادەنێن‌و پاشان دەمرن.. لەكۆچكردنەكەشیان لە دەریاوە بۆ رووبارەكە كەناری ئەو رووبارە دەگەرنەبەركە رووباری بچووكی لیٚ جیادەبێتەوە یاخود ئەوەی روباری بچووكی تیٚ دەرژێتو بەكەنارەكەی دیكەدا نارۆن.

بێگومان ماسی سەلەمۆن كە لە ناو رووبارەكە مەلە دەكات رێگەی بەرەوژوور دەگرێتەبەر واتە بە پێچەوانەی رەوتی رووبارەكە دەڕوات، ئەگەر رێگەی گواستراوە بۆ رووبارێكی دیكەی جگە لەو رووبارەی كە تیایدا لە دایك بووە، دەرك بەوە دەكات كە ئەوە نەخشەی ئەو نییەو بۆیە رێگەی بەرەو شوێنە راستەقینەكەی خۆی ددگرێتەبەر.

دەبیٚ چ شتیٚ وا لە ماسی سەلەمۆن بكات بەو وردەكارییە بەو سنوورە دیاریكراوە بۆ زێدی خۆیو شوێنی لە دایك بوونی بگەرێتەوە؟

ئایا ئەمە رێكەوتە یاخود نەخشەو پلانی خودای پەروەردگارە؟.

* تەواو پێچەوانەی ماسی سەلەمۆنیش دەبینین ئەو مارە ئاویانەی كە لە قولایی دەریاكانەوە لە دایك دەبن، پاشان بەردو زۆنگاوەكان یاخۆد رووبارەكان كۆچ دەكەن كە لەوێدا ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن‌و خەڵكانیش دەیانبینن، پاشان كاتێك وادەی مردنیان نزیك دەبێتەوە بەرێگەی پێچەوانەی زۆنگاوو رووباەكان بەرو قوولایی دەریاكان كۆچ دەكەن‌و لەوێدا گەراكانیان دادەنێن‌و پاشان دەمرن.

كاتێكیش گەراكان دەتروكێن نەوەیەكی دیكە لە دایك دەبن، هیچ شتێك لە بارەی ئەوەی پێش خۆیان نازانن بەلاٌم لە گەڵ ئەوەشدا بەهەمان رەفتاری بابو باپیرانیان ژیانی خۆیان دەگوزەرێنن.

* ئەگەر هەوا پەپوولەیەكی مێیینەی لەگەڵ خۆی هەڵبگریٚو لە رێگەی پەنجەرەیەكەوە فرێی بداتە ژوورێكەوە، ئەوا ئەو پەپولەیە زۆری پیٚناچێت دەست بە هەناردنی هێمای شاراوە دەكاتو جاریوا دەبیٚ نێرەكەی لە مەودایەكی دوورە، بەلاٌم لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هێما شاراوانەی پیٚ دەگاتو هەر چەندی مرۆڤ هەوڵبدات ریگەیان لیٚ ون بكات، بەلاٌم ئەو هەروەلاٌمی دەداتەوە بەهۆی ئەو بۆن‌و بەرامانەی كە ئەو هێمایانە دروستیان دەكەن. جانایا دەبیٚ ئەو بەدیهێنراوە لاوازە كەناڵی رادیۆیی

هەبێ‌و ئایا مێیەی پەپولە ئامێری ڕادیۆی هەیە؟ چونكە هەناردن‌و وەرگرتن لە نێوان هەردووكیاندا ئەنجام دەدرێت!.

* ئەو باڵندەیەی یەكێ لە بێچووەكانی لە هێلانەكەی دەبردرێ‌و دوور لە جۆرەكەی خۆی ژیان بەسەر دەبات، كاتێك گەورە دەبێت هێلانەیەك لەسەر شێوەی هێلانەی جۆرەكەی بۆ خۆی دروست دەكات! بێگومان داب‌و نەریت هەر لەكۆنەوە ڕەگ‌و ریشالی هەبووە، ئایا باڵندەكان جگە لەوەی سیفەتەكانیان بۆ دەگوازرێتەوە، دەبێ داب‌و نەریتیشیان بۆ بمێنێتەوە؟

* بێگومان باڵندەكان وادەیەكی دیاریكراویان بۆ فڕین بەرەو باشوور هەیە، هەر تاكێكیشیان بڕیاری ئەوە دەدات كە پەیوەندی بەرەوەكەی خۆیەوە بكات.. پاشان هەموو ساڵێك لە ڕۆژێكی دیاریكراودا بەیەكەوە كۆچ دەكەن!

* ئەو گیانەوەرەی بە(قرژاڵی دەریا) ناو دەبرێت، ئەگەر یەكێ لە چڕنووكەكانی لە دەست بدات دەزانێ كە بەشێك لە لەشی فەوتاوەو خێرا قەرەبووی دەكاتەوە، ئەویش بەوەی خانەكانی‌و هۆكارەكانی بوماوەیی دووبارە چالاك دەكاتەوە، هەر كاتێكیش ئەم كارەی تەواو بوو خانەكان لەكار دەوەستن، چونكە بەرێگەیەك لە ڕێگاكان دەزانێ كە وادەی پشوودانی هاتووە.

هەروەها گیانەوەری (هەزار پێ) ئەگەر لەشی دووكەرتك بێ دەتوانێ لە ڕێگەی یەكێ لەو كەرتانەوە خۆی تەواو چاك بكاتەوە.

ئەگەر مرۆڤ سەری (كرمی بەرووبوم) قووت بكات ئەوا ئەو كرمە خێرا سەرێكی دیكە لە جیاتی دروست دەكاتەوە.

هەروەها ئادەمیزاد دەتوانێت یەكگرتنەوەی برینەكان چالاك بكات، بەلام ئایا كەی نوژدارەكان دەگەنە ئەو قۆناغەی تیایدا ئەوە بزانن، چۆن خانەكان بەجووڵە بخەن بۆ ئەوەی باسكێك بەرهەم بهێنن، یاخود نیوەی مرۆڤەكە لەبری ئەو نیوەیەی كەلێكراوەتەوە، یا سەرێكی دیكە لە بری سەرە براوەكە بەرهەم بهێنن!.

* مێرووەكان وەكوو ئادەمیزاد دوو سیان نییە، بەلام لە ڕێگەی بۆریەكانەوە هەناسە دەدەن‌و، كاتێكیش ئەو مێروانە گەشە دەكەن‌و گەورە دەبن ئەو بۆریانە ناتوانن بەگوێرەی قەبارەی ئەو مێروانە برۆن، هەر بۆیە هەرگیز نەبینراوە كە درێژی مێرووێك لە چەند ملیمەترێك زیاتربێت، باڵەكانیشیان تەنیا كەمێك نەبێ درێژ نابێت.

* ئەو سنووره دیاریکراوەش لە گەشە کردنی ئەو مێرووانە قەدەغەی کردوونە لەوەی جیهان کۆنترۆڵ بکەن، ئەگەر ئەم رێکخەرە سروشتیەش نەبوایە ئەوا مروۆ لەسەر رووی ئەو زەویەدا بەدی نەدەکرا، کوری شیرینم ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت، ئەگەر مێروویێك بە قەد شێرێك بوایە، یا جاڵجاڵۆکەیەك بەوقەبارەیە بوایە.. ئەوا مرۆڤ چۆن لەو بوونەوەرەدا ژیانی دەبردەسەر..
* ئەوە بەدیکراوە جۆرە سیسرکەی دیاریکراو هەنە، لە خولەکێکدا چەندین جار بە گوێرەی پلەی گەرمیی زرِوزرِ دەکەن، ژمارەی جارەکانی زرِەزرِکردنیان سەر ژمێرکراوە، ئەوە بەدیکراوە کە ئەو زرِەزرِکردنە پلەی گەرمی بەشێوەیەکی زۆر رێكوپێك تۆمار دەکات، لەگەڵ جیاوازی دوو پلە.
* جۆر جۆرە مراوییەك لەرووبارێکی ئەوروپا هەن بەشێوەیەکی رێكو پێك هەموو رۆژ لەکاتێکی دیار کراودا دێنە لای پرد یێكو لە جەرەسێك دەدەن کە بۆیان ئامادەکراوە.

# وشـــتـر



خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ﴾الغشية:١٧.

واتـە: (ئایـا ئـەوە سـەرنجی وشتر نادەن چۆن دروستکراوە؟!)

کـوری شـیرینم لەوئایەتـە پـیرۆزەدا بەدیهێنـەری زانـا، زۆر بـەجوانی هانمـان دەدات بـیر بکەینـەوەو سـەرنج بدەینـە دروسـتکردنی وشـتر، بـەوەی کـە بەدیهێنراوێکە مەزنێتی خوای بەدیهێنەروتواناداری تەواوی‌و جوان بەرێوە بردنی دەسەلمێنێ

زانستی تازە هەندێ هەقیقەتی سەر سورِهێنەری لە دروست کردنی وشتردا ئاشکرا کـردووە، ئـەی کوری شیرینم ئەمەش هەندێ نهێنی ئەوەمان بۆ راڤە دەکات، خوای گەورە ئەو دروسـت کـراوە سـەیرو سەمەرەی تایبەتکردوەو لـەنێوان دروسـتکراوە لـەژمارە نـەهاتوەکانی خـۆی هـەڵی بـژاردوەو باسـی

كردووە..

وا باوە وشتر دوو جۆری هەیە: یەكەمیان ئەوانەی كەیەك كۆپارەیان (السنام) هەیە، كەبریتین لەوشتری عەرەبی لە نیوە دوورگەی عەرەبیو ناوچەگەلێك كە بۆ وڵاتی هیند درێژ دەبێتەوە، لەلای خۆرئاواش لەوڵاتانە ی كە دەكەونە رۆخ بیابانی گەورە لە ئەفەریقیادا بڵاون. تەمەنی مام ناوەندی وشتر، لە چل ساڵ زیاترە. هەرچی جۆری دووەمیانە: ئەو وشترانەن كە دووكۆپاریان هەیە، لە ناوەڕاستی ئاسیادا دەژین.

سەرژمێرە مەزندە كراوەكانی چەند دەزگایەگ دەڵێن: لە جیهاندا نزیكەی (١٩٠)ملیۆن وشتر بەدی دەكرێ كە (٩٠٪)یان لەو وشترە عەرەبیانەن كە یەك كۆپارەیان هەیەو زیاتر لە (٨٠٪)شیان لە ئەفەریقیادان.

* ئەوەی یەكەمین جار سەرنجی مرۆڤ بۆ خۆی رادەكێشێت تایبەتمەندیەكانیەتی: دیمەنی دەردوەی ئەوەندە سەرنج راكێشە، ناوەزی مرۆڤەكان دەبات.

ئەوانەی لێ باس دەكەین:

١- چاوەكانی بە دوو چین برژانگی درێژ دەوردراون، كە لە تۆزوڵم دەیان پارێزێت، هەروەها چاوەكانی بەوە جیاواز دەكرێنەوە كەتوانای ئەودیان هەیە شت گەورە بكەنو نزیكی بكەنەوە، كە دوور بەنزیكو، بچووك بەگەورە پێشانی دەدات، ئەمەیە نهێنی ملكەچ بوونی بۆ مندالێكی بچووك یاخود بۆ گیانلەبەرێكی بچووك..

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ﴾ یس:٧٢ .

**واتە: (ئینجا ئەو ماڵاتەمان رام هێناوە بۆتان..).**

٢- لچو لێوەكانی وشترچیرو تونەدن، دڕكو داڵی تیژ دەقەپێنن، هەروەها زۆر چالاكن لەكۆكردنەوەی خواردن، بە شێوەیەك كەوشتر بە درێژ كردنەوەی زمانی بۆ دەرەوە هیچ شێیەكو تەڕاتیەك لە دەست نادات.

٣- هەرچی گوێیەكانییەتی ئەوا بچووكنو كەم دەركەوتوود، سەرەڕای ئەوەی كە لە هەموو لایەكەوە مووەكان دایاندەپۆشن بۆ ئەوەی لەو تۆزوگەردەی كە بایەكان دەیان هێنن بیان پارێزن، هەروەها ئەگەر گەردەلوولی بیابان هەڵیكرد توانای ئەوەیان هەیە بۆ دواوە درێژببنەوەو بەسەریەود بنووسێن.

٤- بەهەمان شێوە دوو کونە لووتی کە شێوەی دوو کەرت وەردەگرن مووی دەورەی داون‌و بەگۆشتیش داپۆشراون، وشتر دەتوانێت دایانبخات‌و نەهێڵێت ئەو لم‌و تۆزەی کە بایەکان لەگەڵ خۆیان هێناوە بچنە نێو سییەکانی..

٥- بەهەمان شێوە کلکی وشتر لە هەردوو لای موویان پێوە ڕوواوە، کە بەشەکانی دواوەی لە تۆزوگەردی لم کە بایەکان دەیان ورووژێنن‌و لە گوللەی دەمانچە دەچن دەپارێزن.

٦- پەلەکانی وشتر درێژن، ئەمەش بۆ ئەوەی لەشی لە زۆر لەو تەپ‌و تۆزانەی کە لە ژێریەوە پەیدا دەبن بەرز رادەگیرێت، یارمەتی دەدەن هەنگاوەکانی فراوان بن‌و جوڵانەوەشی سووك‌و ئاسان بێ، هەروەها پێیەکانی بە چینێکی بەهێزو ئەستوور داپۆشراوەو لبادەیەکی پان‌و نەرم‌و نۆلیشی بە ژێرەوەی پێیەکانییەوەیە، کاتێك کە وشتر لەسەر زەوی دەڕوات ئەو لبادەیە فراوان دەبێ‌و، بەمەش دەتوانێت بەسەرنەرمترین لمدا بڕوات، کە ئەمە بۆ هەر گیانلەبەرێکی دیکەی جگە لە وشتر زۆر سەخت‌و دژوارە، ئەمەش وایلێدەکات کە شیاوی ئەوەبێت نازناوی(کەشتی بیابانی) پێ بدەن.

بێگومان کاروانی وشتر بە بارەوە لە ڕۆژێکدا نزیکەی پەنجا یاخود شەست کیلۆمەتر دەبڕێت، تا ئێستاش ئۆتۆمبێلەکان نەیان توانیوە بەربەرەکانی وشتر بکەن لە ڕۆیشتنیان بە ناوچە بیابانە سەخت‌و دژوارەکان، هەروەها وشتری وایان هەیە کە بۆ سواربوون‌و خێرایی لە ڕۆیشتن‌و گواستنەوەی ئۆتۆمبێل چاکترو شیاوترە، لەشێکی لاوازی هەیەو (١٥٠) کیلۆ مەتر لە ڕۆژێکدا دەبڕێت.

٧- ئەوەی لەگەڵ درێژی پەلەکانی وشتر دەسازێ درێژی ملییەتی، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانێت لە ڕووەکی سەر زەوی بخوات‌و بیکاتە خۆراکی خۆی، هەروەك چۆن دەشتوانێت گەڵای بەرزی درەختەکان ئەگەر بۆی هەڵکەوێت لێ بکاتەوەو بیانخوات، هەروەها یارمەتی وشترەکە دەدات کە بەباری گرانەوە هەستێتەوە سەر پێیان.

٨- کاتێك وشتر یخ دەبێ بۆ ئەوەی پشوو بدات، یاخود هەڵدەستێتەوە بۆ ئەوەی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بێت، لە هەر دوو باراندا لاشە قورس‌و گرانەکەی پشت دەبەستێت بە لبادەیەك لە پێستی بەهێزو ئەستوور کە بەسەر جومگەی پێیەکانییەوەیە، بەهەموو قورسایی لەشییەوە متمانەی دەکاتە سەری، هەتا ئەگەر بکەوێتە سەر گیاندارێکەوە مرۆڤیکەوە ئەوا پان‌و پلیشی دەکاتەوە.

ئەو لبادە یەکێکە لە موعجزەکانی خودای بەدیهێنەر، کە بەو گیاندارە سەرسورهێنەری بەخشیوە، بەشێوەیەك ئامادە باشی کردووە لە سەر لمدرو داخ بووەکان یخ بێت کە وشتر جگە لەوە شتێکی دیکە

شك نابات متمانەیان بكاتە سەرو ڕایان بخات، بۆیە گوێیان پێنادات‌و تووشی هیچ ئەزیەت‌و ئازارێك نابێت..

٩- وشتری ساواش هەر لە كاتەی كە لە دایكی دەبێت، ئەو لبادە پێستییە ئەستوورەی پێ بەخشراوە، چونكە ئەمە شتێكی جێگیرو بۆ ماوەییە، نەك وەكو ئەوەی كە بەپێی خەڵكانەوە دەبینرێت لە گۆرەوی یاخود كردنەپێی پێڵاوی تەسك یا هی دیكە.

١٠- كوڕی شیرینم وشتر جگە لەوەی سوودی هەیە بۆ گواستنەوەو هەڵگرتنی باری قورس‌و گران، سوودی دیكەشی بۆ خەڵكان هەیە، ئەویش ئەوەیە شیرو گۆشتەكەی لێ وەردەگرن‌و لە مووەكەشی جل‌و بەرگی لێ دروست دەكەن، لادێ نشینەكانیش لە پێستەكەی عەبای لێ دروست دەكەن.

ئەمە هەندێ رووی ئیعجازی لە ڕوخسارو دیمەنی دەرەوەی دروست بوونی وشتر، تایبەتمەندگەلێك كە ئەو كەسەی سەرنجیان بدات هەر لەیەكەم تەماشاكردنەوە بە فیترە دەرك بە ئیعازی درووست بوونی دەكات كە توانای خودای بەدیهێنەر دەسەلمێنێ.

بەڵام هەرچی لەبارەی تایبەتمەندیە فسیۆلۆژیەكان‌و نهێنیەكانی وشترە، كەخودای پەروەردگار رۆڵە شیرینەكەم هەندێكیانت بۆ باس دەكەم:

١- ئارامگرتن‌و تێنویەتی. لە ژینگەی وشتردا گژوگیاو ئاو كەمە.. وشتریش هەرگیز لە رێگەی دەمییەوە هەناسە نادات، هەرچەند كەش‌و هەوا گەرم بێت‌و تێنویەتی شاڵاوی بۆ بهێنێ، بەم كارەش لە بەهەڵم بوون لەو رێگەیەوە دوور دەكەوێتەوە.

٢- وشتر بەوە جیا دەكرێتەوە تەنیا برێكی زۆركەم ئارەقە دەردەدات، ئەویش لە حاڵەتی زۆر پێویستدا ڕوودەدات، ئەمەش بۆئەوە دەگەرێتەوە لە شی توانای خۆگونجاند هەیە لەگەڵ ژیانی لە بارودۆخی بیاباندا، كە پلەی گەرمیی تیایدا لە نێوان شەوو ڕۆژێكدا دەگۆرێت.. هەروەها وشتر پێویستی بە ئارەقە دەرهاوێشتن نابێ تەنیا ئەگەر پلەی گەرمیی لە شی لە (٤١) پلە تێپەر بێت، ئەمەش لەماوەیەكی كورتی ڕۆژدا ڕوودەدات، بەڵام لەشەودا وشتر لەرێگەی تیشكەكانەوە خۆی لە پلەی گەرمییەی كە لەناو لەشی كۆی كردۆتەوە دەرباز دەكات‌و بەناو هەوای بەرەڵای دەكات، بەبێ ئەوەی یەك دڵۆپە ئاویش چییە لە دەست بدات. جا پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی زانایە بە بەدیهێنراوەكانی.

هەندێ لەزاناكان توانای وشتر لە سەر بەرگەگرتنی برسێتی‌و تێنوێتی بەوە ڕاڤە دەكەن، كە

لەرێگەی بەرهەم هێنانی ئەو ئاوە یەكە ئاتاجێتی لەو بەزانەی كە لەكۆپارەكەی داهەیە، ئەویش بەرێگەیەكی كیمیاوی ئەو تۆ جێبەجێ دەبێت كە مرۆڤ سەرسام دەكات.

ئەو ئاوە لە ئەنجامی سوتاندنی بەزەكانەوە بەرهەم دێت.. زۆربەی ڕوونو چەوریەكانیش كە وشترەكە لە كۆپارەكەیدا كۆی دەكاتەوە لە كاتی كەمی خۆراكدا یاخود نەمانی پەنایان بۆ دەبات، جا بەرە بەرە دەیانسوتێنیو كۆپارەكەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە گەڵیدا دەتوێتەوە هەتا بەولاو بەولایدا لار دەبێتەوە، پاشان دەبێتە توورەگەیەكی پێستی بەتاڵ ئەگەر هاتوو برسێتیو تینوێتی وشترە كۆچبارە ماندوو شەكەتەكە درێژەی كێشا!.

ئەی كوڕی شیرینم بزانە وشتر (١٢٠كگم)بەزوچەوری لەوێدا كۆ دەكاتەوە ئەمە بێگومان بڕێكی زۆرە وشتر سوودی لێ وەردەگرێت كە دەیانگۆڕێت بۆ ئاوو وزەو دووەم ئۆكسیدی كاربۆن. هەر لە بەر ئەویش وشتر دەتوانێت نزیكەی مانگو نیوێك بە بێ ئاو خواردنەوە ژیان بەسەر بەرێ!.

هەروەها وشتر تایبەتمەندیەكی دیكەشی هەیە، ئەویش ئەوەیە دەتوانێت تینوێتی خۆی لە هەر جۆرە ئاوێك كە بەدی دەكات بشكێنێ، هەتا ئەگەر ئەو ئاوە ئاوی دەریا بێت یاخود ئاوێكی زۆر سوێرو تفتو تاڵی زۆنگاوێك بێت، ئەمەش بەهۆی ئەو ئامادە باشییە تایبەتییەی كە لە گورچیلەكانیدا هەیە، بۆ دەركردنی ئەو خوێیانە بەهۆی دەردانی مێزێكی زۆر خەست، ئەمەش لە دوای ئەوەی كە زۆربەی ئاوەكانی ئاوی گلدەداتەوەو دەیانگەڕێنێتەوە بۆ ناو خوێن﴿ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾المؤمنون:١٤.



## كۆتری نامە بەر

## یەكەم ئاژانسی هەواڵەكان لە مێژوودا

زاناكان دەڵێن: كۆتری نامەبەر زیاتر لە (٥٠٠) جۆریان هەیە، بەوە جیادەكرێنەوە كە زۆر زرنگو زیرەكن، توانایەكی سەیریان لە فڕیندا هەیە، غەریزەیەكی بەهێزیشیان هەیە كە بەهۆیەوە ڕێ بەردو ئامانجو نیشتمانیان بەدی دەكەن، گیانەوەرێكی نەرمو لە سەرخۆو گوێڕایەڵن، خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ﴾ يس:٧٢ .

**واتە: (ئێمە ئەوگیاندارانەمان بۆ ڕام كردوونە).**

كێ ئەو باڵندەیەی ملكەچ كردووە؟ ئەی كێ زرنگ‌وزیرەكی كرووەو توانایەكی زۆری لە فریندا پێ بەخشیوە؟ كێ غەریزەیەكی بە هێزی داوەتێ بەهۆیەوە بەرەو شوێنی مەبەست ڕێ بەدی بكات؟ ئەی كێ وایلێكردووە ئارام‌و لە سەر خۆو هۆگری مرۆڤ بێ، خزمەتی بكات‌و،خستویەتیە ژێرباری؟.

* بێگومان ئەو باڵندەیە، واتە كۆتری نامەبەر، ڕێگەی هەزار كیلۆمەتر بەبێ ڕاوەستان، لە فڕینێكی بەردەوامدا بەخێرایی شەست كیلۆمەتر لە كاتژمێریكدا دەبڕێت..

* ئەو كۆترە نامەبەرە ساڵانە نۆ جووت بێچوو هەڵدە هێنێت، هەروەها یارمەتیت دەدات لە گواستنەوەی نامەكانت بەڕێگەی ئاسمانەوە، بە پێوانەی ئەو سەردەمی زۆربەخێرایی دەیگەیاندە شوێنی خۆی.

* سوڵتان (نورالدین) كۆتری نامەبەری بەكارهێناوە بۆ گواستنەوەی نامەكانی خۆی لە نێوان دیمەشق‌و قاهیرەدا، چونكە ئەوكاتە پۆستە لە ڕێگەی كۆترەوە دەگواسترایەوە..

هەروەها لەلایەن سەرجەم میللەتانی وەكوو گریك‌و یۆنانو ڕۆمان‌و عەرەب لە هەموو سەر دەمەكاندا بۆ گواستنەوەی نامەكان‌و گەیاندنی هەواڵەكان بەكار دەهێنرا..

بەڵام ئەو پرسیارەی كە مرۆڤ سەرسام دەكات ئەوەیە: ئەو باڵندەیە لەورێگە دوورە وە چۆن ڕێگەی بەدی دەكرد، كە زیرەك ترین فرۆكەوانی سەر ڕووی زەمین لە بەدی كردنی ئەو ڕێگەیە دەستەوەستان دەبێ.. بێگومان باسی گریانەو ڕاڤەكردنی زۆریان كردووە، ڕاسترین ڕاڤەكردنیش بۆ ئەو بابەتە ئەودیە كارەكە پەیوەندی بە ڕێنموونی كردنی خودای گەورەو كار لە جێیەوە هەیە: ﴿ **الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى** ﴾طه: ٥٠.

**واتە:(پەروەردگارمان ئەو زاتەیە كە هەموو شتێكی بە تایبەتی‌و ڕێكوپێكی دروست كردووە، پاشان ڕێنموویی كردووە، تا بەچاكی ڕۆڵی خۆی ببینێت).**

# كۆچ كردنی باڵندەكان



خـــــودای گـــــەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾الملك:١٩

.واتـــە:(ئایاســـەرنجی باڵنـــدەیان نـــەداوە بـــە ســـەر سەریانەوە پۆلّ پـۆلّ دەفـڕنو باڵەكانیان لێك دەنێن، ئەو باڵندانە جگە لە خوای میهرەبان كەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریـان ناكـات، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێك بینایەو هیچی لێ ون نابێتو چاودێری هـەموو دروسـتكراوانی دەكات).

ئەو ئایەتانە هانمان دەدات بیر لە ئاسمـانو زەوی بكەینـەوە، باڵنـدەكان دەبیـنین لـەوەرزی پـایزدا بەتەوایی لە بەرچاوان بزردەبن، لە وەرزی بەهاردا پەیدا دەبنەوە، زاناكانیش دەڵێن: (بێگومان بە دەیان هەزار باڵندەهەن هەموو ساڵێك كۆچ دەكەن لـە نێـوە گـۆی بـاكووری زەویـەوە بـۆ نیوەكـەی دیكـەی باشووری، بەتایبەتیش بۆ باشووری ئەمەریكاو باشووری ئەفەریقیا، بەڵام هەرچـی وڵاتـی كـۆچ كردنـە بریتیـیە لە (ئەمریكای باكوورو، ئەوروپاو، ئاسیا).

ئەو باڵندانە هێڵی یەكسانی زەوی دەبڕنو بەرەو باشـووری ئـەفریقیا. لـە هـەموو ئەنـسكلۆپیدیا زانستیەكان باس لەمە دەكرێ، دەبێ چۆن گەیشتبنە ئەو هەقیقەتانە.

زیاتر لە چوار ملیۆن باڵندە هەن كە زنجیری كانزایی كراوەتە پێیەكانیان، كەناسـنامەی باڵندەكـەو بزووتنەوەكانی روون دەكاتەوە،هەروەها كۆمەڵەیەكی دیكە هـەن كـە ژمارەیـان سـێ‌ملیۆن باڵندەیـە، كۆمەڵی سـێیەمیش هەنە كە ژمارەیان سێزدە ملیۆن باڵندەیە،هەر لەو كاتەی كە بچووك بووینە لە نێو هێلانەكانیاندا چەند زنجیرەكیان كراوەتە پێیەكانیان بۆ ئەوەی چاودێری بزوتنەوەكانیان لە باكوورەوە بـۆ باشوور بكەن، چونكە مەڵبەندەكانی توێژینەوە لە نێوان هەردوو نیوەی باكوورو باشـووری گـۆی زەوەی

بڵاو بوونەتەوە.

ئەو شتەی كەوا سەرنجی مرۆڤ رادەكێشێت ئەوەیە،ئەو باڵندە بچووكانەی كە تازە لە دایك بووینەو زنجیرەكانیان كراوەتە پێ، لە كۆچەكەیاندا بە ئاراستەی راستو درووستدا رۆیشتوونە بەبێ ئەوەی باڵندە گەورەكان فێریانیان كردبێ!

جا دەبێ كێ ئەو توانا سەرسوڕهێنەرەی لە نێو ئەو باڵندە بێچووانەدا ڕسكاندبێ،بۆ ئەوەی بەرەو ئامانجیان ڕێ بەدی بكەن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَى{٤٩} قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى{٥٠}﴾الشعراء:٧-٨ .

**واتە:(باشە ئەی موسا پەروەردگاری ئێوە كێیە؟!ٛ موسا گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە كە هەموو شتێكی بە تایبەتیو ڕێكوپێكی دروست كردووە، پاشان ڕێنموویی كردووە، تا بەچاكی دەوری خۆی ببینێت).**

## مێش هەنگوین بەڵگەو نیشانەیەكی مەزنە



بێگومان هەنگ بەڵگەو نیشانەیەكە لە بە ڵگەو نیشانە سەرسوڕهێنەرەكانی خودای گەورە، مەزنێتی خودای گەورە دەسەلمێنێ، خودای كارلە جێ دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ﴾النحل:٦٨.

**واتە:(پەروەردگاری تۆ نیگاو ئیلهامی كردووە بۆ هەنگ كە جێگە بۆ خۆی ساز بكات لەكونو كەلێنی چیاكاندا، هەروەها لە كەلەبری درەختەكانولەو شوێنانەش كە ئادەمیزاد بۆی ئامادە دەكات).**

ئەو پیتی (ی)یەی كە لەوشەی (اتَّخِذِي) داهاتووە، بریتییە لە یای مێینەی دوێنراو، وەكو ئەوەی ئەو ئایەتە رووی قسەی ئاراستەی مێیەكانی هەنگی كردبێ نەك نێرەكانی.

ٛ بێگومان هەنگ تاكە زیندەوەرە كە دەتوانێت شیلەی گوڵەكان لە پێناوی خۆراكدا كۆ بكاتەوە،

سەرەڕای ئەوەی لەشیلەی گوڵەكان، شانەو شەمیۆ هەنگوین دروست دەكات، بەكارێكی گەورەش هەڵدەستیٚ، ئەویش پیتاندنی گوڵەكانە، بەبیٚ بەشداری هەنگ ژمارەیەكی زۆر لە رووەكەكان بەریان نابێت.

هەروەها كورە شیرینەكەم هەنگ لەو شانانەن كە خاوەن سیستەمێكی وردوو رێكو پێكن، كە بەرزترین كۆمەڵگەكانی ئادەمیزادیی لە لاسایی كردنەوەیان دەستەوستان دەبن.

* هەرهەنگێك سەردانی نزیكەی هەزار گوڵ دەكات، بۆ ئەوەی دلۆپێك لە شیلەی دەست بكەوێت، دلۆپێك لە شیلە پێویست بەوە دەكات كە هەنگ بچێتە سەر هەزار گوڵ یاخود زیاتر، بۆ ئەوەی هەنگێك (١٠٠گم) لە شیلە كۆ بكاتەوە پێویستی بە چوونە لای ملیۆنێك گوڵ دەبێت.

* بێگومان خێرایی فڕینی هەنگ (٦٥)كیلۆمەتر زیاترە لەكات ژمێرێكدا. بەڵام ئەگەر شیلەی هەڵگرتبوو ئەوا خێراییەكەی بۆ نیوەی ئەمە دادە بەزێت.

* یەك كیلۆ هەنگوین پێویستی بە فڕینی چوارسەد هەزار كیلۆمەتر هەیە، هەروەها یەك كیلۆ هەنگوین پێویستی بە دەجار سووڕانەوەهەیە بە دەوری، گۆی زەویدا لە هێڵی یەكسانییەوە، واتە بە قەدەر دەهێندەی چوار دەور زەوی.

* ئەگەر هاتوو لە وەرزێكدا بوو گوڵی تێدا زۆربوو، ئەوا هەنگەكە بارەكەی خۆی دەداتە هەنگێكی ترو، خۆشی خێرا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كات لە دەست نەداتو، شیلە كۆ بكاتەوە..

* هەرچی شاژنە قەبارەی لە هەموو هەنگەكانی دیكە گەورەترە، لە وەرزی بەهاردا هەموو رۆژێك نزیكەی هەزار تا دوو هەزار گەرا دادەنێت، ئەوەی لێرەدا مرۆڤ سەرسام دەكات ئەوەیە كە ئەو شاژنە ئەو گەرایانەی كە لە پاشان دەبنە شاژن لە شوێنێك دادەنێت، نێرەكان لە شوێنێك، مێیەكانیش لە شوێنێكی دیكەدادەنێت! ئەمەش بۆ ئەوەی هەریەكەیان بەگوێرەی رەگەزی خۆیان خۆراكی تایبەتیان پیٚ بدرێت، چاودێری تایبەتیان بكرێت، وەكو ئەوەی ئەو شاژنە بزانێت رەگەزی لە دایك بووەكان بەرلە لە دایك بوونیان بزانێت، ئەمەش كارێكە مرۆڤ تیایدا دەستەوەستانە!.

* كارەكەرە مێینەكانیان خواردنی تایبەت بە شاژن لەگەڵ خۆیان دەهێنن، هەنگ ناسەكانیش ئەو هەنگە مێییانە بە خزمەتكارە باشەكان ناوزەد دەكەن،

*كاری نێرەكان جووت بوونە لەگەڵ شاژنەكان، كاری مێییەكانیش كاركردنە، هەروەها كاری شاژنیش بریتییە لە گەرا دانان.

* ئەگەر شانەیەك شاژنەكەی خۆی بزركرد، تووشی شپرزەیی دێت، بەڵام كارەكەرە مێینەكان

گەرایەك هەڵدەبژێرن‌و چاودێری كردنی دەگرنە ئەستۆی خۆیان‌و خۆراكی تایبەتی پێدەدەن هەتا دەبێتە شاژنێكی نوێ.

* هەنگ چەند شاخێكی هەستكردنی هەیە كە هەزارەها پەڵەی وردیان لە سەرە وەكو ئەندامەكانی بۆنكردن‌و بیستن. بەهۆیانەوە لەنێو تاریكایی شانەكەیان ڕێگەی خۆیان دەدۆزنەوەو یەكتر دەدوێنن‌و لەیەكتر دەگەن‌و ڕێنموونی وەردەگرن، جگە لە جۆرەها خۆلانەوەو سەماكردن وەكو ئەوەی كە زمانێكی تایبەت بەوان بێ.

* هەنگ لەو شەمیییەی كە ڕژێنە تایبەتیەكەیان دەری دەدەن‌و لە دوای ئەوەی بەلیكی خۆیان هەڵگیرو وەرگێری دەكەن، چەند ژوورێكی شەش پاڵووی بە یەكەوە نووساوی لێ دروست دەكەن، كە زۆر بەشێوەیەكی ڕێك‌و پێك دەیانخەنە پاڵ یەكتر، بەبێ ئەوەی هیچ كەلێن‌و درزێكیان لە نێوانیدا هەبێت. ﴿هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ﴾لقمان:١١.

**واتە:(ئا ئەمەیە دروستكراوانی خوا، وەرن نیشانم بدەن بزانم ئەوانەی تر جگە لەو زاتە، چیان دروست كردووە، نەخێر هیچیان دروست نەكردووە..).**

## مێـرووڵـــە



مێرووله زیندەوەر كۆمەڵایەتی ناوازەیە، لە هەموو شوێنێك‌و لە هەموو كاتێكدا هەنە، بەڵكو جۆرەكانیان لە (٩) هەزار جۆر پترە، هەندێك مێرووله ژیانیان جێگیرەو لە خانوو ماڵی تۆكمەو ڕێك‌وپێك دەژین، هەندیكیشیان بەتەواوی وەكو ڕەوەندەكان بەكۆچەری دەژین، هەندێكیان بەهەوڵ‌و كۆشش‌و ماندوو بوونی خۆیان ڕۆزی خۆیان پەیدا دەكەن‌و، هەندێكیشیان بە غەدروو زاڵ بوون ڕۆزی خۆیان بەدەست دەهێنن، مێرووله سروشتێكی كۆمەڵایەتیان هەیە، ئەگەر یەكێكیان لە كۆمەڵەی خۆی دابڕێ دەمرێت، ئەگەر خۆراك‌و شوێن‌و بارودۆخی باشیان بۆ دابین بكرێ ئەوا وەكـ مرۆڤ وان، ئەگەر لەشوێنێكی دوور لە ڕووناكی‌و دەنگ‌و كات‌و شەوو ڕۆژ بۆماوەی بیست ڕۆژان گۆشە گیریان بكەن، ئەوا هاوسەنگی خۆیان

نە دەست دەدەن.

هەروەها مێروولە وانەیەكی چاك لە هەرەوەزیو هاریكاری فێری نادەمیزاد دەكات، ئەگەر مێروولەیەكی برسیو یەكێكی دیكەی تێر بەیەك بگەن، ئەوا مێروولە تێرەكە پوختەگەلێك لە خۆراكی ئەشی خۆی پێ دەدات، چونكە لە نێو كۆئەندامی هەرسكردنیدا كۆئەندامێكی هەلێنجان هەیە كە خواردنی پێ دەداتە هی دیكە.

مێروولە شاژنێكی قەبارە گەورەی هەیە، نێش‌وكاری گەرا دانانو، فەرمان دانە، هەروەها شوێنێكی پارێزراوی لەنێو خانووەكانی مێروولەدا هەیە، پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ هەموو تاكێكی شارەكەوە هەیە، كارەكەرە مێینەكانیش ئەركی جۆراو جۆریان هەیە لەوانەش: پەروەردەكردنی =بێچوەكانەو، ئەمەش وەكو كەرتی فێركردنە لەلای نادەمیزاد دا، هەروەها مێروولە سەربازگەلێكیان هەیە كە قەبارەیان لەوانی دیكە گەورەترە، خاوەنی سەرێكی رەقن وەكوو ئەوەی كڵاوی سەربازیان لەسەربێ، ئەمەشیان لە كەرتی سوپا دەچێ لە پاسەوانی كردنی شاژنو پاراستینی ئاسایش‌و بەریەرچ دانەوەی دوژمندا، هەروەها لە ئەركەكانی ئەو كارەكەرە مێیینانە، پاك كردنەوەی خانووەكانو رارەوەكانە، ئەمەش وەكو كەرتی شارەوانییەكانە، هەروەها لە ئەركەكانی دیكەیان كێشانەوەی مردووەكانە لە نێو خانووەكاندا، ژێرخاك كردنیانە، ئەمەشیان وەكو نوسینگەكانی ئەسپاردەكردنی مردووەكان وایە،هەروەها ئەركێكی دیكەیان بریتییە لە هێنانی خۆراكو خواردەمەنی لە دەرەوەی شارەكە، ئەمەشیان وەكو كەرتی هاوردەكان وایە، هەروەها ئەركێكی دیكەشیان پەروەردەكردنی مێروولەگەلێكە كە مێروولەكان لە سەر شیلەكانیان دەژین، ئەمەشیان وەكو كەرتی بە خێوكردنی ئاژەڵان وایە.

* هەروەها مێروولە شارەكان بنیاد دەنێن، رێگاكان دەكەنەوە، تونێلەكان هەڵدەكەنن، خواردەمەنیەكان لە كۆگاكاندا هەڵدەگرن، هەندێ جۆری مێروولە باخچە دروست دەكەن، رووەكەكان دەچێنن، هەندێ جۆری دیكەیان جەنگ لە گەڵ تیرەكانی دیكە بەرپا دەكەن، مێروولە لاوازو دۆراوەكان بەدیل دەبەن، خودای گەورەش راستی فەرمووە كاتێك دەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾ الانعام:٣٨.

واتە:(هیچ زیندەوەرو گیانلەبەرێك نییە بە سەر زەویدا بڕواتو هیچ باڵندەیەك بە باڵەكانی بفرێتو ئەویش ئوممەتو گەلێك نەبن وەك ئێوە، هیچ شتێك نییە پشت گوێمان خستبێت لە كتێبە (تایبەتیەكەی لوح المحفوظ)دا.

# پزیشکی لە ئیسلامدا

کوڕی شیرینم بزانە کە ئیسلام داوای خۆ چارەسەرکردن لەنەخۆشییەکان دەکات‌و لە گەڵ دەست لەخۆ بەردان‌و پشت لێکردنەوەدا نییە، چونکە خۆ چارەسەرکردن پێچەوانە نییە لە گەڵ (توکل)و پشت بەخوا بەستان، بەڵکو ئەوەی قەدەغەکراوە خۆ چارەسەرکردنە بە شتە حەرامەکان، تەنیا لە کاتی پێویست نەبێت. لەو فەرموودەیەی کەئیمامی موسلم‌و هی دیکەش ریوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لکل داء دواء، فاذا اصیب دواء الداء برا باذن الله عز وجل) واتە: (بێگومان هەموو دەردێك دەرمانی هەیە، ئەگەر دەرمانەکە گەیشتە دەردەکە، ئەوا بەویستی خوا چارەسەر دەبێت).

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر ڕێ پێدان‌و بەچاك زانینی خۆچارەسەر کردن.

کەواتە خودای گەورە بۆ هەر دەردێك دەرمانێکی داناوە، هەروەها ئەمەش هاندەرێکە بۆ پشکنین‌و بە دوادا گەڕانی دەرمانی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان.

هەروەها لەو فەرموودەیەدا پێغەمبەر(ﷺ) چەند ڕێسایەکی بنەڕەتی بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان روون کردۆتەوە ئەویش ئەوەیەکە دەبی یەکجار نەخۆشییەکە بەهۆی پزیشکی پسپۆر دەست نیشان بکرێت‌و هەقیقەتەکەی بزانێت، پاشان دەرمانی گونجاو بۆ ئەو نەخۆشییە دابنێت.

گومانیشی تێدا نییە شیفاو چاك بوونەوە لە سەر ئەوە دەوەستێت کە دەرمانەکە بە ویستی خودا بگاتە نەخۆشەییەکەو کاریگەری لیّ بکات.

* بەرێوە چوونی هەموو ئەوانەش بە پێی ئەخشەو ویستی خودای گەورەیە.. خۆ چارەسەرکردنیش پێچەوانە نییە لە گەڵ تەوکول‌و پشت بە خوا بەستن، هەروەك چۆن لابردنی برسیەتی‌و تینویەتی بە خواردن‌و خواردنەوە پێچەوانەی تەوکول‌و پشت بەخوا بەستن نییە، بە هەمان شێوەش خۆ دوور خستنەوە لە زیانەکان‌و دوعاو نزا کردن بە بەخشینی لەش ساغی‌و لابردنی زیانبەخشەکان‌و هی دیکەش.

# خستنە ژێر چاودێری تەندروستی (دابڕینی نەخۆشەکان)

* پزیشکەکان دەڵێن: دابڕینی نەخۆشی لەو سەردەمەی ئێستا گرنگترین هۆکارە بۆ سنووردارکردنی نەخۆشییە پەتاکان، بە پێی ڕێنماییەکان، ڕێگە نادرێت بە هیچ کەسێك بچێتە ناو ئەو

ناوچانەی كە جۆرێك لە نەخۆشییە درمەكانی تێدا بڵاو بوونەتەوە، تێكەڵاوی خەڵكەكەی بكرێت، بەهەمان شێوەش رێگە بە خەڵكی ئەو ناوچانەش نادرێت كە لێی دەربچن، ئەوكەسە تووشی ئەو پەتایە بووبێت یاخود نا، بۆ نموونە وەكوو پەتای تاعوون.

پێغەمبەر(ﷺ) لە ژمارەیەك لەفەرموودەكاندا پرەنسیپەكانی خستنە ژێر چاودێری تەندروستی بە جوانترین شێوە روون كردۆتەوە، خەڵكی قەدەغەكردووە لەوەی بچنە ناو شارێك تووشی پەتای تاعوون بووبێتو، بە هەمان شێوەش خەڵكی شارەكەشی قەدەغە كردووە كە لێی دەربچن، بەڵكو ئەو دەرچوونەی وەكو راكردن لە شاڵاوی كافران داناوە، كە لە گوناهە گەورەكانە، ئەودشی لە ناویدا سەبرو ئارام بگرێت ئەجرو پاداشتی شەهیدی بۆ داناوە.

لە عەبدەلرحمانی كوری عەوفەوە (خوا لێی رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (اذا سمعتم بالطاعون بارض فلا تقدموا علیه، واذا وقع بارض وانتم بها فلا تخرجوا فرارامنه)واتە: (ئەگەر بیستتان تاعوون (كولێرە) لە زەویەكدا هەیە ئەوا نەكەن بچنە ناوی، هەروەها ئەگەر لە زەوییێكدا بڵاوبۆوەو ئێودش لەوێدا بوون، ئەوا نەكەن لە بەری رابكەنو لێی بچنە دەرەوە).

## ئارەق (الخمر)

*(خمر) لە رووی زمانەوانییەوە: ئەوەی لە گوشراوی ترێ دروست دەكرێت، بۆیەش پێی دەوترێت (خمر)چونكە ئاوەز (عقل) دادەپۆشێت. هەقیقەتی ئارەقیش ئەوەیەكە لە ترێ وەردەگیرێت نەك لە شتەكانی دیكە.

لە رووی شەرعیشەوە(خمر): بەوە دەگوترێت مرۆڤ سەرخۆش بكات جا كەمێكی بێت یاخود زۆری، ئینجا ئەو شتە لە ترێ یا خورما یا گەنم یا جۆیا لەهی دیكە دروست كرابێت، ئەمەش بە پێی ئەو فەموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) كە دەفەرموێت:

(كل مسكر خمر، وكل خمر حرام)رواه مسلم.

واتە: (هەموو ئەوانەی كە مرۆڤ سەرخۆش دەكەن ئاردق (خمر)، هەموو ئارەقێكیش حەرامەو قەدەغەكراوە).

هەوەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾المائدة:٩٠ .

واتە:(ئەی ئەوانی كە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن كە عەرق‌و قوماروگۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا، لەو شوێنانەی كە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج‌و حەرام‌و حەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیس‌و لە كارو كردەوەی شەیتانن، كەواتە ئێوەش خۆتانی لێ بەدوور بگرن‌و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی‌و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا)).

هەندێ گەمژەی بێئاگا واگومان دەبەن كە مانای(فَاجْتَنِبُوهُ) واتە بێزراو(مەكروهە)و مانای حەرام ناگەیەنێت، لەگەڵ ئەوەدا(الاجتناب)حەرام بوونەكەی زۆر بەهێزترە لە گوتەی: (لا تشربوه) واتە مەیخۆنەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی (لا تشربوه) بەس نەخواردنەوەی دەگەیێنێت‌و دروستە لە شوشە بكرێ یاخود بكرێتە دیاری یاخود بفرۆشرێت یاخود لە سەر مێزێك گردببنەوە كە عەرەقی لە سەر دانراوەو دەخورێتەوە..

گرنگ ئەوەیە كە ئەو كەسە نایخواتەوە!! بەڵام (الاجتناب)واتە حەرام كردن‌و دوور كەوتنەوە لەهەموو ئەوانە بەتەواوی.

وە عەرەق لە وڵاتە ڕۆژئاواییەكاندا بە شێوەیەكی بەرفراوان بڵاو بۆتەوە، ڕاستە ئەوانە گەیشتوونەتە نێو هەیڤەوە، بەڵام قاچەكانیان تا ئیستاش لەناو قوڕاودا نغرۆ بووە، لە ڕاستیدا گرفتێكی هەقیقیە كاتێك دەزانن كە لەویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا زیاتر لە (١١)ملیۆن ئالوودە بوو بە عەرەق، زیاتر لە (٤٤)ملیۆن عەرەق خۆری تێدایە.

هەروەها ساڵانە زیاتر لە(٢٠٠٠) هەزاركەس لە بریتانیا بەهۆی عەرەقەوە گیان لە دەست دەدەن.

هەروەها پرۆفیسۆر (شاكیت) نوسیویەتی كە (٩٣٪)ی دانیشتوانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایی عەرەق دەخۆنەوەو(٤٠٪)ی پیاوانیان بەهۆی ئەو نەخۆشییانەی لەعەرەقەوە تووش بوون دەناڵێنن‌و (٥٪)ی ئافرەتان‌و (١٠٪)ی پیاوان بەهۆی نەخۆشییە درێژخایەنەكانەوە دەناڵێنن.

## كاریگەری ژەهراوی بوون بە عەرەق

ئایا عەرەق خۆر دەزانێت كە ئەوەی دەیخواتەوە ژەهرێكی بكوژی خێرایە؟ بەر لە خواردنەوەی ، دروست كاری عەرەق هەڵمەكانی لە ڕێگەی هەناسەوە هەڵدەمژێت، كە دەبێتە هۆی توشبوون بە هەوكردنی بۆڕی هەناسەو سی یەكان و هەتا دەگاتە هەوكردنی ناوپۆشی لووت، كە دەبێتە هۆی لاواز

بوونى هەستى بۆن كردن، ئا لێرەدا ماناى گوتەى خوداى گەورە (فاْجتنبوه) روون و ئاشكرا دەبێت كە ماناى قەدەغەكردنى نزيك بوونەوە لێى بە شێوەيەكى رەها دەگەيەنێت، كە ئەمە گشتگير ترە لە قەدەغەكردنى خواردنەوەى

هەروەها كاريگەرى ژەهراوى عەرەق بە گوێرەى گۆڕانى رێژەى لە نێو خوێندا جياواز دەبێت، ئينجا كاتێك رێژەكەى دەگاتە (٢٠-٩٩٪ ملگم) دەبێتە هۆى گۆڕانى بارى دەروونى و ناهاوسەنگى ماسولكەكان و شلەژانى هەستى، لە رێژەى (١٠٠-٢٩٩٪ ملگم) دا دڵ تێكهەڵاتن و تێكەڵاو بوونى وێنەكان لەبەرچاوان‌و شپرزەييەكى زۆر لە هاوسەنگى لەش بەديار دەكەوێت، هەروەها لە رێژەى (٣٠٠- ٣٩٩٪ ملگم) دا پلەى گەرمى لەش دادەبەزێت‌و شپرزەيى لە قسەكردن روودەدات و يادەوەرى لە دەست دەدرێت، وە لەرێژەى (٤٠٠- ٧٠٠٪ملگم) دا كەسە كە دەچێتە بارى مت بوونێكى قووڵ كە نارێكى لە هەناسەدانيشى لەگەڵ دادەبێت، كە لە دوايشدا دەبێتە هۆى مردنى، (واتە بەكافرى دەمرێت) خودايەمان پارێزە.

# ئايدز و حەرام كردنى داوێن پيسى




بێگومان ئيسلام زۆر پێداگرە لەسەر ئەوەى كۆمەڵگەيەكى داوێن پاك و خاوێن بەدى بێنێت، كە هەواو ئارەزووەكانى تێدا نەورووژێنرێت و سنوورى قەدەغەكراوەكان پێشێل نەكرێت، ئەمەش بە مەبەستى پاراستنى ئابروو لە لە كە دار بوون و پيس بوون، تێكەڵ بوونى رەچەڵەكەكان، بۆ ئەو مەبەستەش ياساو رێساگەى داناوە كە دەبنە گەرەنتى پاراستنى ئەو ئامانجە بەرزە، فەرمانيان بە باڵاپۆشى و چاو داخستن لە ئاست حەرامەكان، هاندانى پرۆسەى هاوسەرگيرى كردووە، سنوورەكانيشيانى رەنگ رێژكردووە.

لەم پێناوەشدا لە کتێبی خودای گەورە هەرەشەو ئاگادارکردنەوە لە گوناهە نهێنی و ئاشکراکان هاتووە، هەروەها فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) هاتوونە سزای بلاوبوونەوەی زینا و داوێن پیسی و بە ئاشکرا ئەنجام دانی لەنێو خەلکی دا ڕوون کردۆتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت : (خمسٌ بخمس، مانقض قومٌ العهد الا سلط عليهم عدوهم، وما حكموا بغير ما انزل الله الا فشا فيهم الفقر، ولاظهرت فيهم الفاحشة الا فشا فيهم الموت، ولا طففوا المكيال الا منعوا النبات واخذوا بالسنين، ولا منعوا الزكاة الا حبس عنهم القطر) (الطبراني في الكبير، عن ابن عباس، وهو حديث حسن) واتە: کردنی پێنج شتان پێنج شتی لێ دەکەوێتەوە، هەر قەومێك پەیمان هەلبوەشێنێتەوە دوژمنی خۆیان بەسەردا زاڵ دەکرێت، ئەگەر حوکمیان بە غەیری قورئان کرد هەژاریان لە ناو بلاودەبێتەوە، ئەگەر زیناو داوێن پیسی لەناویاندا بەدەرکەوت، مردن لە نێوانیاندا بلاودەبێتەوەو، ئەگەر تەرازووبازیان کرد واتە فرۆفێلیان لەکێشانەو پێوانەکرد، ئەوا شین بوونی کێلگەو کشتوکالیان لێ قەدەغەدەکرێت وبە وشکە سالی لەناودەچن، ئەگەر زەکاتیان نەدا ئەوا بارانیان لێ دەگیرێتەوە).

(ڤایرۆسی ئەیدز هێرش دەبەنە سەر خانەی یاریدەدەری دووەم ، کە لەشێوەی خاڵ گەلێکی شین بەدیاردەکەون بەسەر رووکاری خانەی یاریدەدەری لیمفاوی)

هەروەها لەریوایەتێکی ئیبنو ماجەو حاکیمدا، کە فەرموودەیەکی سەحیحە، بەم شێوەیە هاتووە : (لم تظهر الفاحشة في قوم قط ، حتى يعلنوا بها، الا فشا فيهم الطاعون الاوجاع التي لم تكن مضت في اسلافهم الذين مضوا..) واتە : (هەرکاتێك زیناو داوێن پیسی لە نێو قەومێك دا سەری هەلدا، هەتا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کەوا ئاشکرای بکەن، ئەوا تاعوون و نەخۆشی ئەوتۆیان لەنێو دا بلاودەبێتەوە کە لە نێو ئەوانەی پێش خۆیان دا نەبووە کە لەپێش ئەواندا ڕۆیشتوونە).

کوڕی شیرینم زانستی نوێ و واقیعی سەردەم مانای ئەو فەرموودەیان دووپات کردۆتەوەو ڕاستی پێغەمبەرێتی پێغەمبەرمانیان (ﷺ) سەلماندوە، کە خەلکی هەقیقەتی ئەمەیان دەرك پێ نەکردبوو تەنیا لەدوا سالەکانی سەدەی بیستەم نەبێت کە زیناو داوێن پیسی بە شێوەیەکی ترسناك تیایدا بلاوبۆوە، زۆرێك لە نەخۆشی یە سێکسی یەکانی تێدا پەرەی سەند کە لە پێشدا نەبوون، هەموو ئەوەش بەهۆی سەرهەلدانی زیناو وداوێن پیسی و ئاشکرا کردنیەوە بووە، ئەوەتا نەخۆشی (زوهری) یەکەمین جار لەکاتی جەنگی ئیتالیاو فەرەنسا سەری هەلدا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە زیناو داوێن پیسی لە ناو سەربازەکاندا بلاوبۆوە، ئیتالیەکان ناویان نا دەردە فەرەنسایی.

※ هەروەها کاتیك داگیرکاری ڕۆژئاوایی شالاویان بردە سەر ولاتە موسلمانەکان، ئەو نەخۆشیەیان

ئەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتبوو ئەو کات عەرەبەکان ناوی دەردە فەرەنجیان بۆ ئەم نەخۆشیە دانـاوە، هـەتا ئەمرۆش لەگەڵدابێ ئەو ناوە هەر بەکار دێت.

* لەسەردەمی نوێدا نەخۆشی (هربس) وەکو پەتایەکی سێکسی بڵاوبۆوەی بەرفرەوان سەری هەڵدا هەتا تێکرایی ساڵانەی تووشبوون بەو نەخۆشی یە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئـەمریکا دەگاتـە نیـو ملیۆن کەس.

* لەساڵی (١٩٧٩ز) دا بۆ یەکەم جار لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، نەخۆشی لە دەست دانی بەرگری وەرگیراو، ناسراو بە (ئایدز) سەری هەڵدا، جۆرە ڤایرۆسێکە بەدوای خرۆکە سپی یە کـانی بەرگری لەشی مرۆڤ دەکەون و یەك لەدوای یەك تەفرو تونایان دەکەن، هەتا وای لیٚ دێ لەش گـرنگترین هۆکارەکانی بـەرگری کـردن لەدەسـت دەدات، دوا بـەدوای ئەمـەش بەتـەواوی دەسـتەوەسـتان دەبێـت لەبەرەنگار بوونەوەی ئەو نەخۆشیانەی لەشـی سـاغ لـەباروودۆخی ئاسـایی دا بەسـەری دا زاڵ دەبێـت، هەروەها خاوەنەکەی بەم شێوە یە دەمێنێتەوە هەتا دەیکوژێـت، ئەمـەش لـەدوای ئـێش و ئـازارێکی دوورودرێژ، بۆ ماوەیەك کە لەوانەیە بەهۆی دارمانی کۆ ئەندامی بەرگری لەلەشدا زۆر بخایەنێت یا خود کورت خایەن بێت.



## گۆشتی بەراز

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حرمـت علـیکم المیتة والدم ولحم الخنزیر ومـا اهـل لغـیر الله بـه﴾ (المائدە : ٣٠)

**واتـە: (لەسـەرتان حـەرام کـراوە خـواردنی گۆشـتی مردارەوەبـوو، خـوێن، گۆشـتی بـەراز، هەروەها ئەو مـاڵاتەش کە سەر دەبـڕدرێن و نـاوی غەیری خودای لەسەر دەبرێت...)**

کـوڕە شـیرینەکەم زاناکـان کۆڕابوونـە لەسـەر ئەوەی بەراز حەرامە، ئەویش لەبەر ئەو ڕاشکاویەی کە لەو ئایەتە پیرۆزەی خودای گەورەدا هاتووە، بۆیە

حەلاڵ نیە هیچ شتێكی لێ بخورێت، جا ئەو شتە چ گۆشتی بێ یا بەزی بێ یا دەماری بێ یا كڕكڕاگەی بێ هەناوی بێ یا مۆخی بێ یا پەلەكانی بێ یا هەربەشێكی دیكەی بێ.

بێگومان خودای گەورە هۆی حەرامی خواردنەكەی ئاشكراكردووە بەوەی كە (رجس) ە ، واتە پیسە، شتی پیسیش واجبە لەسەر موسڵمان كە لێی دووركەوێتەوە، بەڵام وەنەبێ تەنیا لەبەر ئەمە حەرام كرابێ ، بەڵكو لەبە ڕیپیسی و زۆرێك لەو زەرەرو زیانانەی كە لێ ی دەكەوێتەوە كە دەكرێ بەهۆی خواردنی گۆشتەكەی بگاتە ڕادەی مردن و لەناوچوون، ئەوەتا توێژینەوە زانستی و پزیشكی یەكان سەلماندویانە كە بەراز جیا لە تەواوی گیانلەبەرانی دیكە بە گەورەترین مۆڵگەی ئەو میكرۆبانە دادەنرێت، كە زەرەو زیان بە لەشی ئادەمیزاد دەگەیەین، ئەو نەخۆشیانەی كە لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی بەراز دا سەرهەڵدەدەن ئەمانە خوارەوەن:

١- نەخۆشیە مشەخۆریەكان: لەوانەش ئەو نەخۆشیەی كە لە (كرمی لوولەیی) دا دروست دەبێت كە مەترسیدارترین كرمە بۆ سەر مرۆڤەكان.

وە (كرمی شریتی) كەدرێژیەكەی دەگاتە دە پێ ، هۆكارە بۆ شپرزییەكانی هەرسو كەم خوێنی....

هەروەها (كرمی ئەسكارس) كە هۆكارن بۆ هەوكردنی سی یەكان و داخرانی ڕیخۆڵەكان و هی دیكەش.

هەروەها (كرمەكانی ئەنگلستۆماو بەلهارزیاو دوسنتاریا) كە هۆكارن بۆ دروست بوونی خوێن بەربوون و كەم خوێنی و نەخۆشی دیكە كە دەبنە هۆی مردن.

٢- نەخۆشی یە بەكتریایەكان: وەكو سیلی سی یەكان و، كۆلێرا، تیفۆنید، بارا تیفۆئید، تای ماڵتاو هی دیكەش.

٣- نەخۆشی یە ڤایرۆسی یەكان: وەكو هەوكردنی دەماغ و، هەوكردنی ماسولكەكانی دڵ ، ئەنفلۆنزا ، هەوكردنی دەمە مانگاو هاوشێوەی ئەو.

٤-نەخۆشی یە میكرۆبیەكان: وەكو میكرۆبی (ئەلتۆكسۆ پلازما)

## ئیسلام كوتینی ( وشم ) حەڕام كردووە

(الوشم) تاتۆ: بریتی لە كوتین و نەخشێكی جێگیر كە لەسەر پێستی مرۆڤدا ئەنجام دەدرێت، بەزۆریش لەسەر ئەو شوێنانە دەبێت كە لەسەرتاپای لەش بەدەردەوەن، بەتایبەتی دەمو چاو، بۆ ئەنجام دانی ئەو كارە ماددەی ڕەنگاو ڕەنگ و ئەو ئامێرانە بەكاردەهێنرێن كەپێستی مرۆڤ كون كون دەكەن،



ناماخی یەكەمیش بۆ ئەو كوتینە سەرنج ڕاكێشانی كەسانی دیكەیە، هەروەها بۆ لایەنەكانی ئارایش و جوانكاریش بەكاردەهێنرێت، وادەبێ هەندێ جاران بە نەفسانەو خۆ پەرژین كردنی پڕوپووچ پەیوەندی دەبێت... وەكو ئەوەی كە چاوپیسی و حەسادەت ڕەت بكاتەوە.

كوتین و نەخشاندنی لەشی مرۆڤ زەرەرو زیانێكی گەورەی تێدایە، چونكە ئەوان لەبەر ئەو نەزانی و نەفامیەوە سەبارەت بەو ماددانەی كە لە بۆیەكردنی كوتینەكان بەكار دەهێنرێت، وەكو ماددە كیمیاویە ژەهراویەكانی بۆیەی ئۆتۆمبێل یا مەرەكەبی نووسین دەكوتن... ئەمە بێجگە لە مەترسیەكانی تووشبوون و گرتنەوەی نەخۆشیەكانی وەكو ڤایرۆسی (H.I.V) كە هۆكارە بۆ ئایدزو هەوكردنی جگەر یا تووشبوون بە نەخۆشیەكانی بەكتریایی كە لە ئەنجامی پـ بوونی دەرزی كوتینەوە پەیدادەبن. هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) (نەفرەتی لەو كەسە كردووە كە كوتینەكە ئەنجام دەدات و ئەوەشی كە كاری كوتینەكەی بۆ ئەنجام دەدرێت) (لعن الولشمة والمستو (رواه البخاري) .

# حەرام كردنی خواردنی خوێن

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت : ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ ا بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (الأنعام : ١٤٥)

واتە : (پێیان بڵێ: من نابینم و دەستم ناكەوێت لەوەی كە وحی و نیگام بۆكراوە هـ خواردنێكی حەرامكراو لەسەر ئەو كەسەی كەبیخوات ، مەگەر خواردنی مردارەوە بوو ،

خوێنێکی ڕژێنراو ، یان گۆشتی بەراز، بەڕاستی ئەو قەدەغەکراوە هەر پیسە ، یاخود (مالاتێك) کە لە سنووری شەرع دەرچووبێت لەسەربرینەکەیدا بەوەی کە ناوی غەیری خودای لەسەر برابێت، جا کەسێك ئەگەر ناچار کرا لەکاتێکدا داواکارو دەرچوو نەبێت و بەردەوام نەبێت و دووبارەی نەکاتەوە، ئەوە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لێخۆشبوو میهرەبانە).

هەروەها دەفەرموێت : ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ...﴾ (الأعراف : ١٥٧)

**واتە: (هەرچیەك کە پاك‌و چاکە بۆیان حەلاڵ دەکات و هەرچیشی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات).**

بێگومان کورە شیرینەکەم زانست سەلماندوویەتی بەشێوەیەکی وا کە هیچ بوارێکی بۆ گومان نەهێشتوتەوە کە ئەوخوێنانەی کە خودای پەروەردگار لەنێو گۆشتی گیانلەبەرانی داناوە میکرۆب و زەرو زیانێکی یەکجار زۆری هەلگرتووە، لێرەشدا کوڕی شیرینم دەرك بە حیکمەت و مەبەست و مەرامی شەرعی دەکەین لەو سەربڕینەی کە خودای گەورە بەر لەخواردنی گۆشتی گیانلەبەران فەرمانی پێکردووین، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەو سەربڕینەدا هەرچی خوێنی پیس و زیانبەخش هەیە دەردەچێتە دەرەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا کورە شیرینەکەم خوێنی ڕژێنراو بە لەوەڕ و مۆڵگەیەکی زۆربوونی میکرۆبەکان و گەشەکردنیان دادەنرێت ، هەروەها ئەو خوێنە هیچ ماددەیەکی خۆراکی لەخۆی ناگرێت، بەڵکو هەرس کردنی زۆر قورس و ئەستەمە...



## جگەرە کێشان

خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ...﴾ (الاعراف : لەئایەتی ١٥٧)

**واتە : (هەرچیەك پاك و چاکە بۆیان حەلاڵ دەکات و هەرچی یەکیشی کە پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات).**

کوری شیرینم بزانە ڕووەکی توتن ڕووەکێکە ژینگە سەرچاوەکەی ئەمریکایە، هەربۆیەش جیهانی کۆن ئەم

ڕوودەكەیان نەناسیوە، بێگومان دۆزەرەوانی كێشوەری ئەمریكای لەگەڵ خۆیاندا هێنایان، چاندنەكەیان بۆ پرتوگال و ئیسپانیا گواستەوە، پاشان وردە وردە دەستی بەبڵاوبوونەوە كرد لە ئەورووپاو مەغریب و توركیا و وڵاتانی دیكەی جیهان...هەروەها خەڵكییە هاردراویی یا دوكەڵی لە دوای سوتاندنی بەكاریدەهێنن، بەكارهێنەر لە شێوەی جگەرەدا دوكەڵەكەی هەڵدەمژێت، هەروەها جگەرە كێشان كاریگەری كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی مەترسیداری هەیە لەسەر منداڵانی نەوەی نوێ،كە لە بارو دۆخێكدا پێدەگەن بە دوای پێشەنگێك دا دەگەڕێن، ئەوەی لێرەدا جێ ی بایەخ پێدانمانە ئەوەیە كە هۆشداری بدەین لەبارەی ئەو دوژمنە ترسناكەی مرۆڤدا، چونكە دەبێتە هۆی زۆرێك لەنەخۆشییەكان لەوانەش :- (نەخۆشی دڵ و نەخۆشیەكانی سینگ و شێرپەنجە بەشێوە جیاوازەكانی) لەوانەش خراپتر ئەوەیە كەجگەرە كێشان دوژمنی یەكەمی هۆرمۆنەكانی مێینەیە، ئەمەش مانای ئەوەیە كە ئافرەت بەرە بەرە بەرەو نێرەمووكی دەگۆڕێت، هەرچی بەركەوتی منداڵەكەیەتی لەنەخۆشی و زیان ئەوەیە كە هەر لە ڕۆژانی بەرایی دا تووشی نەخۆشی یە جۆربەجۆرەكانی هەستیاری و سینگ دەبێت ئەمەش لە ئەنجامی درێژی مانەوەی لە گەڵ دایكی دا.

ڕاپۆرتێكی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی دەڵێ : بێگومان جگەرە كێشان بەهاتنی ساڵی (٢٠٢٠ز) ساڵانە (١٠ ملیۆن) كەس دەكوژێت كە (٧) ملیۆن كەسیان لە جیهانی سێ یەمە ، لەبەر ئەوەی ڕێژەی ئەوانەی جگەرە دەكێشن لە وڵاتە گەشەسەندووەكان ساڵانە بەتێكرایی (٧،٢) لە سەد زیادی كردووە، لەكاتێكدا تێكرای جگەرە كێشان لە وڵاتە پێشكەوتووەكان بەرێژەی (٨،١) لەسەدا كەم دەبێتەوە.

هەروەها توتن بەچوارەمین كاڵای جیهانی دادەنرێت كە سێ یەكی كۆمپانیاكان قۆرخیان كردووە كە ساڵانە نزیكەی (٤) ملیار دۆلار لە ڕێكلام و بانگەشە بۆ كردنی خەرج دەكەن ئەمەش بۆ برەو دان و بازار خۆشكردنی ئەو كاڵایە ی كە زیان بە تەندروستی دەگەیەنێت.

ڕاپۆرتەكە لەبارەی مەترسی زیانەكانی جگەرەكێشان هۆشداری داوە كە لەساڵی (١٩٩٠) دا لەنێوان هەر (١٢) كەسێكدا، بووەتە هۆی مردنی تاكە كەسێك و لەساڵی (٢٠٢٠ز) دا جگەرە كێشان دەبێتە هۆی مردنی كەسێك لەنێوان هەر (١١) كەسێك دا ! ئایا كەس هەیە پەند بگرێت؟!

# سەگ و میکرۆب و گڵ




※ لە ئەبو هریرەوە(خـوا لـێ ی رازی بـێ) دەڵـێ : پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) دەفەرمووێت : (طهور اناء احدكم اذا ولـغ فيه الكلب أن يغسله سـبع مـرات أولاهـن بـالتراب) . (رواه مـسلم) واتـە : (پـاك بوونەوەی قاپی یەکێکتان ئەگەر سەگ لێ ی خواردبێتی بەوە ئەوەیە حـەفت جـاران بیشوات کەجاری یەکەمیان بەگڵ بێت) وە (ولـغ) : واتـە ئەگـەر بـەزمانی لێـی خواردەوە.

کورە شیرینەکەم لەڕووی زانیستی یەوە سەلماوە کە سەگ گوێزەرەوەی هەندێ نەخۆشی ترسـناکە ، چونکە لە نێو ڕیخۆڵەکانی دا کرمێك بەناوی (مکورە) دەژی و گەراکانی لەگەڵ پاشەڕۆی سەگەکە دێتە دەرەوە، کاتێك پاشەڵی خۆی بەزمانی دەلیسێتەوە ئـەو گەرایانـە بـۆی دەگوازرێتـەوە، پاشـان لـەوێوە دەگوازرێتەوە بۆ ناو کاسەو قاپ و دەستی خاوەنەکانیان، لەوێشەوە دەچـنە نێـو گـەدەو ڕیخۆڵـەکانیان ئینجا لەوێدا گەراکان دەتـروکێن و کرمۆڵەکـەکانیان لێ دێنـە دەرەوە و درز دەکـەن بـۆ نـاو خـوێن و بەڵغەمەوە و ، لەوێوە بۆ ناو تەواوی لەشدا دەگوازرێتەوە، بەتایبەتی بۆ ناو جگـەر چـونکە پاڵاوگـەی سەرەکی یە لە نێو لەشدا.

پاشان لەنێو ئەو ئەندامەی کە دەچێتە ناوی گەشە دەکات و تورەگەیـەکی پـڕ لـەو کرمۆماکانـەو ئاوێکی سازگاری وەکو ئاوی کانی دروست دەکات. ئەو تورەگەیە گەورە دەبێت هـەتا بەقـەدەر سـەری کۆرپەلەیەکی لێ دێت، ناودەبرێت بە نەخۆشی: تورەگەی ئاوی، نیـشانەکانی بـەگوێرەی ئـەو ئەندامـە دەبێت کە لە ناویدا دابەش دەبێت، ترسناك ترینیان ئەوەیەکە لە ناو مێـشکدا یـان ماسـولکەی دڵـدا دروست دەبن، هیچ چارەسەرێکیشی نیە تەنیا بەکرداری نەشتەرگەری نەبێ..

هەروەها لێرە نەخۆشی یەکی ترسناکی دیکە هەیە کە سەگ دەیگوازێتەوە، ئەویش بریتی یـە لـە

دەردە سەگ(هاربوونی سەگ) کە دەبێتە هۆی گرتنی تایەکی ئارەقەدار، کە یەکەمین جار سەگەکە توشی دەبێت ، پاشان لەرێگەی لیکی سەگەکەوە بەهۆی گەستن یاخود بە هۆی لێستنەوەی برینێك لەلەشی مرۆڤەوە لێوەی دەگوازێتەوە.. کەواتە سوودەکانی سەگ بۆ چەند کەسێکە، بەڵام زەرەرو زیانەکانی هەموومان دەگرێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە کوشتنی سەگ کردووە، پاشان رێی دا کە سەگی ڕاوکردن و کێڵگە و ئاژەڵەکان بەخێوبکرێت، ئەمەش لەبەر ڕەچاو کردنی ئاتاج بوون بە و جۆرە سەگانەوە.

هەروەها زاناکان لەچەرخی نوێدا هەڵسان بەشیکردنەوەی گڵ و خۆری گۆڕەکان بۆ ئەوەی بزانن میکرۆبەکانی ناوی چ جۆرە میکرۆبێکن، لەو بڕوایە دابوون کە زۆرێك لە میکرۆبە زیانبەخشەکانی تێدا بەدی بکەن، ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆرێك لە مرۆڤەکان بەنەخۆشییەکانی میکرۆبەکان دەمرن، بەڵام ئەوان هیچ شوێنەوارێکی ئەو میکرۆبە زیانەخشانەیان لەنێو ئەو گڵ و خۆڵە بەدی نەکرد.... لەمەشدا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کەوا گڵ و خۆڵ تایبەتمەندی کوشتنی میکرۆبە زیانبەخشەکانی هەیە، بەراستیش هەروایە چونکە ئەو میکرۆبانەی کە لەنێو لیکی سەگدا هەیە، ناتوانرێت بکوژرێن و لاببرێن مەگەر بەوە نەبێت لە نێو گڵ دابنرێن و نقوم بکرێن، هەروەها هەر بۆ ئەم مەبەستە تاقیکردنەوەیەك لەزانکۆی ئەمریکی دا لە وڵاتی لوبنان ئەنجام دراو ئەنجامەکەشی هەر ئاوا دەرچوو کە باسمان کرد.

## مێشـــوولە



خـوای گـەورە دەفـەرموێت :﴿ إِنَّ اللَّـهَ لاَ يَسْتَحْيِي أَن يَضْرِبَ مَثَلاً مَّا بَعُوضَةً فَمَـا فَوْقَهَـا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَـقُّ مِـن رَّبِّهِـمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّـهُ بِهَـذَا مَثَلاً يُضِلُّ بِهِ كَثِيراً وَيَهْدِي بِهِ كَثِيراً وَمَا يُضِلُّ بِـهِ إِلاَّ الفَاسِقِينَ﴾ (البقرة:٢٦)

واتە: (بەڕاستی خوا بـاکی نییـە و نـەنگ نییە بە لاییـەوە هـەر نموونەیـەك بهێنێتـەوە بـە مێشوولەیەك ، لە ویش بچووکتر بێت یان گەورەتر، جا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناو، ئەوە چاك

**دەزانن ئەو نمونەیە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوە، ئەوانەش کافری بێ باوەڕن دەڵێن : خوا مەبەستی چی بوو لەم نمونەیەدا!؟ زۆرێکی پێ گومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنمویی دەکات ، بەڵام دیارە جگە لە لارو وێرو یاخی و تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکات).**

وەزارەتی تەندروستی عەرەبستانی سعودی لە (١٧ی سێبتێمبەری ساڵی ٢٠٠٠ز) گیان لەدەست دانی (١٦) کەسی لە ئەنجامی تووشبوون بە نەخۆشی تای (دۆڵی شەق) لە ناوچەی جازان ڕاگەیاند ..

بەهۆیە وەش سعودیا دەستی بە هەڵمەتی هۆشیارکردنەوەو گرتنەبەری ڕێ و شوێنی خۆپارستن کرد، لە بنەڕەتدا بۆ لەناوبردنی تاوانباری یەکەم بوو کە هەڵگری ئەو جۆرە ڤایرۆسەبوو، کە مێشوولە بوو...

بەم جۆرە کوری شیرینم مێشوولە لە هەموو کاتێکدا ترسناکی خۆی لە ژیانی مرۆڤدا ڕادەگەیەنێت‌و، ئەگەر چی لەبەر بەکەم زانراوە، بەڵام چەند جۆرە ڤایرۆس و مشەخۆرێك دەگوازێتەوە کە تووشی مرۆڤ و گیانلەبەران دەبن ، هۆکارن بۆ چەندین جۆر پەتای ژینگەیی کە ملیۆنەها خەڵکیان گرفتار کردووە، کە واتە مێشوولە ئەگەر چی بەقەبارە بچووکە ئەوە بەکەم دەزانرێت، بەڵام گرنگییەکی یەکجار گەورەی هەیە، ئەمەش لەبەر ئەو کاریگەرییە لەناوبەر ، ئەو نەخۆشیانەی کەدروستی دەکات هەروەکو باقی زیندەوەرە بچووك و ترسناکەکانی دیکەی وەکو: مشەخۆرو کەڕووەکان ، بەکتریاو ڤایرۆسەکان.

هەروەها مێشوولە نموونەیەکە لەسەر چاودێری و تواناداری خودای گەورە و زانستی بەهەموو بەدیهێنراوەکان و دروست کراوەکان.

ومێشوولە بە هۆی وبچووکی وایکردووە خەڵکی بەکەمی بزانن، بەر لەوەی مەترسیەکەی ئاشکرا بکرێت، خودای گەورە توانای ئەوتۆی پێ بەخشیوە بەشێوەیەك کە هیچ کەسێك ناتوانێت بەسەری دا زاڵ بێت، قەددغەی بکات، هەتا ئەگەر ئەو کەسە دەستەڵات داریش بێت.

هەروەها کورە شیرینەکەم مێشوولە لەگەڵ بچووکی قەبارەی و لاوازیدا زۆر بەجوانی و وردی دروست کراوە، مرۆڤ دەستە وەستان دەکات لەوەی پەی بە وەسفی ببات، لەگەڵ ئەوەشدا دڕکی لمـوزی ئەگەر چی ئەرمە دەباتە نێو پێستی گامێش و فیلەوە، بەبێ ڕێ پیشاندەریش ڕێی چوونە نێو پێست بەدی دەکات، ئەم کارەش لە توانای هیچ مرۆڤێك دا نییە.

ئەمەش بۆ ئەوەی خودای گەورە توانا سەرسوڕهێنەرەکانی خۆی و لاوازیمان لە بەرامبەر لاوازترین دروستکراوەکانی خۆیمان پیشان بدات.

## فەرموو لەگەڵ هەندێك لە نهێنیەكانی:

١-نێرەی مێشوولە خۆراكی لەسەر شیلەی گوڵەكانە و ، خۆراكی خۆی لــە خوێنــەكان وەرناگرێـت وهیچ رۆڵێكیشی لە پیوەدان و گازگرتنەكاندانیە، بەڵام مێیەكەی دەمی وا سازانراوە كـە پێـستی ئـەو مرۆڤ و گیانلەبەرانە كون بكات كە خوێنەكانیان گەرمە بۆ ئـەوەی خـۆراكی خـۆی لێیانـەوە بەدەسـت بهێنێت تاكو گەراكانی دروست بكات.

٢- مێیەكە شلەكان لە لیكەرژێنەكەیدا بەسەر برینەكە دا دەرێژێت و دەبێتە هۆی ئاوسان و خوێن تێ زانی ، هەروەها ناهێڵێت خوێنەكە (بمەیی) پەیت بێت، وای لـێ دەكـات كـە بەئاسـانی دەربێـت و بچێتە ناو دەمیەوە بۆ ئەوەی نەمەیێت. ئەگەر هاتوو مێیە ی مێشوولە كـە هـەڵگری ئەومیكرۆبانـە بوو كە نەخۆشیان دروست دەكرد، ئەوا بۆ ئەو كەسەی دەگوازێتەوە.

٣- مێشوولە هەروەكو مێرووەكانی دیكە لەسەرو سـینگ و سك پێك دێت ، سـێ جـووت قاچـی درێژو لاواز، دووباڵ لەگەڵ دوو باڵۆچكەی دیكەی باریكی لەم لاو لەو لا هەیە كە وەكـو ئەندامـەكانی ڕاگرتنی هاوسـەنگی بەكاریان دەهێنێت..

٤- مێشوولەیەكی تەواوی پێگەیشتوو (١٠٠-٤٠٠) گەرا دادەنێت و دنیامیكیـەتی هاوسـەنگی ژینگەیی وادەكات كە ژمارەیەكی كەمیان بتوانن سوڕی ژیانیان تەواو بكەنو بگەنە قۆناغی پێگەیشتن، كەلـە هەنـدێك جۆریانـدا دەگاتـە(٧-١٠) رۆژ، مێـشوولەكان دوو هەفتـە دوای دانـانی گـەراكان، بێچووەكانیان دەبێت و ئەمەش لەكاتێكدا ئەگەر ئاو فەراهەم بێت چونكە ئـاو پێویـستە بـۆ تروكـانی گەراكان و ژیانی كرمۆكەكان.

٥- تێكرای بزواندنی باڵەكانی دەگاتە نزیكـەی (٦٠٠) جـار لەچـركەیەكدا، بزوانـدنی باڵـەكانی مێیەی مێشوولەیە ئەو گزە گزە باوە پەیدا دەكات.

# مێــش



* لە ئەبو هوریرە وە(خوا لیّ ی رازی بێ) دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویّت: (اذا وقع الذباب في شراب احدكم فليغمسه ثم لينزعه، فأن في احدى جناحيه داء والاخرى شفا) . (اخرجه البخاري وأحمد)

واتە ئەگەر مێش کەوتە نێو خواردنەوەی یەکێکتان بانقوومی بکات ئینجا دەری بهێنێت و فڕێ ی بدات ، چونکە لەباڵێکیاندا نەخۆشی هەیەو لە ئەوەی دیکەیاندا شیفاو چارەسەری).

ئەو فەرموودەیە لە موعجیزە پزیشکی یە کانی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، پێویستە مێژووی پزیشکێتی بەپیتی ئاوزێڕ بۆی تۆمار بکات، پێغەمبەر(ﷺ) باسی هۆکاری نەخۆشی و هۆکاری شیفاو چارەسەری کردووە لەسەر هەردوو باڵەکانی مێش دا هەڵگیراون، ئەمەش بە چواردە سەدە بەر لە دۆزینەوەیان ..

تاقیکردنەوە زانستی یە تازەکان نهێنی یە شاراوەکانی نێو ئەو فەرموودەیان سەلماندوە، ئەویش ئەوەیە: کە یەکێ لە باڵەکانی مێش تایبەتمەندیەتی ئەوەی هەیە، کە (بەکتریا) بەسەرخۆیەوە هەڵدەگرێت جا ئەگەر مێشەکە کەوتە نێو خواردنەوەیەك یاخود خواردنێك، ئەوا ئەو میکرۆبانەی کە هەڵی گرتوون بەقاچەکانی دەیانخاتە نێو ئەو خواردنەوەیە یان خواردنە..

نزیکترین ڕێگەش بۆ لەناوبردنی ئەو میکرۆبانەش ئەوە یە کە تەواوی لەشی مێشەکە تیایاندا نقوم بکرێت و پاشان فڕێ بدرێت ، ئەمەش بەسە بۆ کوشتنی ئەو میکرۆبانەی کە بە مێشەکەوە بووینە، هەروەها بەسیشە بۆ بەتاڵ کردنەوەی کاریگەریان...

هەروەك چۆن لەڕووی زانستی یە وە سەلماوە کە مێش تەنۆلکەی بچووك لە شێوەی ئەنزیم دەردەدات کە ناو دەبرێت بە (باکتریۆڤاج) واتا ڕاوکەری میکرۆبەکان ، ئەو (بەکتریۆڤاج)ە یا هۆکاری شیفاو چارەسەریە قەبارەی بچووکە، درێژییەکەی بە (٢٠-٢٥ملی مایکرۆن) دەخەملێنرێت، جا ئەگەر

مێشەکە کەوتە ناو خواردنەکە یاخود خواردنەوەکەوە، پێویستە لەناوی نقوم بکرێت، بۆ ئەوەی ئەو دژە تەنانە دەربچن کە بەزۆری لە باڵی دووەمی مێشەکەوە دەردەچن، ئەوکاتە ئەو میکرۆبانە هەڵی گرتوون و گواستیویەتی یەوە.

ئینجا کوری شیرینم ئەوەتا زانست ئەوەی کە پێغەمبەر(ص) هەواڵی لە بارەیەوە داوە، چەسپاندویەتی و بەشێوەیەکی ئیعجازیانە ڕاستی پێغەمبەرێتی ئەو پێغەمبەرەی سەلماندوە..

## ( تا ) و چارەسەرکردنی



لە بەر چەند هۆیەك پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ بەرز دەبێتەوە، لەوانە ئەگەر هاتوو تووشی حەوکردنی میکرۆبی یاخود ڤایرۆسی بێت ، جا ئەگەر ئەو پلە گەرمی یە بەرزبۆوەو گەیشتە (٤١) پلەی سەدی، ئەو کاتە پێویستە بە زووترین کات پلەی گەرمی یەکە دابەزێنرێت، هەتا ناوەندی پلەی گەرمی لە مێشکدا ڕێك دەخرێت، لەشیش دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی.

ئەو بەرزبوونەوە لەناکاوەی پلەی گەرمیی بە(تا) ناسراوە، پێغەمبەریش (ﷺ) لە ژمارەیەك لە فەرموودەکانی دا وەسفی چارەسەریەکی پێغەمبەرێتی بو دابەزاندنی ئەو پلە گەرمیی یە بەرزەی کردووە، ئەوەتا داوای بەکارهێنانی ئاوی ساردی کردووە بۆ دامرکاندنەوەی گڕی تای گەرم کە لەناو لەشی نەخۆشدا پەرەدەسێنێ .

ئیمامی موسلیم و بوخاری لە خاتوو عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێ) ئەو ویش لە پێغەمبەرەوە(ص) گێراویەتی یەوە کە دەفەرمووێت: (الحمى من فيح جهنم فأبردوها بالماء) واتە : (تا) بەشێکە لە گڕی دۆزەخ کەوابوو ئێوەش بە ناو ساردو فێنکی بکەنەوە). هەروەها کاتێك پێغەمبەر

(ﷺ) لەنەخۆشی سەرە مەرگی دا تایەكەی توندبوو، فەرمانی كرد كە حەوت كوندە ئاوی لە حەوت بیراندا بەسەری دابڕێژن. (رواه البخاري). لەگەڵ ئەوەی هۆكارەكانی چارەسەركردنو جۆرەكانی دەرمان ودژە تەنەكان لەو سەردەمە، هەنگاوی یەكجار گەورەی هاویشتووە، بەلام چارەسەری پێغەمبەرێتی لە و حاڵەتەدا هەر ئەو چارەسەری سەركەوتوو نموونەیی یە ، ئەوەتا لە زۆرێك لە حاڵەتەكاندا پلەی گەرمی نەخۆش بە شێوەیەك بە رزدەبێتەوە دەرمانی دابەزاندنی پلەی گەرمیی كاریگەری بۆ سەری نابێت ، بۆیە پزیشكەكان پەنادەبەنە بەر بەكارهێنانی ئاوی ساردو فێنك بۆ دابەزاندنی پلەی گەرمی و گەڕانەوەی بۆ باری ئاسایی خۆی.

بۆیە پزیشكەكان ئامۆژگاری كەس و كاری منداڵەكان دەكەن لەكاتی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی لەشیان، دەست بەجێ جل و بەرگیان لەبەر دامالن و ، ئاوی ساردو فێنكیان بەسەر دا بپرژێنن، و لەفاف و پەرۆكی تەڕو فێنكیان بەدەم وچاوو دەست و پێیان دابهێنن.

هەروەها ئەوەی لە ڕووی زانستی یەوە سەلماوە، سونەتیش پشت ڕاستی كردۆتەوە ئەوەیە ئەو تایەی كە تووشی مرۆڤ دەبێت چەند سوودێكی هەیە ، ئەوەتا سەلماوە كاتێك كە نەخۆش تووشی تا دەبێت ڕێژەی ماددەی (ئەنتەرفیرۆن) بە ڕیژەیەكی گەلێك زۆر زیاد دەكات، ئەم ماددەیەش خڕۆكە سپی یەكانی خوێن دەردەدەن و دەتوانێت ئەو ڤایرسانە لەناو ببات كە هێرشیان كردۆتە سەر لەش،وایلێدەكات توانای دروست كردنی دژە تەنە پارێزەرەكانی زیاتر بێت، ئەمە تەنیا لەش لە ڤایرۆس و بەكتریاكان رزگار ناكاتو بەس ، بەڵكو بەرگری لەش لە بەرامبەر نەخۆشییەكان زیاتر دەكات، یاریدەی لەناوبردنی خانەی شێرپەنجەیی دەدات لە حاڵی دروست بوونی دا، لە ئەنجامیشدا لەش لەسەرهەڵدانی هەر خانەیەكی شێرپەنجەیی دەپارێزێت كە دەكرێ ببێتە هۆی تووشبوون بەنەخۆشی شێرپەنجە ، هەر بۆیەش هەندێ لە پزیشكەكان دەڵێن : بێگومان ئێمە لەزۆرێك لە نەخۆشیەكان دڵمان بەتایەكەی خۆش دەبێت، هەروەكو چۆن نەخۆش دڵی بەچاك بوونەوەی خۆش دەبێت، چونكە ئەو تاییەی كە گرتوویەتی سوودی بۆی گەلێ زۆرترە لەخواردنی دەرمان، وەكو نەخۆشی رۆماتیزمی جومگەیی كە تیایدا جومگەكان رەق دەبن و ای لێ دێت توانای بزاوتنیان نامێنێت ، ئەوەتا یەكێ لە ڕێگا چارەسارییە پزیشكیەكانی كە لە نموونەی حاڵەتێكی ئاوادا بەكاردەهێنرێت چارەسەركردن بە تای دەست كردە، ئەویش ئەوەیە كە لەرێگەی شرونقە لێدانی ماددەیەكی دیاریكراو نەخۆش دەخەنە حاڵەتی تاگرتنەوە.

هەر لەبەر ئەمەش کاتێك باسی تا لەلای پێغەمبەری خودا (ﷺ) دا کرا پیاوێك جنێوی پێدا، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو : (لاتسبَّها فانها تنفي الذنوب كما تنفي النار خبث الحديد).

واتە : (جنێو بەتا مەدە چونکە گوناهەکان لادەبات، هەروەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لادەبات).

سەلات و سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەری ڕحمەت بێت کە نەخۆشیی دەست نیشان کردووەو چارەسەریشی بۆ داناوە.

## ئــــاو خـــواردنـــەوە



ئیمامی موسلیم و بوخاری لە ئەنەسەوە (خوا لێ ی رازی بێت) ریوایەتیان کردوە : (کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك ئاوی لەنێو جامێك بخواردباوە سێ جاران هەناسەی دەدا) دەیفەرموو : (هو اروى وامرأ وابرأ) واتە : (بەم شێوەیە تێر ئاوتر دەبی و زیاتر لە ئازاری و تێنیۆتیی رزگار دەبی)، مەبەستیش لەمە ئەوەیە ئەو شێوە ئاوخواردنەوەیە بە گیانتان دەکەێت و نۆشی دەکەن و سەلامەت دەبن لە نەخۆشی یا تێنوێتی یائازار.

### هەندێ لە زاناکان دەڵێن :

قەدەغەکردنی هەناسە خواردنەوە لەنێو ئاوی خواردنەوەدا، وەکو قەدەغەکردنی فووکردنە لەخواردن و خواردنەوە، ئەمە ش لەبەر ئەوەی ئەودك شتێك لە لیکی ئەو کەسە بکەوێتە ناو خواردن و خواردنەوەکە ئەو کاتە کەسەکە وازی لێ دەهێنێت و قێزی لێ دەکاتەوە، ئەمەش لە کاتێکدا ئەگەر لەگەڵ کەسانی دیکە دەیخوارد و دەیخواردەوە..

بەڵام ئەگەر بەتەنیا دەیخوارد یاخود لەگەڵ کەس و کاری خۆی دا بوو، یاخود لەگەڵ کەسێك دابوو کە دەیزانی قێزی لە خواردن و خواردنەوەکە ناکات ئەوە قەیدی ناکات.

زانایانی پێشووی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەیە لیٚ ی تێگەیشتبوون..

بەلاّم زانستی نویٚ دەلیٚ : بێگومان هەناسە دان بریتی یە لە هەناسە هەلّكێشان و هەناسە دانەوە، لە هەناسە هەلّكێشان دا هەوایەكی پاك و پڕ لە ئوكسجین دەچێتە ناو سی یەكانەوە تاكو وزەی پێویست بۆ لەش دابین بكات، لە هەناسە دانەوەش هەوایەكی پڕ لە گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لەگەلّ كەمێك لە ئۆكسجین و هەندێك پاشەڕۆی بەهەوا ڕۆیشتووی لەش كە لە ڕێگەی سی یەكانەوە بەشێوەی گاز دەردەچنە دەرەوە، زۆری ئەم گازانە هەندیٚ جار دەبنە هۆی دروست بوونی هەندیٚ نەخۆشی وەكو لە ژەهراوی بوونی میزدا بەدی دەكرێت.. هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە فوو لە خواردن و خواردنەوە بكرێت.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەكاری هەناسە خواردنەوەی لە كاتی ئاو خواردنەوە دا بۆ مەبدەئێكی گرنگ ڕێنوێنی دەكات، چونكە دیارە ئەو كەسە ی ئاو بەیەك جار هەلّدەقوڕێنیٚ ناچار دەبیٚ كە هەناسەی خۆی سەركوت بكات، هەتا لە ئاو خواردنەودكە دەبێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕێگەی ئاو خواردنەوەو ڕێگەی هەوا لە لای قوڕگەوەیەو ناتوانن هەموویان بەیەكەوە تێپەر بن ، بۆیە هەردەبیٚ یەكیان بوەستیٚ هەتا ئەوەی دیكە تیدەپەڕێت.

كاتێك مرۆڤ هەناسەی خۆی بۆ ماوەیەكی درێژ ڕادەگرێت هەوا لەنێو هەردوو سییەكان قەتیس دەبیٚ و ئەو كاتە دەست بەفشار خستنە سەر دیواری سی یەكان دەكات و دەبێتە هۆی فرەوان بوونی و بەربە رە جیری خۆی لەدەست دەدات، زیانەكەشی دوای تێپەڕینی ماوەیەك بەدیار دەكەوێت، ئەو كاتە مرۆڤ تووشی (هەلاّوسانی سی یەكان) دەبێت و بەكەمترین خۆ ماندوكردن هەناسەی تەنگ دەبێت، هەردوو لێوو نینۆكەكانی شین هەلّدەگەرێن .. كە ئەمەش نەخۆشی یەكی ترسناكە.

پاشان بێگومان ئاو خواردنەوە و چێشت خواردن بە دانیشتنەوە دروست و ساغ و سەلامەت ترو بەسوود ترە، چونكە ئەوەی كە ئاوخۆرەوە و نان خۆر دەیخوات و دەیخواتەوە لەسەر خۆو بەنەرمی بەدیوارەكانی گەدەدا دێنە خوارەوە. بەلاّم هەرچی ئاو خواردنەوە بە ڕاوەستانەوەیە ئەوا دەبێتە مایەی ئەوەی كە شلەكە زۆر بە توندو تیژی بكەوێتە نا قولاّیی گەدەوە و زەبری لیٚ دەدات، دووبارەكردنەوەی ئەو كارە بە تێپەڕینی ماوەیەكی درێژ دەبێتە هۆی خاوبوونەوەی گەدەو هاتنە خوارەوەی و لەدوایشدا تووشی بەد هەرسی دەكات.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە ئاو بە ڕاوەستانەوە بخورێتەوە.

بەلاّم كە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوی بەڕاوەستانەوە خواردۆتەوە، ئەمە لەبەر حالّەتی ناچاری بووە كە

ڕێگەى دانيشتنى لێ گرتووە وەكو ئەو قەرەباڵغى و ئاپۆرەى خەڵكى لەكاتى بە ئەنجام گەياندنى دروشمە پيرۆزەكانى حەج و عومرە، نەك كردبيتيە نەريتى بە ردەوامى خۆى.

كۆرى شيرينم مرۆڤ لەكاتى وەستان دا لەبارى گرژى دا دەبێ و كۆ ئەندامى هاوسەنگى لەنێو ناوندە كۆئەندامە دەمارردا لەبارى كاريگەريەكى توندا دەبێت، تاكو بتوانێت كۆنترۆڵى تەواوى ماسولكەكانى لەش بكات، بۆ ئەوەى كردارى هاوسەنگى و لەسەر پێ وەستان ئەنجام بدات، كەبريتى لە كردارێكى ورد كەوا كۆئەندامى دەمارو ماسولكەيى پێكەوە لەيەك كاتدا بەشدارى تێدا دەكەن كە وا لە مرۆڤ دەكەن نەتوانێت دڵنيابوونى ئەندامى، كەبە گرنگترين مەرجەكان دادەنرێت كە دەبێ لە كاتى خواردن وخواردنەوە هەبێ، بەدەست بهێنێ، ئەم دڵنيا بوونە مرۆڤ لەبارى دانيشتندا بە دەستى دەكەوێت نەك لەبارى ڕاوەستاندا.

## سيواك



كورى شيرينم بزانە (سيواك) لە درەختێكە بە ناوى (ناراك)و ناوە زانستيەكەشى (سلڤادورا برسيكا) يە، ئەو درەختە لە چەندين ناوچەى دەوروبەرى مەككە و ناو شارى مەدينە و ولاتى يەمەن و ئەفريقيا دەڕوێت.

درەختێكى باڵا كورتە، تيرەى قەدەكەى لە پێيەك زياتر نابێ، گەڵاكانى گەشاوەن و لقەكانى لوول خواردوون و ڕەنگەكەشى قاوەييەكى كاڵە، ئەو بەشەى كە بەكاردێت بريتى كرۆكى ڕەگەكەى، بۆ بەكارهێنانيشى وشك دەكرێتەوە، پاشان لە شوێنێكى دوور لەشێدارى دەپارێزرێت، پێش بەكارهێنانى بەهۆى نامێرێكى تيژى وەك چەقۆ دەتەنجێنرێت و پاشان بە ناو نەرم دەكرێتەوە ئينجا بەكار دەهێنرێت.

لەكاتى شيكردنەوە لەڕووى كيمياوييەوە هەبوونى ئەو ماددانە ى خوارەوەى تيادا سەلماوە:

١- ماددەى ڕيشاڵى تفت لەوانەيە سلڤاروورين بێت.

٢- ترايمسيلى ئەمين.

٣- ڕێژەيەكى بەرز لە كلۆريد وفلۆريدو سيليكا.

٤- كبریت .

٥- ڕێژەیەكی كەم لەماددەی سابوونین و تانین و فلافونید.

٦- ڕێژەیەكی گەلێ زۆر لەماددەی سیتۆستیرۆڵ.

هەروەكو چۆن ئێمە هەست بە مەزنیەتی كاری پێغەمبەر (ﷺ) دەكەین لە سیواك كردن وەكو دەفەرمووێت: (السواك مطهرة للفم مرضاةٌ للرب) (رواه أحمد وهو صحيح). واته : (سیواك دەم خاوێن دەكاتەوە و دەبێتە مایەی ڕازی بوونی پەروەردگار یش).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە شە و یاخود لەڕۆژ نوستبا كاتێك هەڵدەستایەوە سیواكی دەكرد، هەروەها هانی ئومەتەكەشی داوە كە لە سیواك كردندا بەردەوام بن و دەست بەرداری نەبن ، وەكو دەفەرمووێت: (لولا أن اشق علی امتی لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة). واته : (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبا كە نەوەك ئومەتەكەم بكەونە زەحمەت و ناخۆشی ئەوا فەرمانم پێدەكردن لەگەڵ هەموو نوێژەكان سیواك بكەن).

هەروەها پێغەمبەری خوا وەكو لە هەردوو سەحیحیاندا هاتووە : ئەگەر بۆ شەو نوێژ هەستا بوایە ئەوا سیواكی لەدەمی خۆی وەردەدا. هەتا لەكاتی بەڕۆژوبوونیشدا هانی داوین و سەرنجی ڕایكێشاوین بۆ ئەوەی پەیوەست بین بە سیواك. ئەمەش لەبەر ئەو سوودە مەزنانەی كە بۆ دەم و ددانەكان هەیەتی. لەم سوودانەش ئەمانەی خوارەوەن:

١- لەناو بردنی میكرۆبەكان، بە توێژینەوەیەی پزیشكی سەلماوە سیواك بەلایەنی كەم پێنج جۆر میكرۆبی نەخۆشی لەناو دەبات، ئەوەی كە لەناو دەم هەیە گرنگترینیان بەكتریای ملوانكەییە.

٢- ڕادانی پاشماوەی خواردن، لابردنی زەردێتی ددان، ڕەونەقداركردنی ددانەكان.

٣- پاكردنەوەی دەم بە كوشتنی میكرۆبەكان و چارەسەركردنی برینەكانی پووك و هەوكردنەكانی.

٤- ڕێ گرتن لە گەشەكردنی میكرۆبەكان بەزیادكردنی ترشێتی دەم، كە هەلی گەشەكردنی ئەم میكرۆبانە كەم دەكاتەوە، كە بە ژمارەیەكی گەورە لە نێو دەم بەدی دەكرێن.

٥- مۆڵگەی میكرۆبەكان لادەبات، بەر لەوەی پەرەبسێنن و كاریگەری بكەنە سەر شانەكان.

٦- دەم و ددانەكان لەنەخۆشیەكان دەپارێزێت.

٧- هەروەها سەلماوە سیواك كاریگەری هەیە لەسەر دابەزاندنی ڕێژەی شەكرو كاریگەری دژە شێرپەنجەشی هەیە.

# ئاوی زەم زەم

*لەوانەیە بپرسن كە ئاوی زەم زەم لەگەڵ ئاوەكانی دیكە جیاوازی هەیە؟ بەڵێ كورە شیرینەكەم، ئاوی زەم زەم لەرووی پێكهاتنەوە لەگەڵ ئاوەكانی دیكەدا جیاوازی هەیە، ئەوەتا ماوەیەكی زۆر پێش ئێستا هەندێ لە توێژەرە پاكستانیەكان ئەم ڕاستی یە یان سەلماند، هەروەها ناوەندی توێژینەوەكانی حەجیش هەستان بەلێكۆڵینەوە ئاوی زەم زەم، دیتیان ئاوی زەم زەم ئاوێكی سەرسوڕهێنەرو لە گەڵ ئاوەكانی دیكە جیاوازی هەیە.

ئەندازیار (سامی عەنقاوی، بەرێوەبەرو سەرۆكی ناوەندی توێژینەوەكانی حەج) دەڵێ: كاتێك ئێمە خەریكی هەڵكەندنی بیری ئاوی زەم زەم بووین، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بۆ كەعبە فراوانی بكەین ، هەرچەندی لە ئاوی زەمزەمان دەبرد ئەوەندەی دیكە زیادی دەكرد.

سێ ترومپای ئاومان بەگەڕ خست تاكوو ئاوی زەم زەمەكە لاببەین بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانین بناغەكانی دابنێین.

پاشان هەستاین بە لێكۆڵینەوە لەسەر ئاوی زەم زەم هەر لە سەرچاوەكەی خۆی بۆ ئەوەی بزانین میكرۆبی تێدا هەیە؟ ئەوەبوو بۆمان بەدیار كەوت كە تەنیا یە ك میكرۆبیش چییە بەدی ناكرێت!!

ئاوێكی پاك و بێگەردە، بەڵام ئەوكاتە تووشی جۆرە پیس بوونێك دەبێت كە جام یان بۆریەكانی ئاو یا دۆلكەی لێ بەكاردەهێنرێت، واتە بەهۆی شتێكی دیكەوە پیس دەبێت، بەڵام بەخۆی ئاوێكی پاك و بێگەردە و هیچ شتێكی تێدا نیە.

لە تایبەتی یەكانی ئاوی زەمزەم ئەوەیە كە تۆ بەبەردەوامی لەمەككە دا دەیبینی .. بەردەوام هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بگرە هەتا ئەمرۆش بەبێ پچران هەڵدەقولێت و ئاودەبەخشێت .. بەڵام هەرچی بیرەكانی دیكەیە وەكو دەزانین زۆر بەردەوام نابێت ! پاشان ئاوەكەی رۆدەچێتە زەوی و كۆتایی دێت.

هەروەها تایبەتمەندیەكانی دیكەی ئاوی زەم زەم ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (ماء زمزم لما شرب له) (رواه احمد وابن ماجه وهو صحيح) واتە: (ئاوی زەمزەم بۆ هەر مەبەستێك بخورێتەوە ئەوە دەبەخشێت) .

كوڕی شیرینم گوتەی پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) هەقەو ڕاستە ... بێگومان زۆرێك لە

موسلمانەكان ئاوى زەمزەميان تاقى كردۆتەوەو بۆيان بەديار كەوتووە كە لەدواى يەقين و پشت بەستن بەخوداى گەورە، ئاوى زەمزەم شيفاو خواردن و خواردنەوەيە.

## خـــورمـــا



**دارخورما :** كورى شيرينم بێگومان دارخورما وەكو مرۆڤايەتى مێژوويەكى دێرينى هەيە .

خەڵكى لە دياريكردنى شوێن و پەيدابوونى رايان جياوازە .... زانا (بەكارى) راى وايە، سەرچاوەى دارخورما دوورگەى عەرەبى يە.

هەروەها دەشڵێن وڵاتى بەحرێنە. پاشان لەنێو دوورگەى عەرەبى بڵاوبۆتەوە.

كورە شيرينەكەم خورما بە پێنج قۆناغدا دەڕوات و بۆ تەواو پێگەيشتنى پێويستى بەنزيكەى (٦) مانگ هەيە .

قۆناغى يەكەمى بە(حەبابۆك يان سەدى) ناودەبرێ، كە يە كسەر دواى پيتاندنى گوڵەكەى دروست دەبێت، بەجۆرێك شێوەيەكى گۆيى وەردەگرێت و تامەكەشى تاڵ دەبێت.

لەقۆناغى دووەم دا پێ ى دەڵێن: (بەلەح) كە لەو قۆناغەدا دەست بە گەشەكردن و درێژبوون دەكات و ڕەنگى سەوزو تاميشى تفتە.

لە قۆناغى سێ يە ميش دا پێى دەڵێن : (بوسر ياخود خەلال) لەم قۆناغەشدا بەڕەنگێكى سوورى زەردبا و خۆى دەنوێنێ تاميشى تفتە.

لەقۆناغى چوارەم دا پێى دەڵێن : (روتەب) ئەمە ئەو كاتەيە كە ئەو نيوەى بەدەرەوەيە گۆشتن دەبێ و ڕەنگەكەشى هەنگوينى دەبێو نەرم و تاميشى شيرينو خۆش دەبێ .

لەقۆناغى پێنجەم و كۆتايشدا: بەرووبوومى دارەكە دەبێتە خورما و ڕەنگى تاريك دەبێ، تويكڵى

چرچ و لۆچ دەبێ، وشەی (تەمر) واتا خورما وشەیەکی ڕەمەکی و گشتی یە بەڵام ئەوان ناوی دەنێن (بەلەح). (عەجوە)ش جۆرێکە لە جۆرەکانی خورما.

پێغەمبەر(ﷺ) بایەخ و گرنگی ئەو خورمایەی بۆ دووپات کردووینەتەوە کاتێك بە خاتوو عائیشەی فەرموو (خوالیّ ی رازی بێ) : (یا عائشة بیت لاتمر فیه جیاع أهله) . (صحیح مسلم) واتە: (ئەی عائیشە ماڵێك گەر خورمای تیادا نەبێ ئەوا خەڵکەکەی برسین).

# گرنگی دارخورما و خورما

**بۆ گرنگی دارخورما گەلێ هۆ هەن لەوانە:**

١- بەرگەگرتنی دارخورما بۆ ژینگەی نالەباری وەکوو کەمی ئاو و پلەی گەرمی بەرزو زۆری ڕێژەی سوێری خاکەکەی.



٢- ئاسانی هەڵگرتنی بەروبوومەکەی بەدرێژایی ساڵ بەبێ ئەوەی وەکو بەروبوومەکانی دیکە پێویستی بە ڕێگەگەلی هەڵگرتنی تایبەت هەبێ .

٣-ئاسانی ئاڵوێرکردنی.

٤-خۆشی تام و چێژی بەروبوومەکەی.

٥-بەرزی بەهای وزەو خۆراکیی .

٦- هەرزانی نرخی .

# بەهای خۆراکیی خورما

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (بیت لاتمر فیه جیاع أهله) (رواه مسلم). واتە : (ماڵێك خورمای تێدا نەبێ ئەوا خەڵکەکەی برسین)، خورما بە ماددەیەکی خۆراکیی کامڵ دادەنرێت بەوەی کە (کاربۆهیدرات و پرۆتین و ڤیتامینەکان و خوێیەکانزایەکانی تێدایە) سەرەرای هەبوونی ئەو شێ یەی کە

فاكتەرێكی گرنگە لە دیاریكردنی نرخی بەروبووم.

شەكرەكانیش لە گرنگترین پێكهاتەكانی (بەلەح) دادەنرێت، كە (٧٠-٧٥٪)ی بریتی یە لە ماددە وشكەكانی (سكرۆز – فریكتوز-گلوكۆز) هەروەك چۆن (١٦) ترشی ئەمینی تێدا بەدی دەكرێت.

هەروەها برێكی باش لەڤیتامینەكانی تواوەی ناو ئاوی وەكو (سیامین و، ریبۆفلافین و، ترشی فۆلیك و ، برێكی كەم لە بیتوتین و ترشی ئەسكوربیك)ی تێدا هەیە.

كورە شیرینەكەم خورما بەسەرچاوەیەكی باشی زۆرێك لەخوێیە كانزاییەكانی وەكوو (ئاسن و پۆتاسیۆم و نوحاس و كبریت و مەنگەنیز) دادەنرێت.

هەروەها بەسەرچاوەیەكی مام ناوەندیش بۆ هەریەك لە (كالیسیۆم و فسفۆر و كلۆرین و مەنگنیسیۆم) دادەنرێت.

## پێكهاتەی شیكاریی بۆ خورما

ئەو خشتەی خوارەوە بەهای خۆراكیی بۆ (١٠٠) گرام لە بەلەح روون دەكاتەوە.

| تۆخم | رێژە بەگرام | تۆخم | رێژە بەگرام |
|---|---|---|---|
| كاربۆهیدرات | ٧٥ گرام | كالیسیۆم | ٦٥ملیگرام |
| ئاو | ٢٠ گرام | ترشی نیكوتنیك | ٢،٢ملیگرام |
| ریشاڵەكان | ٤،٢ گرام | ئاسن | ١،٢ملیگرام |
| پرۆتین | ٢،٢گرام | ڤیتامین B١ | ٠،٠٨ملیگرام |
| چەوریەكان | ٠،٦ گرام | ڤیتامین B٢ | ٠،٠٥ ملیگرام |
| فسفۆر | ٧٢ میلیگرام | ڤیتامین A | ٦٠یەكەی نێو دەوڵەتی |

## سوودەكانی خورما لە رووی تەندروستی و چارەسەركردندا

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : (خير تمراتكم البرني، يذهب الداء ولاداء فيه) (الروياني ، وابن عدي ، والبيهقي، والضياء ، والعقيلي ، والطبراني ، وابن السني ، وابو نعيم في (الطب) وهو حديث



حسن).

واتە : (چاکترین خورمای ئیوە (بورنی) یە ، دەردو نەخۆشی دەبات و خۆشی هیچ دەردو نەخۆشی یەکی تێدا نییە).

**خورما چەندین سوودی هەیە لەوانە:**

١- پشت بەستن پیّ ی لەخواردنی دا دەبێتە هۆی لاوازی و رێك و پێك بوونی لەش ، چونکە ماددە چەوریەکانی کەم تێدایە.

٢- بەچارەسەرکردنێك بۆ کەم خوێنی دادەنرێت لەبەر ئەوەی رێژەیەکی زۆر ئاسنی تێدایە .

٣- بەرگریەك دەبەخشێتە لەش لە دژی شێرپەنجە لەبەر ئەوەی مەگنیسیۆمی تێدایە.

٤- خۆشاوی (بەلەح) کرداری میزکردن ئاسان دەکات ئەمەش بەهۆی ئەو شەکرانەی کە لە ناوی هەیە.

٥- ئێسقان و ددانەکان پتەو و بەهێز دەکات لەبەر ئەوەی کانزای فسفۆرو کالیسیۆمی تێدایە.

٦- بینایی بەهێز دەکات و پارێزگاری لەشێ و تەڕاتی چاوەکان دەکات چونکە ڤیتامین (A) تێدایە کە قەڵاچۆی شەوکوێری دەکات.

٧- دەمارەکانی بیستن بەهێز دەکات، لەبەر ئەوە سوودبەخشە بۆ بەساڵاچووەکان.

٨- کاریگەری هەیە بۆ سەر هەستە دەماردکان و هێوریان دەکاتەوە لەبەر ئەوەی ڤیتامین (A) و (B١) ی تێدایە کە دەمارەکان بەهێز دەکەن و ، هەروەها خورما چالاکی رژێنی دەرەقی زیادەکات، هەروەك چۆن فسفۆریشی تێدایە کە بە خۆراکی دەمارەخانەکانی مێشك دادەنرێت.

٩- وەکو چارەسەریەك بۆ نەخۆشیەکانی جگەرو زەردوویی و قلیش بوونی لێوەکان و وشك بوونی پێست و کەرت بوونی نینۆکەکان دادەنرێت، چونکە ڤیتامین (B) تێدایە .

١٠- بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی میزڵدان و گەدەو ریخۆڵەکان بەکاردێت لەبەر ئەوەی ڤیتامینی (B١،B٢) و نیاسینی تێدایە کە ئەمەی دواییان ریخۆڵەکان شێدار دەکات و لەلاواز بوون و هەوکردنەکان دەیانپارێزێت.

١١- خورما بە ڕەوانكارو چارەسەرێك بۆ قەبزی دادەنرێت چونكە ڕیشاڵی سلیلۆزی تێدایە یاریدەی بزاوتنی ڕیخۆڵە پێچاوپێچە سروشتی یەكان دەدات ، لەكاتێكدا داو دەرمانی ڕەوانی لینجە ناوپۆشی ڕیخۆڵەكان بەهۆی بزاوتنی دەست كردەوە دەڕووشێنێ وتێكی دەدات، هەروەك چۆن لەكاتی بەكارهێنانی داوو دەرمان، خۆراك بۆ ماوەیەكی درێژ لەنێو ڕیخۆڵە ئالۆزەكاندا دەمێننەوە، كە دەبێتە هۆی هەوكردنی قۆلۆن.

١٢- ترشی نێو گەدە هاوسەنگ دەكات چونكە دەوڵەمەندە بە خوێیە تفتەكانی وەكو خوێیەكانی كالیسیۆم و پۆتاسیۆم.

١٣- بەخۆراكێكی گەلێ سوودبەخش بۆ دایكی شیردەر لەماوەی دوای منداڵ بووندا(نیفاس) دادەنرێت، چونكە هۆشیاركەرەوەی بزوتنەوەی منداڵدانەو ماوەی كرژبوونەوەكانیشی لە دوای منداڵ بووندا زیاددەكاتو، هەروەها گرنگیشە بۆ دروست كردنی شیری دایك وقەرەبوو كردنەوەی ئەوەی لەكاتی منداڵ بوون لەدەستی دەدات ، ئەمەش لە بەر ئەوەی ماددەی ئاسن و كالیسیۆم و ڤیتامین (A)ی تێدایە.



## هەنگوین

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل: ٦٩)

واتە: (لەوەو دوا فێرمان كردووە، لەهەموو بەروبووم و(شیلەی گوڵان و شتی بەسوود) بخوات و پێمان ڕاگەیاندووە : ئەو نەخشانەی كە پەروەردگارت بۆی كێشاویت بە ملكەچیەوە ئەنجامی بدە، جا لە سكی ئەو هەنگانەوە شلەیەكی ڕەنگ جیاواز دێتە دەرەوە، كە شیفای تیادایە بۆ زۆر نەخۆشی، بەڕاستی ئالەمەشدا بەڵگەو نیشانەی بەهێز هەیە بۆ كەسانێك بیر بكەنەوە).

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بەوە داوە، هەنگوین شیفای بۆ خەڵکی تێدایە، پزیشکەکان کۆکن لەسەر ئەوەی هەنگوین سوودێکی زۆری هەیە، لەم بارەیەوەش تاقیکردنەوە و توێژینەوە گەلێك ئەنجامدراون راستی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی دەسەلمێنن... لەسوننەت دا بەکارهێنانی هەنگوین بۆ چارەسەری ڕەوانیو ئازارەکانی سك هاتووە.

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ریوایەتیان کردوە، دەڵێ: (پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی : براکەم تووشی سك چوون و ڕەوانی هاتووە: پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : (اسقیه عسلاً) واتە : برۆ هەنگوینی بدێ، ئەویش هەنگوینی دا براکەی پاشان هاتەوە لای و گوتی: من هەنگوینم پێیدا بەلاّم ڕەوانیەکەی زیاتر بوو. بەم شێوەیە سێ جاران ئاوای پێ فەرموو پاشانیش جاری چوارەمیش هاتەوە هەرپێ ی فەرموو (هەنگوینی بدەرێ). ئەویش گوتی من هەنگوینم پێیدا، بەلاّم ڕەوانیەکەی زیاتر بوو. ئینجا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی : (صدق الله وكذب بطن اخیك) واتە: خودا راستی فەرموو و سکی براکەت درۆی کردووە. ئینجا هەنگوینی پێیداو چاك بوویەوە.

بێگومان لەمیانەی ئەو تاقیکردنەوانەی کە کۆمەڵێك لە توێژەرەوکان ئەنجامیان داوە سەلمێنراوە هەنگوین یاریگەری کارای لە کەم کردنەوەی ماوەی سك چوون لە لای ئەونەخۆشانە دا هەیە کە تووشی هەوکردنی گەدەو ریخۆڵەکان بووینە، ئەمەش بۆ ئەو تایبەتمەندیانە دەگەرێتەوە کە هەنگوین هەیەتی، ئەویش دژە میکرۆبەکانە.

هەروەها دکتۆر (ساکێت) کە پسپۆری میکرۆبەکان و توێژەریشە لە کولێژی کشتوکاڵی (کلۆرادۆ)، تاقیکردنەوەیەکی بۆ زانینی کاریگەری هەنگوین بۆ لە ناوبردنی میکرۆبەکان ئەنجامدا، بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵە میکرۆبێکی نەخۆشی هەمەجۆری لەنێو کێڵگەکانی هەنگوینی پالاّوتەدا چاند، دیتی سەرجەم میکروبەکان مردن و لەناوی بردن، لەوانەش میکرۆبەکانی تای(تیفۆس) کە دوای (٤٨) کاتژمێر لەناوی بردن ، هەروەها میکرۆبەکانی تای (تیفی) کەدوای (٢٤) کاتژمێر لەناو بردن ، بە هەمان شێوەش میکرۆبەکانی زەحیری سەردەم بەتەواوی دوای (دە) کاتژمێر لەناوی بردن.

هەروەها سەلماوە بەشێوەیەك کە هیچ بوارێکی بۆ گومان نەهێشتۆتەوە، ئەو میکرۆبانەی دەبنە هۆی نەخۆشی بۆ مرۆڤەکان، بەکاریگەری هەنگوینی پاڵفتەی مێش هەنگوین، بەویستی خودای گەورە دەمرن و لە ناو دەچن.

# شـیـر



پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرموێت: (ومـن سقاه لبناً، فليقل: اللهم بارك لنا فيه ، وزدنا منه، فأنـه لـيس شـيء يجزيء مـن الطعـام والشراب غير اللبن) . (رواه ابـو داود، وابـن ماجة، وهو حديث حسـن) واتە: (هەرکەسێك شیری خواردەوە بابڵێ : خودایە بەرەکەتداری بکە بۆ ئێمەو بۆشمـانی زیـاد بکـە، چـونکە هیچ شتێك لە خواردن و خواردنەوە هاوتـای ئەو نییە و جیّ ی ناگرێتەوە).

کوڕی شیرینم بزانە کە شیر نیشانەو بە ڵگەیە، لە نیـشانەو بەڵگـەکانی خـودای باڵادەسـت لـەو بوونەوەرەدا ، ئەدی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَناً خَالِصاً سَآئِغاً لِلشَّارِبِينَ﴾ (النحل : ٦٦) .

**واتە : (بەراستی لە بوونی مـاڵاتدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆتان و جێگەی سەرنج و تێرامانە ، لەنێوان ئەو شتانەی کە لە سیکانداهەیە ، لە گژو گیای هەرس کراو و خوێندا، شیرێکی پـاك و بێگەرد و خۆش و بەتام بەرهەم دەهێنن بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە)**. وەبێگومـان زانـستی نـوێ — وەکـو لەتوێژینەوەیەکی دکتۆر هیشام ئەلخەتیب دانی پیـادا نـراووە- سـەلمێنراوە شـیر تاکـە خۆراکـە لـەنێو خۆراکەکانی دیکە کە سەرجەم ماددە بنەڕەتیەکانی تێدایە کە لەشی مرۆڤ ئاتاجیانە، هەروەها شیر ئەو ماددانە لەخۆ دەگرێ وەکو: شـەکرو مـاددە چـەورییەکانو خوێیـە کانزاییـەکان و ئاسـن و سـۆدیۆم و ڤیتامینەکانی(A) و (B) ، (C) و گونجاوترین کاتیش بۆ خورادنەوەی بەیانیان زووە، نابێ لەگەڵ ئـەو خواردنانە بخورێتەوە کە پرۆتینی بەهێزن، وەکو پاقەو نۆکو گۆشت و ماسـی و مریـشك، دەتوانـدرێت لەگەڵ هێلکە بخورێتەوە . هەروەها شیر ئەو ماددانەی تێدایە:

١- ماددە چەورییەکان ، بەشێوەیەك کەچەوری شیر لـە مـاددەی (کەسـرایڤ) پێکـدێت، کـە لەسـە ر شێوەی دڵۆپی خڕ لەنێو شیرەکەدا بەدی دەکرێن ، هەربۆ یە کاتێك شیر سەرتووەکەی لێ دەگیرێـت کە ئەم چەورییانەی تێدایە، زۆرێك لەتایبەتمەندیەکانی خۆراکی لەدەست دەدات.

٢- مـــاددە پرۆتینیـــەکان ، ئـــەویش دوو جـــۆرە ، یەکـــەمیان فـــسفۆری پروتینـــی (کـــازیۆنۆجین) دو دووەمیشیان (لاکتۆوا لبۆمی) یە ، ئەم پێکهاتەیە بەهایەکی بەرزی خۆراکی بەشیرەکە دەبەخشن، هەروەها ئەو پێکهاتە پرۆتینانەی کەلە نێو شیردا هەنە بەوە جیادەکرێنەوە کە پێکهاتەیەکی تەواو و کاملن.

٣- کانزاکان ، گرنگترین ئەوکانزایانـەی کـە لـە نێـو شـیردا هەیـە ئەمانـەن: سـۆدیۆم و کالیـسۆم و مەگنیـسیۆم و پۆتاسیۆم .

٤- ڤیتامینەکان، شیر هەموو ڤیتامینەکانی تێدایە ، کەبریتین لـە ڤیتـامینی (A) و (B) و (B٢) و (B١٢) و (C) و (D) و (E) و بەزۆریو بە تایبـەتیش ڤیتامینـەکانی (A) و(D) و لـەڤیتامین (C) یشدا هەژارە، هەربۆیە ئەگەر لەگەڵ شەربەتی پرتە قال دا بخورێتەوە ئەوا قەرەبووی ئەو کەمو کورتیە ی دەکاتەوە .

٥- ماددە نیشاستەیەکان کە وزەیەکی پێویست بۆ مرۆڤ وەبە ر دەهێنن، یاریدەی چالاکی جولانەوەیان دەدەن.

٦- شیر ئێسکی منداڵ بەهێز دەکات و بەژنو بالآیان درێژ دەکات و خانە فەوتاوەکانی لەشیان تـازە دەکاتەوە، هەروەها ناهێلی تووشی نەخۆشی ئێسکە نەرمـە بـبن، ددانەکانیـشیان پتـەو و بـەهێز دەکات لەبەر ئەوەی پێکهاتەکانی (جیرۆفۆسفۆر) ی تێدایە .

## بەیارمەتی خودا کۆتایی هات

**وەرگێر**

**دووشەممە / ٢١ ی نیسانی ٢٠٠٨**

# ناوەرۆك

ز/ یوسف الحاج احمد

# ئاشكرا بوونی چەند موعجیزەیەكی زانستی

لەنێو قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ

و/ بەختیار عبدالرحمن شیروانی

پ/ زرێوار لەنوور

لەبەر ئەمە ئەركی سەرشانی فێرخواز ئەوەیە تاوەكو ببێتە زانا، پێویستە بە راڤەكردن قورئان تێبگات، ئەوەش بەریارمەتی زانایانی زمان، وە لۆجیكانە حوكم بەسەر تێگەیشتن لە قورئاندا بكات و بەهۆی فیقهیشەوە حوكمەكانی بزانێت .... هەروەها چاو بەناو جیهانی ئاسمان و ئەوانەی لەناوی دان لە ئەستێرەكاندا بە هۆی گەردووونناسینەوە و بە هۆی جیۆلۆجی زانینەوە چاو بە دەریاكانە رووبارەكان و چیاكان و دەشتەكان و گیانلەبەرەكان و رووەكەكاندا بگێرێت، هەروەها بەهۆی زانستی جوگرافیا وە بەسەر زەوی دا بڕوات و رێگە و رێچكەكان و مەشخەڵەكانی بدۆزێتەوە.



بڵاوكراوەی كتێبخانەی
حاجی قادری كۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپكردن و بڵاوكردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - كوردستان - هەولێر

هەروەها لەچاوەڕوانی بەرهەمی نوێ دابن.

نرخی ٤٠٠٠ دینار

چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر